# جینۆساید

گۆڤارێکی تایبەتە بە تاوانی کۆمەڵکوژی

سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان دەریدەکات



ژمارە (یەك)

٢٠٢٤/٤/١٤

# جینۆساید

گۆڤارێکی تایبەتە بە تاوانی کۆمەڵکوژی
سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان دەریدەکات

ژمارە (١)ساڵی یەکەم، ٢٠٢٤/٤/١٤

خاوەنی ئیمتیاز:

سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان

سەرنووسەر:

پ.د. ئومێد بەرزان برزو

بەڕێوەبەری نووسین:

م. سەباح عەلی جاف

بەڕێوەبەری هونەری:

فەتاح مەحمود ڕۆستەم (فەتاح تەنیا)

شوێن: عێراق-هەرێمی کوردستان- گەرمیان
سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان (بینای لیواکە)
Tel: (+964)07701909222

Gmail: Genocide.center@garmian.edu.krd

facebook: Genocide Center of Garmian University

# پێڕست

# سەروتار

سەرنووسەر

کۆمەڵکوژی (جینۆساید) یەکێکە لە سیما دیارەکانی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی، ئەم تاوانە بەدرێژایی سەردەمە مێژووییەکانی مرۆڤایەتی لە کات و شوێنی جیاجیا بەرانبەر بە گرووپە نەتەوەیی و نەژادی و ئاینی و مەزهەبییەکاندا بەکارهاتووە.

شاڵاوی بەدناوی ئەنفالیش وەکو تاوانێکی جینۆساید دژ بە نەتەوەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەمەبەستی قڕکردن و زیندەبەچاڵکردنی خەڵکی بێتاوان و خاپوورکردن و وێرانکردنی لادێکان و ڕووخاندنی ژێرخانی ئابووری و سڕینەوەی شوناسی نەتەوەیی و مێژوویی و کەلتووری و جوگرافی کوردستان ئەنجامدرا، وێرای خراپی کاریگەرییەکانی لەسەر کەسوکاری ئەنفالکراوەکان، ئەمەش تاوانێکی مرۆییە، کە دەرهەق بە گەلی کورد کراوە، بۆیە ئێمەی کوردیش بەدرێژایی مێژوو خاک و نیشتمانمان داگیرکراوە و بە هەموو شێوەیەک لەلایەن دوژمنانەوە هەوڵدراوە، نەخشەی سیاسیی وڵاتەکەمان بشێوێنن و پارچەپارچەی بکەن، لە هەمان کاتیشدا نەتەوەکەمان پەرتەوازەبکەن و زمانەکەمان لێ قەدەغەبکەن. ئەمانە هەمووی سیاسەتی ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکان بووە بەرانبەر بە نەتەوەی کورد، باشترین نموونەش بۆ ئەمە، سیاسەتی حکومەتی شۆفێنی عێراقی بوو بەرانبەر بە نەتەوەی کورد لە باشووری کوردستان تا پرۆسەی ئازادیی عێراق، ئەویش بە پیلان و سیاسەتی بەعەرەبکردن و بەبەعسیکردن و ڕاگواستن و ئاوارەبوون و دەربەدەرکردن و پاکتاوکردن و وێرانکردنی لادێ و ناوچە کوردنشینەکان و قەدەغەکردنی خوێندن و نووسین بە زمانی دایک و

تـــالانکردنی مـــاڵی خـــەڵکی و داگیرکردنـــی زەوی و زاری جوتیـــاران و بەهەدەردانی سامانی نەتەوەیی لە خزمەت سەربازی و ...تد بووە.
لە ساڵیادی ئەنفال (٢٠١٠/٤/١٤)، زانکۆی گەرمیان وەک یەکێک لە گرنگترین دەســـتکەوتەکانی حکـــومەتی هەرێمـــی کوردســـتان لە دەڤەری گەرمیـــان دامەزرێنـرا. لەم زانکـۆیە سـالانە چەنـدین چـالاکیی زانسـتی و ڕۆشـنبیری و هـونەری لە یادەکـانی کیمیابـارانی هەڵەبـجە و جینۆسـایدی نەتەوەی کـورد و هەروەها دەرکردنی بلاوکراوە ئەنجامدراون، پاشان خۆشبەختانە بە فەرمانی وەزارەتـــی خوێنـــدنی بـــالا و تـــوێژینەوەی زانســـتی ژمـــارە (١٥٩٢٢) لە (٢٠٢٣/٨/٢١) سـەنتەری جینۆسـاید لە زانکۆمـان کـرایەوە، ئەم زانکـۆیە وەک ناوەنــد و دامەزراوەیەکــی زانســتی و ئەکــادیمی لە نــاوچەکەدا بە ئەرکــی سەرشانی خۆی دەزانێت لە ڕێگەی ئەم سـەنتەرەوە خزمەت بە نەتەوەکەی و دەڤەرەکەی بکات لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە و ئەرشـیفکردن و بەدۆکیـۆمێنتکردنی کەیســی تاوانەکــانی جینۆســاید و ئەنفــال لە گەرمیــان و کوردســتاندا، بـۆیە چەندین پلانـی درێژخـایەن و کورتخـایەن لە بەرنـامەی کـارو چالاکییەکاندایە، لێرەوە جێگەی خۆیەتی سوپاس و پێزانینی خۆمان ئاراستەی زانکۆ و هەمـوو ئەو کەس و تـــوێژەر و ڕێکخـــراو و لایەنـــانە بکەیـــن بەتـــایبەت لیـــژنەی چالاکییەکـــانی زانکۆمـــان، کە دڵســـۆزانە و خەمخـــۆرانە لە خـــزمەت کـــارو چالاکییەکانی زانکۆمـان بوون چ لە نـاوەوە و چ لە دەرەوەی زانکۆ، هەروەهـا کـردنەوەی سـەنتەری جینۆسـایدی زانکۆمـان بـوون، لە کۆتایـدا سـەری ڕێـزو نەوازش بۆ گیانی پاکی شەهیدان دادەنوێنین.




# پرۆژەی کردنەوەی سەنتەری جینۆسایدی زانکۆی گەرمیان

گۆڤاری جینۆساید

ئەم سەنتەرە بریتییە لە ناوەندێکی ئەکادیمی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی لە سەرجەم ئەو بوارو لایەنانەی کە تایبەتن بە تاوانەکانی جینۆساید چ لەسەر ئاستی نێوخۆیی چ لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی ڕوویانداوە، کە دژ بە گەلی کورد و گرووپە نەتەوەیی و ڕەگەزی و نەژادی و ئاینییەکانی تر ئەنجامدراون.

زانکۆی گەرمیان وەک دامەزراوەیەکی زانستی و ئەکادیمی لە ناوچەکەدا بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێت لە ڕێگەی ئەم سەنتەرەوە خزمەت بە نەتەوەکەی و دەڤەرەکەی بکات لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە و ئەرشیفکردن و بەدۆکیۆمێنتکردنی کەیسی تاوانەکانی جینۆساید و ئەنفال لە گەرمیان و کوردستاندا.

**یەکەم/ ئەرک و ئامانجی سەنتەر:**

١. بەجیهانیناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد لەسەر ئاستی عێراق و

نێـــــودەوڵەتی و ڕێکخـــــــراوە نێونەتەوەییەکان.

٢. ئەرشـــــــــــــــیفکردن و بەدۆکیــۆمێنتکردنی بەڵگەنامەکــان تـایبەت بە تاوانەکـانی جینۆسـاید و ئەنفـــال دژ بە گەلـــی کـــورد و مرۆڤـــایەتی لەپێنـــاو پاراســـتن و مانەوەیـــان لەلایەک و لەلایەکـــی تـــرەوە ئەنجامـــدانی تـــوێژینەوەی زانستی و کتێب و بڵاوکراوەکان لە بارەیانەوە.

٣. خســـتنەگەڕی هەمـــوو توانـــا زانستییەکان لە نـاوەوە و دەرەوەی زانکـۆ بـۆ ئەنجامـدانی تـوێژینەوەی زانیســـتیی جۆراوجـــۆری وەک لە بوارەکانی دەروونـی و کۆمەڵایەتی و یاسـایی و مێژوویـی و زمـانی و کەلتـــوری و ...تـــد لە ســـەرجەم ڕەهەندە جیاوازەکانی تاوانی ئەنفال و جینۆسایدی گەلی کورددا.

٤. هۆشـــــــــــیارکردنەوە و زیندووڕاگرتنی ئەم تاوانانە لە بیر و هـــــزری تـــاکی کـــــورد و مرۆڤایەتییدا، هاوکات چەسپاندن و دانـــانی پرۆگرامـــی تـــایبەت بەم تاوانانە لە ناوەندەکانی خوێندن لە دامەزراوەکـانی حکومەت بەتـایبەت وەزارەتـــی پەروەردە و خوێنـــدنی باڵا.

٥. هەمـــــــــــــاهەنگی لەگەڵ ســـەنتەرەکانی هاوشـــێوە لەســـەر ئاستی نێوخۆیی و دەرەکی لەپێناو کـــــارکردنی بەکـــــــۆمەڵ (دەســـــتەجەمعیە) بـــۆ زیـــاتر بەهێزکردنـــی ناســـاندنی کەیســـی جینۆسایدی کورد.

٦. هەمـــاهەنگی لەگەڵ ڕێکخــراوە نێوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان لەپێناو خزمەتکردنـــی کەیســـی ئەنفـــال و جینۆســـاید و ئەنجامـــدانی کـــارو چالاکیی فرەجۆر.

**دووەم/ هۆکـــار و گرنگـــی دامەزرانـــدنی سەنتەر:**

١. دەڤەری گەرمیـــان هاوشـــێوەی زۆربەی نـاوچە و دەڤەرەکانی تـری کوردستان بەر شـاڵاوەکانی ئەنفال و جینۆســـایدکردن کەوتـــووە و زۆرتـــرین قوربـــانی مـــادی و مەعـنەوی بەرکەوتـووە، هەر بـۆیە بە هۆکـــارێکی گرنـــگ دەزانرێـــت، تـاوەکو زۆرتـرین بەڵگەی پێویست لەســـەر تاوانەکـــانی ئەنفـــال و جینۆســـــــایدی نـــــــاوچەکە و دەرهاویشـــتەکانی ئەم تاوانـانە لەم ســـەنتەرەدا کـۆبکرێنەوە، هاوکـات

کۆکردنەوەی بەڵگە لە بەجێماوان و ڕزگاربووانی تاوانی ئەنفال و لێکۆڵینەوە و پۆلکردن و بژارکردنی زانیارییەکان و بەدکیۆمێنتکردنیان و پاراستنیان بە ڕێگەی زانستی پێویستە. بێگومان وەرگرتنی زانیارییەکان لە زمانحاڵی قوربانیانی دەستی ئەم تاوانانە خۆیان، کە لە ژیاندا ماون، کارێکی زانستییانەتر و بەپێزتر دەردەچێت. تەنانەت بەگرنگ دەزانرێت، تاوەکو کەسوکاری سەربەرزی ئەنفالکراوان لە ژیاندا ماون، لەسەر زاری خۆیانەوە و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ زانیارییەکان ئەرشیف بکرێن و بە دەنگی و ڕەنگی و ڤیدیۆیی تۆماربکرێن، تاوەکو بخرێنە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە لە هەموو ڕوویەکەوە ئەمە لەلایەک، لە لایەکی ترەوە لە کێشە و گرفتییان بکۆڵرێتەوە بەرانبەر بەو تاوانانەی کە ڕووبەڕوویان بۆتەوە.

٢. توێژەران و فێرخوازان لە ڕێگەی ئەم سەنتەرەوە دەتوانن سوود لە ئەرشیفکردن و بەدۆکیۆمێنتکردنی بەڵگەکان لەسەر تاوانەکانی جینۆساید و ئەنفال دژ بە گەلی کورد وەربگرن، تاوەکو توێژینەوەی زانیستیی جۆراوجۆر لە بوارەکانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و یاسایی و مێژوویی و زمانی و کەلتوری و ...هتد لە قۆناغەکانی زانکۆیی و خوێندنی باڵا و نوسینی کتێب و بواری شانۆیی و هونەری ...ئەنجامبدەن.

٣. ناساندنی ئەو تاوانانەیە کە دژ بە گەلی کورد و دەڤەری گەرمیان وەک تاوانێکی جینۆساید ئەنجامدراون، کە پێویستی بە هەوڵی جدی و هەمەلایەن هەیە، بەتایبەت بەسوودوەرگرتن لە پسپۆری کەسە ئەکادیمییەکان بۆ دۆکیۆمێنتکردن و لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی زانستی و مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سەرجەم ڕەهەندەکانی تر.

٤. نەتەوەی کوردو خاکی کوردستان بەدرێژایی مێژوو هاوشێوەی زۆربەی نەتەوەکانی تری دونیا ڕووبەڕووی چەندین تاوانی کوشتن و لەناوبردن و ڕاگواستن و ... بووەتەوە، کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی ڕێگەپێدراو نین و بە تاوانی نێودەوڵەتی ناسراون. بەمەش مێژووەکەی پڕ لە تاوانی گەورە و

دڵتەزێنی هەیە، بەڵام نەتوانراوە بە شێوەیەکی ئەکادیمی وەک پێویست توێژینەوەی لەسەر بکرێت و ببێتە خاوەن گێڕانەوەی مێژوویی خۆی و هەروەها کۆنەکردنەوەی بەڵگە حاشا هەڵنەگرەکان لەسەر ئەم تاوانانە، هاوکات نەتوانراوە وەک هەموو تاوانەکانی تری جیهان بە جیهانی بکرێت و بناسرێت و سوود لە بەڵگەکان وەربگیرێت، تاوەکو لەسەر ئاستی جیهان وەک تاوانی جینۆساید بناسرێت و رێگە لە ئەگەری دووبارەبوونەوەیان بگیرێت و تاوانباران بە سزای راستەقینەی خۆیان بگەیەنێن.

**سێیەم/ پلانی سەنتەر (درێژخایەن و کورتخایەن):**

١. دانانی سەنتەری **DNA** بۆ لێکۆڵینەوەی پزیشکی لە گۆڕە بەکۆمەڵەکان.

٢. دانانی کتێبخانەیەکی تایبەت بە کتێب و گۆڤار و لێکۆڵینەوە زانستییەکانی تایبەت بە تاوانەکانی ئەنفال و جینۆساید.

٣. دروستکردنی مۆزەخانەیەکی نیشتمانی بۆ پاراستن و بە دیکۆمێنتکردنی کەلوپەل و بەڵگەکانی زیانلێکەوتووانی تاوانی ئەنفال و جینۆساید. تەنانەت و گرنگتریش وەرگێڕانیان بۆ سەر زمانەکانی تر بە مەبەستی ناساندنی ئەم کەیسە لای نەتەوەکانی تری جیهان و بەتایبەت بەجینۆسایدناساندنی گەلی کورد.

٤. ئەرشیفکردن و دیکۆمێنتکردن و دیجیتاڵکردنی بەڵگەنامە مێژووییەکان و بڵاوکردنەوەیان لە چوارچێوەی کتێب و (دی ڤی دی) و وێبسایتەکان و کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە.

٥. دروستکردنی مۆنۆمێنتی جینۆساید و مەزارگە و شوێنی پێویست لەناو زانکۆدا بۆ یادکردنەوە و ئاشناکردنی نەوەکان بە تاوانە ناڕەواکانی دەسەڵاتدارانی ڕژێمی پێشوو دەرهەق بە گەلی کورد.

٦. ئەنجامدان و ڕێکخستنی کۆڕ و کۆبوونەوە و پانێڵ و وۆرکشۆپ و کۆنفرانس لەناو زانکۆ و زانکۆکانی تر و ئاستی نێوخۆیی و دەرەوە بەمەبەستی زیندووڕاگرتن و باشتر ناساندنی کەیسەکانی تایبەت بە ئەنفال و جینۆسایدی کورد.

٧. دەرکردنـــــــی گۆڤـــــار و بڵاوکراوەی تایبەت.

٨. هەوڵدان بۆ دانانی پرۆگرامی خوێنـدن تـایبەت بەم تاوانـانە لە ناوەنـــــدەکانی خوێنـــــدن لە دامەزراوەکانی حکومەت بەتایبەت وەزارەتـی پەروەردە و خوێنـدنی باڵا.

٩. هەوڵـدان بـۆ پێکەوەگرێـدانی لینکـی پەیوەنـدی ئەم سـەنتەرە لەگەڵ سـەنتەری زانکۆکـانی تـر و رێکخراوەکانی تـایبەت بەم تاوانانە بـۆ ئاگـاداربوون لە چالاکییەکـان و کارکردنی بەکۆمەڵ.

١٠. ئەم سـەنتەرە هەوڵـدەدات بە هاوبەشی لەگەڵ توێژەران لە بەشە جیاجیاکـانی زانکـۆ وەک (یاسـا، دەروونناسی، کۆمەڵناسی، زمان و ئەدەب، راگەیانـدن، جوگرافیـا، کشتوکاڵ، ...تد) لە ناوەوەی زانکۆ و دەرەوەی زانکـۆ لەپێنـاو ئەنجامـدانی تـوێژینەوە و کـارو چالاکی فرەجۆر.

١١. ئەنجامـدانی کـاری هـونەری و سینەمایی تایبەت بە تاوانەکان.

١٢. ئاشـناکردنی خوێنـدکارانی زانکـۆ بە تاوانەکـانی دژ بە گەلـی کـورد و گەلانـی تـری جیهـان لە رێـگەی سـەردانیکردنی تـاک و بەگرووپـی بەشـەکانیانەوە، هاوکـات وتنەوەی وانە لە پسپۆری و بوارە جیاجیاکـانی تـایبەت بە تاوانەکـانی جینۆسـایدی کـورد بە میوانـانی ناوەوە و دەرەوەی زانکۆ.

١٣. دروسـتکردنی پردێکـی پەیوەنـدی لەنێـوان پەرلەمـان و حکـومەت و کەسـوکاری سـەربەرزی شـەهیدان و ئەنفالکراوان بۆ هەمو کاروبارێکی دارایـی و تەندروسـتی و خزمەتگوزاری.

١٤. دروستکردنی پردی پەیوەندی لە نێوان زانکۆی گەرمیان و لایەنە پەیوەندییدارەکان بـۆ ئەنجامـدانی کۆنفرانسی زانستی لە سەر ئاستی نێوخۆیی و نێودەوڵەتی بەمەبەستی زیـاتر ناسـاندنی ئەم کەیسـە هاوشـێوەی جینۆسـایدی ئەرمەنەکان و هۆلۆکۆست و ...تد.



# ئەنفال و بەرپرسیارێتی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان
# بە پەسندکردنی ئەو شاڵاوە بە ناوی
# (ژینۆسایدی کوردەکان)

شەببۆ خزری، توێژەری  یاسای تاوانی نێونەتەوەیی
وەرگێڕان و داڕشتنەوە: عومەر عەبدولکەریم (تینو)



لە کۆتاییەکانی دەیەی (١٩٨٠)ی زاییینیدا، (سەددام حسێن تکریتی) سەرۆکی حکومەتی بەعسی عێراقی بە ئەنجامدانی پرۆسەیەکی تاوانکارانە لە دژی کوردەکان تاوانێکی نێودەوڵەتیی گەورەی لە دۆسیەی خۆیدا تۆمارکرد، کە تا ئەو رۆژگارە لە وێنەی نەبووە لە جۆری خۆیدا، ئەم تاوانانە بەهۆی هاوتایی کاتی لەگەڵ جەنگی سەپێنراوی لەگەڵ ئێران، بە بیانووگەلێکی بێ بنەمای وەکو دەستتێکەڵکردنی کوردەکانی عێراق لەگەڵ ئێران و ناپاکیکردن لە رژێمی بەعس بوو، بەلام هێنانەوەی ئەم بیانوو و پاساوانە تەنها بۆ رەوایەتییدان بە کارە چەپەڵەکانی سەددام لە دژی کوردەکان ئەنجامدەدرا، چونکە ئەگەر ئەم پاساوهێنانەوەیانە بخەینە تەرازووی لۆژیکەوە، ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە، کە ئەگەر تاوانەکانی دژی کوردەکانی عێراق بەم هۆیەوە بووە، ئەی پاساوی بۆ ئەو تاوانانەی بەرانبەر بە کوردکانی ئێرانی ئەنجامیداون چییە؟

کەواتە پێش چوونەباسەکەوە، پێویستە ئەم پاساوهێنانەوە تەواو ناراست و بێ بنەمایە لابەرین، تاکو بتوانرێ شیکردنەوەیەکی دروست لە رووداوەکانی جەنگی سەددام لە دژی کوردەکان بخرێتە روو، لەگەڵ ئەوەشدا لێسەندنەوەی گیانە، تەنانەت یەک کەس لە تاکەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، ئەویش بەو شێوەیەی سەددام و دیکتاتۆرییەکانی هاوشێوەی ئەو بەم شێوەیە ئەنجامیان داوە، بە هیچ پاساوهێنانەوەیەکی لۆژیکی قبوڵکراو نییە. لە ساڵی (١٩٨٨)دا، دەوڵەتی عێراق بە فەرماندەیی سەددم حسێن سەرۆککۆماری ئەوکاتی عێراق شالاو یان پرۆسەیەکی سەربازی رێکخراوی لە دژی خەڵکی کوردی دانیشتووی باکووری عێراق لە پارێزگاکانی (کەرکوک، نەینەوا، دیالە و سەلاحەددین) ئەنجامدا. ئەم پرۆسەیە، کە بە (ئەنفال) بەناوبانگ بوو، لە هەشت قۆناغدا ئەنجامدرا و لە فێبریوەری تا سێپتەمبەری

(١٩٨٨) درێژەی هەبوو. سەددام بە بەکارهێنانی چەکی ئاسایی و کیمیایی دژی هاولاتیانی کورد بووە هۆی مردن و برینداربوونی سەدان هەزار کەس و هەزاران کەسیشی لە سێدارە دا و ماڵەکانی وێران و تالانکرد و نزیکەی چوار هەزار گوندی خاپوور و سووتاند و ژمارەیەکی زۆریش لە خەڵکی لە هەلومەرجێکی دژواری جەستەییدا هێشتەوە، کە زۆربەیان لە برسێتیدا گیانیان لەدەستدا. هەروەها هێزەکانی پێشمەرگەی حیزبە کوردییەکانی قەلاچۆکرد و بووە هۆی ئاوارەبوونی سەدان هەزار کەس لە خاکی خۆیاندا بەرەو ناوچەکانی تری عێراق، کە هیچ شوێن و رێگەیەکیان نەبوو. بۆمبارانکردنی کیمیایی هەڵەبجەش، کە لەو دەمانەدا شەش هەزار کەسی لە یەک رۆژدا لەناو برد لە جەریانی ئەنفالدا روویدا.

بە تەماشاکردنی بەڵگەنامەی دادگای تاوانی نێونەتەوەیی، واتە یاسای رۆم ( **Rome Statute of the International Criminal Court**)) و مادەی (٦)ی لە پێناسەی تاوانی ژینوساید و خستنەرووی پێوەرەکانی، هەروەها یاسای دادگا نێودەوڵەتییەکانی پێشووی وەکو نۆرنبێرگ، تۆکیۆ، رواندا و یوگسلاڤیای پێشوو، ئەم مەسەلەیە بەجوانی رووندەبێتەوە، کە تاوانەکانی رژێمی بەعس لە پرۆسەی ئەنفالدا، ژینوسایدی کوردەکان بووە، چونکە ئەم پرۆسەیە بە ئامانجی وێرانکردن و لەناوبردنی کوردەکان و بە شێوەیەکی فراوان ئەنجامدراوە و هەموو پێوەرەکانی ژینوساید بە شێوەیەکی گشتی لەخۆدەگرێت. حکومەتی نوێی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٣)دا و پاش رووخانی رژێمی بەعس، بەپێی دەستووری وڵات پرۆسەی ئەنفالی بە (ژینوساید) ناساند و ناوزەدکرد و بەم شێوەیە خستییە زومرەی تاوانە نێونەتەوەییەکانەوە، کە دەوڵەتی سەددام ئەنجامی داون. بەمپێیە هەرچەند وڵاتانی وەکو بەریتانیا،

سوید و نەرویجیش ئەم هەنگاوەیان بە ژینۆسایدی کوردان ناساندووە، کەچی نەتەوە یەکگرتووەکان پاش (٣٢) سـاڵ لەم تاوانە، هێشتا لەمبارەیەوە قسەیەکی نەبووە.

لە ڕاستیدا لەم دەلاقەیەوە، سەرەکیترین مەسەلەی لەبەرچاونەگرتنی پرۆسەی ئەنفال لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا و بەتایبەت لەلایەن گرنگترین ناوەندی نێو نەتەوەیی واتە نەتەوە یەکگرتووەکان، کە گرنگی بابەتەکە دەخاتە ژێر پرسیارەوە. مێژوو گەواهیدەری ژمارەیەکی زۆری تاوانە نێونەتەوەییەکان بووە، کە زۆرێک لەوانە ئیدانەکراون و ئەوانەشی ئەنجامدەربوون، داداگاییکراون و سزادراون، تاوانبارانێکی زۆریش ئێستا لە چاوەڕوانی تۆمەت و دادگایی و سزای کارەکانیان ماونەتەوە. لەم نێوەندەدا، تاوانی ئەنفال لە پشت پەردەوە مایەوە و بێدەنگییەکی قورس لە پشتییەوە هەڵبژێردرا، تاکو بەمجۆرە فەرامۆشبکرێت و بەرپرسیارێتییە فەراهەمبووەکانی بکەرانی ئەو تاوانە و هاوکار و پشتیوانەکانی بە شەرمەزاری بمێنێتەوە.

هەرچەندە لە نیگای یەکەمدا ئەشی بەو چەشنە بێتە پێش چاو، کە دادگای باڵای عێراق، دادگایەکی نەتەوەییە و پەیوەندی بە یاسای تاوانی نێونەتەوەییەوە نابێت، بەڵام پێویستە دانی پێدابنرێت، کە ئەو تاوانانەی لەم دادگایەدا دادگاییدەکرێن، نێونەتەوەیین و ئەو تاوانانە بوون، کە لە متمانەپێکراوترین بەڵگەنامەی نێونەتەوەیی تاوان، واتە یاسای ڕۆم، بە تاوان ناسێنراون. بەمەش پێویست ئەم خاڵە بخرێتە ڕوو، کە دادگای باڵای عێراق بە خۆ لێلادان لە دادگایی سەددام بە تۆمەتی ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفال، لە چەند لایەنێکەوە پایە بنچینەییەکانی یاسای تاوانی نێونەتەوەیی لەرزاند و ئیعتیباری ئەم مەیدانەی لە یاسادا،

کە تا پێش ئەوە لە فراوانبووندا بوو لەکەدارکرد.

یەکەم، سەددام حسێن، سەرۆککۆماری ئەوکاتی عێراق، کە ئەم پرۆسەیەی لە ئەستۆدا بوو و هەموو هەشت قۆناغەکەی ئەنفال لە ژێر فەرمانی ئەودا ئەنجامدرابوو، هەرگیز لەبەر ئەنجامدانی تاوانی ئەم پرۆسەیە نەچووە نێو قەفەسی تۆمەتی ژینۆسایدەوە. لە ڕاستیدا سەدام پاش دادگاییکردنی بە تۆمەتی ئەنجامدانی تاوانی (دوجێل) لەسێدارەدرا و پاش لە سێدارەدانی ناوبراو، دادگای باڵای عێراق پەرژایە سەر تاوانی ژینۆسایدی کوردەکان. لەم دادگایەدا بە تاوانی ژینۆساید، تاوان دژی مرۆڤایەتی و تاوانی جەنگیی لە دژی زیاتر لە ٢٠٠ هەزار کورد، حوکمی لە سێدارەدان بۆ (عەلی حەسەن ئەلمەجید)، کە بە عەلی کیماوی یان قەسابی کوردستان و زیندانی هەتاهەتایی بۆ (سوڵتان هاشم ئەحمەد و حسێن ڕەشید محەمەد و دو تاوانیاری تر) بە تاوانی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە دژی خەڵکانی سڤیل، دۆسیەی ئەنفال بۆ هەمیشە داخرا. ئەم لە کاتێکدا بوو، کە پێویستیی دادپەروەری وەهابوو، کە سەرەتا هەموو ئەو تاوانانەی سەدام ئەنجامی دابوون، پەیگیری بکرێن و لە بەرانبەر بەجێماوەکانی ئەم تاوانانەدا وەڵامی هەبا، پاشتریش سزاکانی بەسەردا جێبەجێکرابان.

دووەم، ئامانجی پێکهێنانی ئەم دادگایە، دادگاییکردنی هەموو بکەران بەتایبەت پلەدارەکان و فەرماندە سەرەکییەکانی ئەو تاوانانە لە عێراقدا لە ساڵی (١٩٦٨ تا ٢٠٠٣)بوو، بەڵام نەک تەنها ئەم کارە بە ئەنجام نەگەشت، بەڵکو جگە لە دادگایینەکردنی سەدام حسێن بە تۆمەتی ژینۆسایدی کوردەکان، زۆرێکی تریش لە فەرماندەکان و پشتیوانەکانکارانی ئەم تاوانانەش دادگایینەکران یان بێتاوان دەرچوون و زۆرێکی تریش هەرگیز بە شوێنیدا نەڕۆیشتن و بەداوداچوونیان بۆ نەکردن.

ئـەم مـەسـەلـە دەبێـتـە هۆی متمانەپێنەکردنی خەڵکی بەتایبەت قوربانیانی بەجێماوی ئەم تاوانە بە دادگا نەتەوەییەکان و جگە لەوەش، ئەگەری تاوانگەلێکی لە چەشنە لە ئاییندەدا مومکین دەکات، هەروەکو ئـەوەی دەبینرێـت و دیـارە، کـە دەوڵەتی تورکیاش لەم ساڵانەی دواییدا بە پشتبەستن بە لاوازبوونی پایەکانی یاسای تاوانی نێودەوڵەتی و نەبوونی بەدواداچوونی بەردەوام بۆ ئەو تاوانانەی لە سەرتاسەری دنیادا و لە لایەن دیکتاتۆرەکان و تاوانبارە جۆراوجۆرەکانەوە ئەنجامدراون، پرۆسەی هاوشێوەی ئەنفالی لە چەندینجار لە کوردستانی سوریا ئەنجامداوە و سەدان هەزار کەسی لە شوێن و جێگەی خۆیان لەو بەشەی کوردستان ئاوارە و پەلەنگاز کردووە. لە راستیدا ئەنجامدان و ڕوودانی ئەم تاوانانە بەردەوامبوونی ئەو ژینۆسایدەیە، کە سەددام حسێن لە دژی کوردەکانی عێراق و ئێران ئەنجامیدا. ئەمە لە کاتێکدایە، کە بە ئەنجامدانی دادگایەکی دادپەروەرانە و یەکسان لەلایەن دادگای باڵای عێراقەوە، ئەگەری ڕوودانی ئەم کارە زۆر کەمتر بوو لەوەی، کە جیهان ئێستا دەیبینێت و بە بەرچاویانەوە ڕوودەدات.

ئەوەی گرنگە، ئەوەیە، کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، وەکو فەرمیترین و سەرەکیترین ناوەندی نێودەوڵەتی، پێویستە و بەڵکو هەنووکەییە، کە پرۆسەی ئەنفال، وەکو ژینۆسایدی کوردەکان رابگەیەنێت و بیناسێنێت، چونکە بەمشێوەیە هیوا بە وەستاندنی ژینۆسایدی کوردەکان، کە هەنووکەش بە دەستی تورکیا ئەنجامدەدرێت، بە پشتیوانی ڕێکخراوەکان و ناوەندە نێودەوڵەتییەکان زیاتر دەبێت، هەروەها زۆرێک لە تاوانەکانی هاوشێوە لە ناوچەکانی تری دنیادا، خەسڵەتی نێودەوڵەتیبوونی خۆیان پاراستووە و ئەتوانرێ بە پشتیوانی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە

دواداچوونیان بۆ بکرێت. سەرەڕای ئەمەش بەم کارە ئەم تاوان و کارانە ئاشکراتر دەبن و ڕێگری لە فەرامۆشکردنیان لە مێژووی دنیاشدا دەکرێت. گوێنەدان و لەبەرچاونەگردنی ئەم جۆرە ڕووداوانە/ خۆی لە خۆیدا دەبێتە هۆی ڕەوینەوەی تەمی ترسی تاوانکاران و ئەوانەی ئەم تاوانانە ئەنجامدەدەن بەبێ ترس لە بەرپرسیاریتی و وەڵامدانەوە لە بەرانبەر قوربانیان و دنیاشدا، بۆ ئەنجامدەرانی فەراهەمدەکات. ڕەنگە ئەم گومانە بێتە ئاراوە، کە ئەم گوێ پێنەدانە خۆی هۆکارێک بێ بۆ پشتگیریکردنی ئەم دیفاکتۆیە و لە بێدەنگی لە بەرانبەر ئەم تاوانانە، بەجۆرێک بە هاوبەش و پشتیوان ئەم تاوانانە ئەژماردەکرێن یان ئەوەیە، کە چوونەپێشەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەنجومەن لەم ساڵانەی دواییشدا بەرانبەر بە تاوانەکانی هاوشێوە لە شوێنەکانی تری دنیا بەردەوامی هەیە و ئەم ڕووداوە نیگەران هێنەرتر لە هەر تاوانێکی ترە. کەواتە نەتەوەیەکگرتووەکان ئەرکە لەسەر شانی هەڵوێستی خۆی لە بەرانبەر پرۆسەی ئەنفال بە شێوەیەکی فەرمی ڕابگەیەنێت، تاکو ئیمکانی گومان لە دژی خۆی لەم بارەیەوە کەمتر بکاتەوە.



سەرچاوە: ڕۆژنامەی (شەرق)، ژمارە (٣٦٩٨)، یەکشەممە (١٩) ئەپریلی (٢٠٢٠).

ئەنجامدا نەتەوە یەکگرتووەکان بە تایبەت ئەنجومەنی ئاسایش بە



# هۆڵۆکۆست و ئەنفال

## دوو وێستگەی قڕکردنی مرۆڤ لە سەدەی بیستەمدا

دەروون عومەر خەلیفە مەحمود



سەدەی بیستەمی زایینی ڕووداو و گۆڕانکاری و خاڵی وەرچەرخانی گرنگی بە خۆوە بینی، لە نموونەی جەنگی یەکەمی جیهانی، ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی ڕوسیای قەیسەری و کوشتنی قەیسەر (نیکۆلای دووەم)، ڕووخانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، جەنگی دووەمی جیهانی، دروستبوونی دوو جەمسەریی لە سیاسەتی جیهانیدا، کە جەنگی ساردی بە دوای خۆیدا هێنا، جەنگی عەرەب ـــ ئیسرائیل، جەنگی ڤێتنام، جەنگی هەشت ساڵەی عێراق - ئێران، شەڕ و ململانێی بەردەوامی فەڵستین ـــــ ئیسرائیل، هەڵوەشاندنەوەی یەکێتیی سۆڤییەت، جەنگی بۆسنا و جەنگی ئەفغانستان، ...هتد.

شانبەشانی ئەو جەنگ و وێرانکارییانەی مرۆڤایەتی لە زۆر ڕووەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆوە بینی لە بوارەکانی: تەکنەلۆژیا، کشتوکاڵ، پیشەسازی و سەربازی، خاڵی گرنگ و وەرچەرخانیش لەو سەدەیەدا چوونی مرۆڤ بوو بۆ بۆشایی ئاسمان و سەر مانگ و هەڵدانی سەتەلایت، کە دواتر کردنەوەی هەزاران کەناڵی ئاسمانی و تۆڕی بەرفراوانی ئینتەرنێت و لەدایکبوونی سەردەمی جیهانگیری (GLOBALIZATION)ی لێکەوتەوە.

سەدەی بیستەم ڕووبەندی لەسەر ڕووخساری دەیان سەرکردە و سەرۆکی ستەمکاری دیکتاتۆر هەڵماڵی، کە هۆکاری ژیان لێستاندنەوەی ملیۆنان مرۆڤ بوون، لە نموونەی: ستالین، هیتلەر، فرانکۆ، پۆل پۆت، سەهدام حوسێن و میلۆسۆڤیچ ... هەریەک لەو ستەمکارانە بە ڕێگە و شێوازی جیاواز گەیشتوون بە لوتکەی دەسەڵاتی دەوڵەتەکانیان، هەر یەکەشیان ستایلی تایبەت بە خۆیان هەبووا لە قڕکردنی گەلەکەیدا، یاخود گەلانی ژێر دەسەڵاتیدا، هەندێکیان دەستیان بۆ گەلانی دراوسێ و تەنانەت لە ناو دەوڵەتانی تریش بردووە! بۆ وێنە: ستالین، هیتلەر و سەددام حوسێن.

هۆلۆکۆست و ئەنفال دووان لە دیارترین پرۆسەی جینۆسایدن، کە لەو سەدەیەدا دژ بە گەلانی ژێردەستە ئەنجامدراون! لە دوو ناوچەی جیاوازی ئەم سەرزەمینە و لە دوو سەردەمی جیاواز و لە لایەن دوو رژێم و دوو دیکتاتۆری جیاوازەوە ...

هیتلەر لە رێگەی هەڵبژاردنەوە (پاش دووجار شکست) توانی بگاتە لوتکەی دەسەڵاتی ئەڵمانیا و بیر و باوەری خۆی و نازییەت بکاتە بنەمای بەرێوەبردنی دەوڵەت و دواتر هەنگاونان بە ئاراستەی داگیرکردنی جیهان. بەڵام حیزبی بەعس لە رێگەی کوردەتایەکی سەربازییەوە لە ساڵی (١٩٦٨) دەسەڵاتی عێراقیان گرتە دەست و سەددام حوسێن بە جێگری سەرۆکی عێراق دەستنیشانکرا، سەددام بە هاوکاریی دەستەیەک لە هاورێیانی لە سەرکردایەتی بەعس دەستیان بەسەر پایەکانی حوکمڕانی و داهات و سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی نەوت و سامانی سروشتی عێراقدا گرت و گەل و خاک و دەرامەتی ئەو وڵاتەی خستە خزمەت جێبەجێکردنی سیاسەتی دوژمنکارانە و پاوانخوازانە و رەگەزپەرستانەی خۆیەوە، کە تێیدا نەتەوەی عەرەب (لە ناویشیاندا سوننە مەزهەبەکان) بە سەردەستە دەزانی و نەتەوەکانی تری پێکهێنەری عێراق (کورد، تورکمان، صابیئە، ئەرمەن و کلد و ئاشوور) و غەیرە مەزهەبەکانی وەک (عەرەبی شیعە) بە ژێردەستە دەزانی! لێرەدا پێویستە ئاماژە بە کەیسی جینۆسایدی کوردانی فەیلی بدەین، کە دووجار بەر ستەم و دڕندەیی بەعس کەوتوون، جارێک نەتەوەیی و جارێکیش مەزهەبی! چونکە هەم کورد و هەمیش شیعە مەزهەبن، هەرچەندە بنەماڵە کوردە فەیلییەکان لە دامەزرێنەرانی شاری بەغدا و دانیشتووانی رەسەنی ناوەڕاستی عێراقن.

هۆلۆکۆست پرۆسەیەکی جینۆسایدی ترسناک بوو، کە بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراو و

دیراسەکراو دژ بە گەلی جوو جێبەجێکرا، گەرچی ئەو پرۆسەیە نەیتوانی تەواوی ئامانجەکانی بپێکێت و گەلی جوو لە سەر زەوی بسڕێتەوە، بەڵام گورزێکی کوشندەی لێدا و هۆکاری کەمبوونەوەی جوو بوو بەتایبەت لە ئەورووپا.

هیتلەر لە ڕێگەی دامودەزگاکانی حکومەت و حیزبی نازی و ڕاگەیاندنەکەیەوە چەندین شێوازی تیرۆری فیکری و جەستەیی بەکارهێنا دژ بە گەلی جوو لە ناوخۆی ئەڵمانیا و وڵاتانی تری میحوەر، کە بریتیبوون لە ئیتاڵیا، ڕۆمانیا، کرواتیا، هەنگاریا و بولگاریا، هەروەها لە ناو خاکی پۆلۆنیا گەورەترین سەربازگەی لەناوبردنی بۆ جوو کردنەوە ... لە ڕێگەی ڕاگواستن و گوللەبارانکردن و خنکاندنی بەکۆمەڵ لە ڕێگەی ژوورەکانی گازەوە، هەروەها فڕنی سوتاندنی مرۆڤ، کە دواتر بە (محرقە یهود) ناسرا.

لە جینۆسایدی گەلی جوو (هۆلۆکۆست)دا بە وردی نەتوانراوە ژمارەی قوربانیان دیاری بکرێت، مەزەندە کراوە بە (٦) ملیۆن کەس، کە بوونەتە قوربانی.

ساڵی (١٩٥٢) ڕێککەوتنامەی لوکسمبۆرگ لە نێوان کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵی و دەوڵەتی ئیسرائیلدا واژۆکرا، کە تیایدا حکومەتی ئەڵمانیای دوای هیتلەر ناچارکرا بە زنجیرەیەکی دوور و درێژی قەرەبووکردنەوە، لەسەر ئاستی دەوڵەتی تازە دروستکراوی ئیسرائیل و لەسەر ئاستی خانەوادە و میراتگری قوربانیان، لە ماوەی ١٢ ساڵدا واتە لە (١٩٥٣ بۆ ١٩٦٥) بڕی (١٢) ملیار مارکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا درا بە حکومەتی ئیسرائیل، هەروەها موچەیەکی مانگانەی بۆ هەر میراتگرێک دابینکرد، کە بیسەلمێنێت لە نێوان ساڵانی (١٩٣٣ بۆ ١٩٤٥) ڕووبەڕووی سیاسەتی پاکتاوی ڕەگەزی بووەتەوە لە سایەی حوکمی نازییەتدا.

ئەنجوومەنی دانایانی گەلی جوو لە سەرانسەری جیهاندا هەوڵەکانی خستەگەڕ بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی و هاوسۆزیی گەلان و

دەوڵەتانی تر لە ئاست ئەو تاوانانە و پیشاندانی مەزلومییەتی گەلەکەی.. حکومەتی ئیسرائیل لە ساڵی (١٩٥٣)ەوە بەپێی بڕیارێکی (کینێست) مۆنۆمێنتێکی گەورە و پرۆفیشناڵی لە سەر چیای (هرتزل) لە بەشی ڕۆژئاوای شاری قودس (ئورشەلیم) دامەزراندووە بە ناوی (یادڤاشیم)، کە مۆزەخانە و پێشانگای وێنە و کەلوپەلی قوربانیان و کتێبخانەی گەورە و سەنتەری لێکۆڵینەوەی لە بارەی جینۆسایدی گەلی جووەوە تێدایە، بە هەزاران لێکۆڵینەوە و کتێبی لەو بارەیەوە تێدا کۆکراونەتەوە، کە تا ئێستا توانراوە (٦٢) ملیۆن بەڵگەنامە و ئەرشیفی مێژوویی کۆبکرێتەوە.

هەروەها حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ساڵی (١٩٨٠) مۆزەخانەی هۆلۆکۆستی لە (واشینگتۆن)ی پایتەخت دامەزراند..

ئەتوانم بڵێم زنجیرەی مۆزەخانە و سەنتەرەکانی تایبەت بە هۆلۆکۆست لە جیهاندا بڵاوبووەتەوە، بۆ وێنە: لە ئەڵمانیا، پۆڵۆنیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی، زۆربەی وڵاتانی ئەورووپی، کە دواهەمینیان هۆڵندا بوو مۆزەخانەی هۆلۆکۆست بکاتەوە!

بەندە لە ساڵی (٢٠٢٣) لە گەشتێکمدا بۆ چەند وڵاتێکی ئەورووپی لە هەرێمی (باڤاریا)ی ئەڵمانیا سەردانی شارۆچکەی (داخاو)م کرد، بەمەبەستی لە نزیکەوە بینینی ئەو فڕنانەی بۆ سووتاندن و خنکاندنی قوربانیانی هۆلۆکۆست سازدرابوون!

پرۆسەیەکی تری جینۆسایدی سەدەی بیستەم ئەنفال بوو، کە بەرامبەر بە گەلی کورد ئەنجامدرا، ئەم پرۆسەیە بە ئەنفالی بارزانییەکان دەستی پێکرد لە ساڵی (١٩٨٢) ئەنجامدرا، کە تێیدا (٨) هەزار کوردی بارزانی بێسەرو شوێن کران، پاشان لە ساڵی (١٩٨٧) پرۆسەی ڕووخاندنی دێهاتەکان دەستی پێکرد.

پرۆسەی ئەنفال لە ساڵی (١٩٨٨) بە هەشت قۆناغی یەک لە دوای یەک

بەڕێوەچوو، هەرچەندە مێژووی ئەم تاوانە لە چاو هۆلۆکۆست نوێترە و لە سەردەمێکی پێشکەوتووی تەکنەلۆژیا و هۆیەکانی میدیا و کۆمینیکەیشندا بوو، کەچی کەمترین دەنگدانەوەی هەبوو لەسەر ئاستی هەرێمی و جیهانی، زۆربەی دەوڵەتانی دنیا و زلهێزەکانیش چاوپۆشیان لێکرد.

بەپێی ئامارە نافەرمییەکان (١٨٢٠٠٠) مرۆڤی کورد لەو پرۆسەیەدا بوون بە قوربانی، تێیدا نزیکەی (٤٥٠٠) چوار هەزار و پێنج سەد دێی کوردستان تەختی زەوی کران، لەگەڵ سەدان قوتابخانە و مزگەوت و کڵێسا، سەرەڕای سەدان ڕەز و باخ و کارێز و کانیاو، کە وشککران، سەدان هەزار سەر مەڕ و وڵاخ و پەلەوەر کرانە "غەنیمەت"ی غەزا و بە تاڵان بردران!

ئەم تاوانە بە فەتوای زانایانی ئایینی (سوننە مەزهەب)ی ئەو ڕۆژگارەی عێراق حەڵاڵکرا و گەلی کوردی وەک بێ دین و لادەر لە ئیسلام وێناکرد و خوێن و ماڵ و موڵکی حەڵاڵکردن.

ناوچەکانی گەرمیان و کەرکوک و قەرەداغ و دەشتی کۆیە و هەڵەبجە و دۆڵی جافایەتی و بادینان زۆرترین زیانیان بەرکەوت و لە هەندێک شوێن هیچ سیمایەکی ژیان و گوزەران نەهێڵدرا، بەتایبەتی ناوچەی گەرمیان و کەرکوک زۆر بە چڕی بەر شاڵاوی دڕندانەی ڕژێمی بەعس کەوتن! ئەوەش هۆکاری خۆی هەیە، کە دەکرێت لەم خاڵانەدا کورتیان بکەینەوە:

- نزیکی و هاوسنووری گەرمیان لەگەڵ ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراق، ڕژێم بەئاسانی دەستی پێڕادەگەیشت.
- گەرمیان مەیدانی زۆربەی ڕووبەڕووبوونەوەکانی چەکداری نێوان هێزی پێشمەرگە و سوپای ڕژێم بوو.
- ناوچەی گەرمیان و کەرکوک بەشێکی گرنگ و ستراتیژی پلانی ڕژێمی بەعس بوو بۆ تەواوکردنی پرۆسەی بەعەرەبکردنی کوردستان

و مەبەستی بوو گەرمیان و کەرکوک بخاتەسەر ناوچە عەرەبنشینەکان.

• بوونی سامانێکی زۆری سەرزەوی و ژێرزەوی لە گەرمیان و کەرکوکدا، هەروەها بوونی لەوەڕگا و لەباریی خاکەکەی بۆ کشتوکاڵ.

• تۆبۆگرافیا، تەختیی دەشتی گەرمیان و نەبوونی پەناگەی سرووشتی وەک: چیا و ئەشکەوت و دارستانی سروشتی، بۆ خۆ پاراستنی خەڵکەکەی لە دەست سوپا و چەکدارە چاوساغەکانی.

ئەو کەسانەی لە پاش جینۆسایدی ئەنفال، قەدەر ڕێگەی دان جارێکی تر بگەڕێنەوە باوەشی ژیان و دووبارە دەست بە ژیان بکەنەوە، ڕووبەڕووی چەندین گرفت و نەهامەتی ژیان بوونەوە، لە رووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەندروستی و یاسایی و تەنانەت ژینگەییشەوە بە جۆرێک کە لادێنشینان لە ژینگەیەکی پاک و ژیانێکی بەختەوەر و فەزایەکی کراوەی لادێوە بوون بە ئۆردوگانشینێکی نابەدڵ و دەستبەسەرکراو.

پێشنیازەکان بۆ قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری ئەنفالکراوان و ناساندنی زیاتری کەیسی ئەنفال:

• بە یاسا بەربەست دروستبکرێت لە بەردەم تەما و هەوڵی دووبارەکردنەوەی لەو جۆرە تاوانانە.

• پێکهێنانی دەستەیەکی باڵای پسپۆڕ لە کەسانی یاسایی و دیپلۆماسی، کە ئەرکی ناساندنی کەیسی ئەنفال و جینۆسایدی گەلی کورد بێت، وەک جینۆساید لە ئاستی نێودەوڵەتیدا.

• پابەندکردنی حکومەتی عێراق بە واژۆکردنی پەیمانامەی نێودەڵەتی قەدەغەکردنی بەکارهێنانی چەکی کۆکوژ، هەروەها وەرگرتنی گرەنتی دووبارەنەبوونەوەی جینۆسایدی گەلی کورد و کەمینە نەتەوەکانی تری عێراق.

• دامەزراندنی ناوەندێکی نیشتمانی بۆ بە دۆکیۆمێنتکردنی چیرۆک و



بەسەرهات و داستانەکانی ئەنفال، کە کەسانی شارەزا و زمانزان و نووسەر سەرپەرشتی بکەن.

• دروستکردنی ناسنامەیەکی تایبەت بە کەسوکاری پلە یەکی ئەنفالکراوان لە ڕێگەیەوە چەند خزمەتگوزارییەک پێشکەش بەو کەسانە بکرێت. وەک: بەخشینیان لە باجی خزمەتگوزارییە گشتییەکانی میریی، ڕاییکردنی مامەڵەیان لە دامودەزگاکان و کارئاسانییان بۆ بکرێت، دابینکردنی کورسی خوێندن لە دەرەوەی وڵات بۆ خوێندکارەکانیان، بەپێی لێهاتوویی و ئاستی زانستییان.

• ناچارکردنی حکومەتی عێراق بە داوای لێبووردنکردن لە گەلی کورد و قەرەبووکردنەوەی ماددی و مەعنەوی کەسوکاری ئەنفالکراوان و جینۆسایدی کورد.

• کردنەوەی سەنتەرێکی ئاماری نیشتمانی تایبەت بە کەیسی ئەنفال، کە ئەرکی سەرژمێری قوربانیان و زیانەکانی ئەنفال بێت، هەروەها دیاریکردنی تەمەنی قوربانیان و ئاستی خوێندەواریی و باری دارایی و شێواز و جۆری پیشەو لێهاتووییان، لە ناوچوونی ڕەز و باخ و ئاژەڵیماڵی، تێکچوونی هەزاران هێکتار زەوی کشتوکاڵی و پاوان و دارستان.



سمکۆ سابیر

# ئەنفال،
# تاوانێك لە كوێی كۆیادەوەریی كۆمەڵگەدایە؟

ئەنفال وەک تاوانێکی نێودەوڵەتی وەک یادەوەرییەکی تاڵ و ئازارێکی سەخت و دژوار کاریگەری بەسەر جەستە و زهنیەتی هەموومان دەمێنێتەوە و لە ژیانی ئێستا و داهاتوومان بەرجەستەدەبێت و پڕ کاریگەریترین ڕووداوە، کە تارماییە لە ژیانی ئەم کۆمەڵگەیەدا. ئەنفال هێندەی کاری لەسەر سڕینەوەی شوناسی تاکی کورد کردووە، هێندە کاری لە سەر شوێن و جوگرافیا و بوونەکانی تر نەکردووە، بەڵکو ئەنفال بۆخۆی دەستەجەمعی کۆمەڵێک ژانی نوێیە لە جەستەی کورد، بۆ ئازارێکی تر، بۆ ژانێکی تر بۆ قڕکردنی مرۆڤی کورد لە زەمەنێکی تردا. بە واتایەکی تر؛ ئەنفال تاوانێکی تازە و ڕووداوگەلێکی نەبینراو و نەبیستراو نییە، بەڵکو ئەو دیمەنەکانی لە زەمەنێکی تر نیشانی ئێمەدراوە و نمایشگەلێکی دووبارەیە بۆ ئێمە؛

نمایشگەلێکە کاراکتەرەکان ڕۆڵەکانیان دووبارەدەبنەوە، بەڵام بە جلوبەرگ و ستایل و زەمەنێکی جیاواز، بە کەرەستەی نوێ و مۆدێرن، بەڵام بەهەمان هزری کۆن و ئەو هەستە کە هێشتا مەستە بە سڕینەوەی ئەوانی تر و لەناوبردنی ئەوانی تر..بۆ قسە لەسەر ئەنفال بە دیدێکی تر؛ لێرەدا هەوڵدەدەین باس لە ئەنفال و ئاریشە و ئازارەکانی بکەین. هەوڵدەدەین لاپەڕەیەکی تر هەڵدەینەوە لە هەموو ئەو ڕاستییانەی کە پەیوەندی بە خودی ئەم تاوانەوە هەیە.

**کارکردن لە دۆسیەی ئەنفال، ئاسۆ و گرفت و ئاریشەکان:**

مرۆڤ هەمیشە لە کارکردن و ژیاندا ڕووبەڕووی کێشەو گرفت دەبێتەوە و بەو شێوەیە ژیان دەکات و لە شەڕی چارەسەرکردنی کێشە و ئاریشەکاندایە، گرفتی کارکردن لە دۆسیەکانی ئەنفال و جینۆساید فرە ڕەهەندە، چونکە پەیوەستە بە مێژوو، یان رابردوو. ئێمە بەردەوام مێژوومان لەناودەچێت، چونکە بەرکەوتەکانی ئەنفال زۆریان لەناوچوون و ئێستاش بەردەوام لەناودەچن. لەگەڵ مردنی هەر مرۆڤێک، چیرۆکێک یان چەندین چیرۆک دەمرێ و کۆتاییان پێدێت. گرفتی تر پەیوەندی بە دامەزراوەکانی ئەم وڵاتەوە هەیە، کە پەیوەندی بە مێژووی ئەم هەرێمەوە هەیە بۆ نموونە؛ وەزارەتی رۆشنبیری و وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوان. لەلایەن ئەم دامەزراوانەوە وەک پێویست هەوڵنادرێت، کارئاسانی بۆ نووسەرانی جینۆساید بکرێت. سالانە دەیان کتێبی باش دەنووسرێن، بەڵام ئەم دەزگایانە هەستی لێپرسراویەتیان لەو ئاستەدا نییە لە خەمی مێژووی دۆسیەکانی جینۆساید و ئەنفالدابن. تەنانەت هەندێک دەزگا لەوانە بەگاڵتەوە باس لەوە دەکەن، کە کتێب گرنگی نەماوە و کێ دەیخوێنێتەوە. گۆڤاری ئەنفالستان لە ساڵی ٢٠١٤ وەک کاغەز چاپ و بڵاونەکراوەتەوە،

بەڵام دەزگاکانی ئەم وڵاتە بەلایانەوە گرنگ نییە، کارکردن لە نووسینەوەی ئـەنفـال بـەردەوام دەبێـت، یـان دەوەســـتێـت. ئـەم دەزگـایـانـە لـە بنەڕەتەوە شـــکســـتیان هێناوە لە نووســـینـەوەی مێژووی ئـەنفـال و بەیـادەوەرییکردنی مـێژووی ئـەم تاوانانە لە باشووری کوردستان . بەگشـــتی دەزگا و دامەزراوەکانی وڵاتی ئێمـە نـەک هـاوکـارن، بـەڵکو هەمیشـە کێشـەت بۆ دروسـتدەکەن، چونکە تۆ کارێک دەکـەیت، کـە لـە بنەڕەتەوە بە لای ئەوانەوە پەســـەند نییە، هـەتـا ئـەگـەر کـار و پرۆژەی گرنـگ و ســـتراتیژیت هـەبێت بۆ خزمەتکردن بە دۆسیەکانی ئەنفال و جینۆســـایدەوە. بۆیە ئەم دۆســـیەیە قورســـاییەکی ئەخلاقی و پیشـــەیی دەخاتە ســـەر ئێمە، لەبەرئەوەی تا دێت، یادەوەریی کۆمەڵگە بە رووی دۆسـیەکان و ئەم مێژووەوە لاواز و کاڵتردەبێتەوە و کۆمەڵگە و تەنانەت کەســـوکاری قوربانیانی ئەنفالیش هیوایەکیان بەکاری ئەم ســـیســـتـمە نـەمـاوە و تـا دێت، ئـەم نێوانـەش فراوانتر دەبێت. لـە ئێســـتـادا ئـەم نـائومێـدییـە کـاریگـەریی زۆری بۆ کارە خۆبەخشـــەکانی ئێمە هەیە و ناتوانین ئەوەی دەمانەوێت ئەنجامی بـدەین، بـەربـەســـتی زۆرمـان بۆ دروسـتدەبێت.. هاوکات کێشـەیەکی تری جـەوهـەری ئـەوەیـە؛ چونکـە بـەگشـــتی درەنـگ لـە ئـەنفـال و دۆســـیەکاندا کارکراوە و زۆرشـــت لەدەســتچووە و فریای نەکەوتووین، ئێســـتا ئەمە ڕەنگدانەوەیەکی نەرێنی هەیە بەســـەر کارکردن لە بواری ئەنفال. ئەگەرچی ئینگلیز قســـەیەکی جوانی هـەیـە دەڵێت؛ هیچ کـاتێـک درەنـگ نییـە، بۆ ئـەوەی کـارێـک بکـەیت، بـەڵام ئێمـە گرفتی نیـەتمـان هەیە، نیەتمان دروسـت و راسـت و لەدڵەوە نییە کە کار بۆ ئەنفال بکەین . ئـەوەی دەکرێ کـاری نوخبـەیەکی کەمە، کە خۆبەخشـــانە دەیانەوێ مێژووی ئـەم تـاوانـە گـەورەیـە، کـە دواجـار دەبێت بـە جینۆســـاید لە فەرامۆشـــی دەربهێندرێت و ببێت بە یادەوەری زیندووی ئێمە. لە ڕێگەی یادەوەریمان ڕێز و شکۆ بۆ قوربانی

و کەســـوکارەکانیان دەربیڕین و بە کردەوە هەســـتبکرێت، ئەم تاوانە کە ناوی ئەنفالە خەمی هەموومانە، نەک تەنها خەمی ناوچە ئەنفالکراوەکان و لەناویشـــیاندا گەرمیانی ســـوتماکی ئەنفال و قۆناغی سێیەمە.

میدیای کوردی بەگشـــتی رۆڵی لە پەرواێزخســـتنی دۆسـیەی ئەنفال و نەناساندنی دۆسیەکە لەسەر ئاستی لۆکاڵی هـەیـە. ئێســـتاش زۆربەی خـەڵـک پێیوایـە تـەنها لـە گـەرمیان خـەڵـک ئـەنفالکراوە، لـەکـاتێکدا بۆ ماوەی حەوت مانگ خەڵک لە هەموو ناوچەکان و بە هەشـت قۆناغی یەک لـەدوای یـەک جگـە لـە ئـەنفـالی هەڵەبجە، کە ئەویش دۆســـیەیەکی تـاراددەیـەک نـەنـاســـراوە. میـدیـا کـەمتـەرخـەم بووە لـە کـارکردنی، بەشـــێوەیەک کە ئەم کارکردنە زۆر جار شـــایســـتە نەبووە بە ئاســـتی گەورەیی تاوانەکە. بێگومان کاری گرنگ کراوە، بەڵام بەگشتی کارەکان زۆر کـەمن و بـەقـەد بـاڵای ئـەنفال نییەو نابێت. زۆربەی میدیاکان تەنها ســاڵی یەک باســی ئەنفالیان کردووە و تا ســاڵی داهاتوو بەلایانەوە گرنگ نەبووە، کار لەسەر ئەم پرسە گرنگە بکـەن و چوارچێوە و وردەکـاریی نوێمان پێشـکەشـبکەن و زانیاریمان پێببەخشن.

گرفتێکی تر؛تەمەن و بەســاڵاچووانە، بێنە بـەرچاوی خۆی دیدار لـەگـەڵ کـەســـێکدا ئـەنجامبدەیت، نـاوی مناڵەکانی لێبپرسی و دەیانجار لەبەر خۆیـەوە قســـەبکـات و بیر لـەوە بکاتەوە، کە کوڕە گەورەکەی تەمەنی چـەنـد بووە و نـاوی چییـە؟ یـاخود کچە بچوکەکەی کە شـیرەخۆرەبوو، بەباوەشـــی دایکییەوە بە قامچییەکی جەللادێکی نوگرە ســـەلمان گیانی ســـپارد، ناوی چیبوو؟ یان تەمەنی چـەنـد بوو؟ ئـەمـانـە دابڕانێکی جـەرگبڕی دۆســـیـەکـانی ئیمـەن. تـاوانێکە دەرهـەق تـاوانێک کـە بـە دەستی خۆمان ئەنجامماندا. لێگەڕاین ئەنفال بە تەنیشتمان، بە پشتمانەوە، بـەلامـانـدا تێپـەڕێـت و ئـاوەڕی لێنەدەینەوە. بەڕاســتی هەموومان لە ئـاســـت ئـەم تـاوانـە گـەورەیـەدا، هەستمان بە بەرپرسیارییەتی نەکرد

وەک پێویست کارمان نەکرد. ئەنفال دۆسیەیەکی زۆر گەورە، بەڵام بەدەستی خۆمان باڵای ئەم تاوانەمان بچووک کردەوە. دەکرا بەهۆی ئەنفالەوە وابکەین، هەموو دونیا شەممان لە بەرامبەردا بنوێنن، بەڵام لەئێستا پێماندەڵێن؛ وریابن قەوارەکەتان کە هەرێمی کوردستانە، لەناودەچێت، ئەگەر یەکگرتوو نەبن .

لە کاتێکدا هەموومان باش دەزانین لەناوچوونی ئەم قەوارەیە، واتە لەناوچوون و بەفیڕۆچوونی خوێن و قوربانی ئەنفالکراوان و سەرجەم دۆسیەکانی تری جینۆساید لەباشوری کوردستاندا..

**پرسی ئەنفال ئێستا لە چی قۆناغێکدایە، ئایە تواناوە قۆناغی یادکردنەوە تێپەڕێنێت؟**

لە ڕاستیدا زۆر ڕاشکاوانە دەیڵێم؛ ئێمە نەمانتوانیوە بەمانا دروستەکەی یادی ئەنفال بکەینەوە. هەتا بتوانین قۆناغی یادکردنەوە تێبپەڕێنین. ئەگەر ئێمە وەکو پێویست یادی ئەنفالمان بکردایەتەوە، ئێستا مرۆڤی کورد نە بێهیوا دەبوو، نە نیشتمانەکەی جێدەهێشت. بەڵکو قوربانی بۆ دەدا، هەروەک چۆن لە مێژووی خۆیدا قوربانی بۆ داوە. لە ماوەی سی ساڵی رابردوو یادی ئەنفال بۆ یادکردنەوەی قوربانیان و کەسوکار و ئەو مێژووە نەبووە، بەڵکو بەگشتی حزبە سیاسییەکان ناچاربوون لەگەڵ هاتنی یادەکە شتێک بکەن و وتارێک بنووسن و بەڵێنێک لەنێوان ئەو سەدان بەڵێنە جێبەجێبکەن. واتە یادەکان هێندە شەڕی وتار و سوێند و بەڵێن بووە، هێندە کرداری بەدواوە نەهاتووە. نموونەشمان زۆرە لەم عێراقەدا کورد خاوەن زۆرترین پۆستی سیاسی و بوارەکانی تر بووە، کەچی هیچی بۆ ئەنفال نەکردووە.

تەنانەت بە هەموو یاسا و پێورێک دەبوو موچەی کەسوکاری ئەنفالکراوان لەسەر دەوڵەتی عێراق بووایە، کەچی نەیانتوانی ئەمەش بکەن بۆ بردنە پێشەوەی دۆسیەکە و باشکردنی گوزەرانی کەسوکاری قوربانیان. لەدوای ڕاپەڕینەوە

کۆمەڵێک کاری جەماوەریی بۆ ئەنفال کراوە، جۆش و خرۆشی خەڵک بۆ مێژووی خۆی لەوپەڕی بەرپرسیاریەتیدا بووە، بەڵام ساڵی یەکجار قسەکردن لەسەر تاوانێکی وەک ئەنفال چ یادەوەرییەک دەخولقێنێت؟!

بەگشتی ئەوەی کراوە لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات هێندەی خەمی تاکەکان بووە، هێندە وەک دامەزراوە ئەو کارە نەکراوە، هەوڵەکانیش لە چەند هەوڵ و کارێک زیاتر نییە، چونکە دەسەڵاتی سیاسی کارکردنی بۆ دۆسیەکانی جینۆساید بەئامانج نەگرتووە. ئەنفال نەبووە بە پرسێکی ئەخلاقی و مۆراڵی لە زهنیەتی ئەم دەسەڵاتە. بۆیە بۆچوونی منیش هەروەکو ئەو پیرێژنەی ئەنفالە لە قەزای چەمچەماڵ، کە تەنها خۆی و دوو کچی لە شاڵاوەکە ڕزگاریان ببوو، پێیوتم ڕۆڵە گیان ئەمانە کەی یادی ئەنفال دەکەنەوە، ئەمانە ئەنفالمان لەبیردەبەنەوە. دەیانەوێ چیتر باسی نەکەین. ئەقڵی ئەم سیستمە سیاسییە وەک خاوەن ئەو دەزگا ڕۆشنبیرییە، کە لێپرسیم، بە داخەوەم کە ناتوانم کتێبەکانی ئەنفالت بۆ چاپبکەین، چونکە ئەنفال پارە ناکات. بۆیە دەگەین بەو ڕاستییەی ئێمە هێشتا یادی ئەنفالمان نەکردووەتەوە وەکو یاد، بەڵکو بەگشتی کۆبوونەوەی جەماوەریی بوون و هیچیشیان لێسەوز نەبوو، بەڵگەش بۆ ئەمە لە ئێستادا نە ئیشکردن لە دۆسیەکە وەکو جارانە و زۆربەی خاوەن قوربانی وەک پێشووتر باس لە ئەنفالکراوەکانی ناکات و نە ڕێکخراوەکان سەرکەوتووبوون لە زیندووهێشتنەوەی ئەم مێژووە و نە دەسەڵاتیش باکی بەم گرفتانە هەیە، کە لە سەرەوە باسمانکردن.

**نیگەرانییەکانی کەسوکاری ئەنفال تا چەند لە جێگەی خۆیدایە؟**

دەبوو نەک تەنیا کەسوکاری ئەنفالکراوان، بگرە هەموو کۆمەڵگە بارگاوی بووایە بە نیگەرانی و بێزاری لەدەست ئەم سیستمە سیاسییە خراپە بەرامبەر بە

دۆسیەکانی جینۆساید لە باشووری کوردستـــــتان. ئەم هەرێمە دەرفەتی جوانترین ســـیســـتم و حوکمڕانی هـەبوو، دەیتوانی بـە ڕێزگرتنی لـە قوربانییەکانی جینۆســـاید باشـــترین دەوڵەتی دروســـتبکردایە، بەڵام نەک دەوڵەت و ســیســتمێکی راســتەقینە، بەڵکو خەونی ســـەدان ســـاڵەی ئەم گەلەشـــیان لەباربرد. ئەگەر کۆمەڵگە جـارێک غـەمبـار و نیگـەران بێت، کەســوکاری قوربانیانی دۆســیەکانی جینۆســـــاید چەندین جار بریندار و نیگەرانن، چونکە ئـەوان قوربـانیان هـەیـە و بـاجی کوردبوونیـان داوە. جگە لەوەش دەیان مافی کەسوکاری قوربـانیـان هـەیـە، تـائێســـــتـا جێبەجێنەکراوە، هەر لە دادگاییکردنی بکـەرانی ئـەنفـال و دابینکردنی ژیـانێکی پرشـــکۆ و گێڕانـەوەی رووفاتی قوربانیانی ئەم تاوانە و چـەنـدین پرســـی تری ئـەنفـال. ســـەرباری ئەوەش ئەم دەســـەڵاتە لەســـــەر حســـــابی ئەنفال لە رووی نێودەوڵـەتییـەوە خۆیـان بـە جیهـان ناساند و باڵای خۆیان و حزبەکانیان پـێ بـڵـنـد و بـەرزکـرد و لــە بەرامبەریشـــــدا باڵای دۆســـــیەی ئـەنفـالیـان بچووک و نزمکردووە. هەموو ئەمانە وایکرد، کەســـوکاری قوربـانیـان نیگـەرانی و نـائومێـدی بچنەوە، لەم بارودۆخە خراپەی لەم هەرێمە دەگوزەرێت.

**با لەخۆمان بپرسین چی کراوە بۆ پرسی گۆڕەبەکۆمەڵەکان، بۆ تائێســـتا حکومەتی گرنگی بەم پرسەنادات؟**

دەتوانین بڵێین لەگەڵ دروســـتبوونی وڵاتێک کە ناوی عێراقە، ناکۆکی و ســـڕینەوەی ئـەوی تر گـەیشـــتـە ئاســـتێکی کوشـــندە و لەناوبردنی بەکۆمـەڵ. ئـەم دەوڵـەتـە تـازەیـە لـە هـەموو ســـەردەمـە جیـاوازەکـانـدا کوشـــتنی بـەکۆمـەڵی ئـەنجـامـداوە، کـەواتـە گۆڕی بـەکۆمـەڵی بۆ دژ و نـەیـارەکـانـی نـاوەتـەوە. گۆڕەبەکۆمەڵەکانی ناو چوارچێوەی جوگرافی دەوڵەتێک کە ناوی عێراقە، ئاماژەن کە ئاســـودەیی و بەیەکەوە ژیان لە خاڵێکی مەترســـیداردایە. بیابانەکان، ناوچەلماویی و گەرمەکان

بوون بە مەنزڵگایی سەدان هەزار مرۆڤی بێتاوانی کوردی هەرێمی کوردستان. ئەگەر ریزبەندییەک بۆ ئەم گۆڕانە بکرێت، هەر لە جینۆسایدی کوردانی فەیلی لە ساڵی ١٩٨٠ تا جینۆسایدی نێرینەوەی بارزانی ١٩٨٣و تاوانی ئەنفال و تاوانی کیمیابارانی هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٨٨ و جینۆسادیدی زەرگۆشەکان لە ساڵی ٢٠٠٣ بەدواوە، تا دوا تاوان و جینۆساید، جینۆسایدی ئێزیدییەکان بوو لە ساڵی (٢٠١٤). کۆی ئەم تاوان و جینۆسایدانە لە سنوری وڵاتێک ئەنجامدەدرێت، کە ناوی دەوڵەتی عێراقە، کە هیچ کاتێک نەبووە بە مایەی ئاسودەیی پێکهاتە جیاوازەکان. گۆڕەبەکۆمەڵەکانی تاوانی ئەنفالیش کە نزیکەی ٣٠٠ بۆ ٤٠٠ گۆڕی بەکۆمەڵ دەبن و هە تا دێت، ئەم ژمارەیە زیاتر و زیاتر دەبێت. بەڵام نیەتێکی هاوبەش و گشتی لە نێوان هەرێم و بەغدادا نییە بۆ هەڵدانەوەی گۆڕەکان و هێنانەوەیان بۆ زێد و خاکی خۆیان، بەتایبەتی حکومەتی هەرێم زۆر کەمتەرخەمە، ئەگەر جاران پرۆسەی جیاکردنەوەی رووفاتەکان و ئەنجامدانی پشکنینی DNA ناجۆر و سەخت بووبێت، بەڵام لە ئێستادا ئەم کردار و پرۆسەیە زۆر ئاسانە. ئەمرۆ بوونی ئەم گۆڕە بەکۆمەڵانە ناشترین دەرفەتی ئەوەت پێدەدات، کە داوای بە جینۆسایدناساندنی ئەنفال بکەیت و هاوکات جەخت لەسەر قەرەبووکردنەوە و داوای لێبووردنی دەوڵەتی عێراقی لەبەرامبەر ئەم تاوانە بکەیتەوە. لە راستیدا وەک ئاماژەم پێکرد لە زهنیەتی حکومەتی هەرێم جگە لە مووچە و هەندێک ئیمتیازات بۆ کەسوکاری ئەنفال خەمی تری نییە بۆ ئەنفال و هەوڵدەدات ئەنفال لە یادەوەریی کۆمەڵگەدا ئەو کاریگەرییە بێگیان و رۆحە بێت، کە ساڵ دوای ساڵ کاڵتر و کاڵتر و لاوازتربێت..

**دەبێت چی بکرێت، بۆ ئەوەی تاوانی ئەنفال ببێت بە پرسێکی جیهانی؟**

بە بڕوای من، کورد بەم ئەقڵ و پێگەیەی لەسەر ئاستی لۆکاڵی و هەرێمی و نێودەوڵەتییەی کە هەیەتی، ناتوانێت کاری جددی بۆ ئەنفال بکات و بیکات بە پرسێکی جیهانی و ئەنفال لە یادەوەریی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی جێبکاتەوە. ئەزموونی حوکمڕانی کوردی بەرامبەر دۆسیەکانی جینۆساید، بەتایبەتی ئەنفال شکستی هێناوە، چونکە وەک لە شوێنی تریش ئاماژەم پێکردووە، حزبە سیاسییەکانی هەرێم خۆیان بە بۆنەی ئەنفالەوە دەوڵەمەند و ناسراوکرد و لە بەرامبەریشدا بالای ئەنفالیان بچووک کردووە، هۆکاریش زۆرن، ئەگەر بمانەوێ ئەنفال لەو جوگرافیایەی بەرینە دەرەوە، دەبێت کۆی دامەزراوەکانمان نیشتمانی و پاک و دڵسۆز و بەئەمەک بن بەرامبەر بە خەمی ئەنفال و سەرجەم دۆسیەکانی جینۆساید لە باشووری کوردستان. دامەزراوەکانی هەرێم خاڵی بکرێن لە گەندەڵکاران، ئینجا دەستبکرێ بە هەوڵ و تەقەلا بۆ وەرگرتنی ئەم دۆسیەیە لە سەکۆی نێودەوڵەتی و حکومەتی عێراقیش ناچاربکرێ بەوەی لە پەیماننامە نێودەوڵەتییەکان ببێت بە ئەندام و تێکەڵ بەو وڵاتانە بێت، کە مافی مرۆڤ دروشمی سەرەکی و پرەنسیپێکی مۆراڵی گەورەیە لای ئەوان. هەتا عێراق بە دابڕاوی بمێنێتەوە، هەرێمیش سیستەم و دەسەڵاتەکەی لەنێوان دوو کەوانەدا نیشانەی پرسیار هەڵبگرێت، پێموایە هیچ لە دۆسیەکان سنوری دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق تێناپەڕێنێت، کاتێک لە ساڵی ٢٠٠٧ ئەنفالی وەک جینۆساید ناساند.

**حکومەتی هەرێم دەیتوانی چیبکات بۆ پرسی ئەنفال و کەسوکاری قوربانیانی ئەنفال؟**

١. حکومەتی هەرێم دەیتوانی کاری زیاتر بۆ ئەنفال بکات لە ڕووی نێودەوڵەتییەوە.
٢. دەیتوانی لەدوای ساڵی ٢٠٠٣وە زۆرترین گۆڕی بەکۆمەڵ بهێنێتەوە

و تـەرمی پیرۆزیـان رادەسـتی کەسوکارەکانیان بکاتەوە.

٣. وردتـر کـاری لـەسـەر قـەرەبوو کردنـەوە و موچـە و ئیمتیازات بکردایە

٤. پرۆسەی بەدیکیۆمێنتکردنی ئەنفال لەبار و قۆناغێکی شـایسـتەتر بووایە.

٥. نـاوچـە ئـەنفالکراوەکانی ئاوەدان بکردایەتەوە نەک کاول و وێرانتری بکرادایە.

٦. لە بواری پەروەردەدا لە زۆربەی ئـاسـتـەکـانـدا وانـەی ئـەنفـال و جینۆساید بخوێندرایە.

٧. لـە رووی یـادکـردنـەوە و شـێوازەکـانی یـادکردنـەوەی بگۆڕیایە بەک سـاڵ دوای سـاڵ بـەڵێنبدرێت و جێبـەجێنـەکرێت و خـەڵک بێهیوا بکرێت لـە مێژووی قوربانییەکانی خۆی.

٨. دادگاییکردنی تۆمەتبارانی ئەنفال و یەکلاییکردنەوەی ئەم دۆسیەیە کە لە دوای ٢٠٠٣ەوە گەرمتر لە جاران قسـەی لەسـەر دەکرێت، بەڵام زۆربەی ئەو تۆمەتبارانە لە ریزی حزبەکانی دەسـەڵات پێگەی زۆر گرنگ و هەستیارییان هەیە.

٩. ئەنجامدانی رووپێویەکی ورد و متمـانـەپێکراو و دروسـت بۆ سـەرجەم لایەنەکانی ئەنفال و ئەژمارکردنی سەرجەم زیانەکان.

١٠. دامەزراندنی میدیایەکی نیشـتمانی بۆ پرسـەکانی جینۆسـاید لە هـەرێـمی کـوردسـتـان و ئاراستەکردنی بۆ دەرەوەی هەرێم.

١١. هـاوکـاری ئـەم ژنـانـەی لـەدوای ئەنفال منداڵەکانیان بە جوانترین شێوە پەروەردەکرد و رۆڵەکانیان کرد بە خاوەن بڕوانامەی بەرز و پۆستی گەورە.

١٢. بەداخەوە بەهۆی ئەنفالەوە دەیان کچ قـەیرەبوون و پرۆسـەی هاوسـەرگیریی بەجێیهێشـتن، حکومـەت نـەیتوانی لـە رێگـەی پڕۆژە بڕیارێکەوە کارئاسـانیان لەسەر ئەم پرسە بۆ بکات..

١٣. ئەرکی زیندووهێشـتنەوەی ئەم تـاوانە لە بیروەری تـاک بەتـاکی کوردا بۆ ئێستا و بۆ دەیان ساڵی

داهاتووش لەسەرشانی هەموو تاکێکی بەویژدان و بەئاگایە ؛ سەرەتا دەبێت لە کۆمەڵگەیەکی هۆشیارەوە دەستپێبکەین، ئەگەر کۆمەڵگەیەکی هۆشیار و تەندروستمان نەبێت، ئەگەری ئەوەمان لاوازدەبێت، دۆسیەکانی جینۆساید بەتایبەتی تاوانی ئەنفال لە بیرەوەریی و ئادەوەریی جێبکەینەوە، یان ئەنفال بکەین بە کۆیادەوەریی لەنێو زهنیەتی کۆمەڵگەی کورددیدا. پەروەردە یەکێک لە سێکتەرەکانە ئەگەر کاری دروستی خۆی بکات و بەپێی ئاستەکان ئەنفال و تاوانەکانی جینۆساید دابەشبکاتەوە ناو پرۆگرامی پەروەردەی کوردی. بە واتایەکی تر؛ هەرکاتێک ئاستی هۆشیاری گەیشتە ئەوەی جیاوازیی دروستبکات و بگەڕێتەوە بۆ کارکردن لەسەر مێژووی دۆسیەکانی جینۆساید لە باشووری کوردستان ڕێگاکانی تر ئاسان دەبن، چونکە لە بنەڕەتدا نیەتێک بەدیدەکەین بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو هەڵانەی لە ڕابردوودا کردوومانە.

لەدوای پەروەردەوە لە هونەردا کاری لەسەر بکرێت، بەتایبەتی هونەری سینەما کە تا ڕادەیەکی زۆر دەتوانێت خەمساردیی و بێباکییەکانی ڕابردوو چارەسەربکات و ئەنفال بەرێتە پێشەوە ..

**تـاوانی ئەنفـال خەریکە لە بیری نەوەی ئێستا دەچێتەوە، بۆچی ئەم تاوانە وا زوو بەئاسانی خەریکە لەیاددەکەین؟**

وەڵامەکەی بە دیدی من بەمجۆرەیە؛ لەبەر ئەوەی ئەنفال لە ژیانی ڕۆژانەماندا بوونی نییە، جوولەکەکان بەر لە نانخواردنیان دروود بۆ قوربانیانی هۆلۆکۆست دەنێرن، چونکە پێیانوایە ئەوەی هەیانە لەم ژیانە، پەیوەندی بە قوربانیدانی ئەوانەوە هەیە، ئەم نەریتە بەردەوام دووبارەدەبێتەوە و هەستێکی مۆراڵی لە یادەوەریی جولەکە دروستدەبێ. بەڵام ئێمەی کورد ساڵی یەکجار یادی ئەنفال دەکەینەوە، بەجۆرێک کە نە کەسوکاری ئەنفال دڵیان بەم یادکردنەوانە خۆشە و نە کۆمەڵگەی

کوردســــتانیش پێیوایە ئـەم جۆرە یادکردنەوەیە شـــکۆی قورباذیان بـەرزڕادەگرێـت ونـەدەتوانێ ببێتـە مایەی ڕێزگرتن لـە کەســـوکاری قوربـانیـان. جـارێکی تر دەبێـت بگـەڕێینـەوە بۆ پـەروەردە و هونـەر کە دوو سـێکتەری گرنگن لەئاسـت تاوانی ئەنفال شـکسـتخواردوون و نەیانتوانی ئەم تاوانە لە یادەوەریماندا بهێڵـدرێتـەوە. نـەوەی نوێش هیچ ئاگاییەکی نییە لە بارەی رابردووی خــۆی و ئــیــش لـــەســـــەر هۆشـــیارکردنـەوەی نـاکرێت. لـە هەمووشـــی شـــەمتر؛ ئێمەی کورد دەزگای یادەوەریمان نییە، تاوەکو هەرهیچ نەبێت، چیرۆک و تراژیدیاکە بە وێنە و دەنگ و ڕەنگ هاوشێوەی جوولەکەکان بکات بە کاری هونەری و گـەنجـەکان بڕوامـان پێبکـەن، کـە ئـەنفال تـاوانێکە دژی ئـەم گـەلـەی بـــاشــــــوور ئــەنــجــامــدراوە و کاریگەرییەکانیشـــی هەتا زەمەنێکی زۆر لەگەڵمان دەژی و دەمێنێتەوە. بۆیە دەگەین بەو ڕاســـتییەی کە ئەنفال دۆسـییەی سـەدەیە و لە هەر ســـەردەم و بـاروودۆخێکدا کـاری جـددی بۆ بکرێـت، دەتوانـدرێـت بەشـێک لە شـکســـتەکانی ڕابردوو چـارەبکرێـت و قەرەبووبکرێتەوە، ئەوەتا ئەرمەنەکان دوای ١٠٠ ســاڵ زیاتر لە هەوڵدابوون جینۆســـایدی ئەرمەنەکـان بە جـیـنـۆســـــایـد بناســـێندرێت و هەتا ئێســـتاش لە هەوڵەکـان بەردەوامـن، بـۆ ئەوەی ئەگەر کـــارێــکـــی گەلـــی ئەرمەن بچووکیش بێـت، بەلام بۆ گەلی ئەرمەن شـکۆ و شـانازییە و مایەی زینـدووهێشـــتنەوەی دۆســـیەی جـیـنـۆســـایـدکـردنـی گەلەکەی دەگەیەنێـت. ئەگەرچی زۆر درەنگە، بەڵام هێشـــتـا کوردیش بەهۆی ئەنفالەوە دەتوانێت کـاری گەورەو ناوازە پێشـکەشـبکات. ئەوەشـمان لەیـادنەچێت؛ ڕۆژانە بەهۆی مردنی ئەنفـالکراوێـک دەیـان چیرۆکی نەبیسـتراوی ئەنفال لەناودەچن و بۆ هەتاهەتایە وندەبن.

**بەرهەمە چاپکراوەکان :**

١- ئەنفالستان وەک بڵاوکراوەیەک تائێستا شازدە ژمارەی بە کاغەز و PDF دەرچووە و بڵاوکراوەتەوە.

٢- ئەنفال و تێگەیشتنە جیاوازەکان، بەرگی یەکەم، ٢٠١٠.

٣- ئەنفال و تێگەیشتنە جیاوازەکان، بەرگی دووەم، ٢٠١٩.

٤- جینۆسایدی زەرگۆشەکان لاپەڕەیەکی تر لە سڕینەوەی شوناس، چاپی یەکەم، ٢٠١٥.

٥- جینۆسایدی زەرگۆشەکان لاپەڕەیەکی تری سڕینەوەی شوناس، ٢٠١٩.

٦ - شێخ حسێنی هەزارکانی هەڵبژاردنی مەرگ و ڕەتکردنەوەی بڕیاری سەددام لە ئەنفالدا، ٢٠١٩.

٧- حەمەرەشید توکنی، پارتیزانی ڕۆژە سەختەکانی ئەنفال، ٢٠٢٤.

٨ - مەلارەحیمی مەلارەشید، پارتیزانی ڕۆژە سەختەکانی ئەنفال، ٢٠٢٣.

٩- نوگرە سەلمان ــــ قەڵای مەرگ وپاکتاوی نەژادیی، چاپی یەکەم، ٢٠٢٣.

١٠- نوگرە سەلمان ــــ قەڵای مەرگ وپاکتاوی نەژادی، چاپی دووەم، ٢٠٢٤.



# ئایا شەنگال دەبێتە دوایەمین جینۆسایدی گەلی کورد؟

## ئاخۆ دەکرێ "مەڵبەندی جینۆساید" بکەین بە "مەڵبەندی ڕزگار لە جینۆساید"؟


فەرمان حسێن دەروێش

نووسەر و پسپۆڕی بواری جینۆساید

ڕاوێژکاری مەکتەبی شەهیدان و تێکۆشەران (ی.ن.ک)




**داعش و پەلامارەکانی شـــە نگال و جینۆسایدی ئێزدییان:**

لە مێژوودا ئێزدییەکان ڕووبەڕووی زۆر جینوســـــاید و کوشـــتن و لەنـــاوبردن بوونەتەوە، بەتـــایبەتی بەهۆی بیروباوەڕ و ئایینەکەیانەوە، بەڵام جیاواز لە جینۆســـــایدەکانی ڕابردوو لە هێرشـــەکانی داعشـــدا بۆ ســـــەر شـــــەنگال لە ئابی (٢٠١٤)، ئێزدییەکـــان ڕووبەڕووی تـــاوان و کوشتن و کڕین و فرۆشتن بوونەوە.

جینۆســـــایدی ئێزدییەکان بەدەســـتی داعش تەنهـا خۆی لـە کوشـــتن و لەنـاوبردن و کـاولکردنی شـــــارو گونـدەکـانیـانـدا نەبینیەوە، بەڵکو (ســـــەبی)کردنی کچـان و کڕین و فرۆشـــــتنیـان و دەســـــتدرێژی بۆ ســـــەریـان، یەکێکـە لـە تـاوانـە قێزەونەکـان، پەلامـاری داعش بۆ ســـــەرئێزدییەکـان جیـاوازبووە لە پەلامارەکانیان بۆ ســـــەر شـــــارو شـــــارۆچکەکانی دیکە، داعش بەر لەوەی هێرش بکـاتە ســـــەرومـاڵی ئێـزیـدییەکـانی حەڵاڵکرد، بەپێی بۆچوون و بڵاوکراوەکـان داعش، ئێزدییەکان "موشریک"ن، جیاوازن لە مەسیحی و جولەکە، کە ئەوان ئەهلی کتـاب"ن و دەتوانن لـە ســـــنوری حوکمڕانی داعشـدا و لە چوارچێوەی دەوڵەتەکەیاندا "جزیە" بدەن و بژین، بەڵام ئێزدییەکـان ئەگەر نەبن بـە موســـــوڵمـان دەبێت پیـاوەکـانیـان بکوژرێن و ژنەکانیشـــیان "ســـــەبی" بکرێن.

تاوانەکانی داعش لە پرسـی کچان و ژنانی ئێزدی سـنورەکانی مرۆڤایەتی تێپەڕانـد، بەتـایبەتیش لـە مـامەڵەی کڕین و فرۆشـــتن و دەســـتدرێژی سـێکسـی و پاشـان بە دیاری ناردنی کچـان بۆ یەکتری، ئەمـە کـاریگەریی گە ورەی لەســـەر لایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونی کچان و ژنانی ڕزگاربوو دروســـتکردووە، پێویســـتیـان بـە دووبـارە پشـــتیوانی و ڕاهێنـانەوە هەیـە، بۆئەوەی وەک کەســـێکی ئاسایی بگەڕێنەوە بۆ ناو کۆمەڵگە[(١)].

پەلاماری داعش بۆ سـەر شـەنگال و ڕەفتـارەکـانی داعش لەو نـاوچەیـە بەرامبەر بـە ئێزدییەکـان، بەتەواوی دەچێتە چوارچێوەی جینۆســـــایدی نێودەوڵەتییەوە و لەگەڵ پەیماننامەی نەتەوە یەککگرتووەکـانی (١٩٤٨)دا دێتەوە سەبارەت بە جینۆساید.

داعش لەژێر نـاوی ئـایینی پیرۆزی ئیســـــلامدا وەک ســـــەبایا مامەڵەی

لەگەڵ کچان و ژنانی ئێزدییەکاندا کردووە و کڕین و فرۆشـــتنی پێوە کردوون، لەگەڵ کوشتن و لەناوبردن و ڕفـانـدنی ئێزدییەکـان بەردەوام مەزارگە و شـــوێنە پیرۆزەکانیان ڕووبەڕووی ڕووخـان و لەنـاوبردن بوونەتەوە.

ئێزدییەکان لە مێژوودا ڕووبەڕووی ســـەدان جینوســـاید و لەناوبردن و قەتـلــوعــام بــوونەتەوە، ئەوەش کـاریگەری لەســـەر کەمبوونەوەی ژمـارەی ئەو پێکهـاتەیەدا هەیـە لـە عێراق بەگشتی و هەرێمی کوردستان بەتـایبەتی، بەو پێیـە ســـەرەڕای کوشـــتن و لەنـاوبردن بەشـــێکی زۆریان ڕوویانکردووەتە دەرەوەی وڵات.

بە بەراورد لەگەڵ پرۆسەی ئەنفال و ئەو تاوانانەی ڕووبەڕووی کچان و ژنـان بووەتەوە لـە کوشـــتن و لەنـاوبـردن و دەســـتدرێژی و فرۆشتنیان، کچان و ژنان لە هەردوو پرۆســەی ئەنفال و شـەنگالدا هەمان ڕەفتاریان بەرامبەر کراوە[٢].

لەدوای گرتنی شاری موسڵ لەلایەن چەکدارانی داعش و لـە١٠/٦/٢٠١٤ بەجۆرێـک لـە جۆرەکـان، داعش بۆماوەیەک بێدەنگ بوو، چالاکی و پەلامـارەکـانی ڕاگرت بـە ئـامـانجی خۆقایمکردن و ڕێکخستنەوەی خۆی لەناو شـــاری موســـڵ، (موســـڵ) کە شـــارێکی مێژوویە و ســـەنتەری پارێزگای نەینەوایە، بە دووەم گەورە شــاری عێراق دادەنرێت و دەکەوێتە بــاکووری عــێراقەوە و زۆرتـریـن پێکهاتەی تێدا دەژی)[٣].

دوای نزیکەی دوو مانگ لە بێدەنگی لە ٣/٨/٢٠١٤ بەتەواوی ســـنوری چــواردەوری خــۆیــدا هــێرش و پەلاماریدا و سنوری خۆی فراوانکرد، لـە ڕۆژهەڵات و بـاکوورەوە قەزای تلکیف و وانکێ و باشیک و بەرتلە و قەزای حەمـدانـیەی گـرت، لــە ڕۆژئاواشـەوە تەلەعفەر و زوممار و ڕەبیعە و شـــەنگالی گرت، بەڵام لە هێرش و پەلامارەکەی بۆ ســەر شـە نگـال زۆرترین زیـانی گەیـاند، کـە ســـەرەڕای لەدەســـتدانی خـاکی کوردستان بە سەدان کوردی ئێزدیی کوژران و ژمـارەیەک لـە کچـان و ژنانیشـیان بران و بەشـێکیشـیان لە چیای شـــنگال لە تینوێتی یان لە برسێتیدا گیانیان لەدەستدا.

بــە کۆنترۆڵکردنی شـــەنگـال و تەلەعفەر و دەوروبەری موســـڵ

ڕووبەری (١٠ هەزار و٤٢٠) کـم خـاکی ئەو نـاوچەیـە لـە دەسـتـی کـورددا نەمـا، بەو پـێـیەی قەزای شـەنگال کە لە هەردوو نـاحیەی (سـنونێ و قەیرەوان) پێکهاتووە و (٩٧) گـونـد لەخـۆدەگـرێـت و ڕووبەرەکەی (٣١٨٨)کم٢ و ژماری دانیشـتوانەکەی بە زیاتر لە (٣٢٠ هەزار) کەس ئەژماردەکرێت، قەزای تەلەعفەر کە پێشـتر لەژێر دەسـتـی داعشـدابوو، لە هەرسـێ ناحیەی (زوممـار و عیـازیـە و ڕەبیعـە) پـێـکـهـاتـووە و (١٧٢) گـونـد لەخـۆدەگـرێـت و ڕووبەرەکەی (٤٢٩٧)کـم٢ و ژمـارەی دانیشـتوانەکەی زیـاتر لـە (٤٠٠ هەزار) کەسـە، بەو پێیەش ڕووبەری ئەو نـاوچەیەی ڕۆژئـاوای موسـڵ (٨٤٧٥)کـم٢ و ژمـارەی دانیشـتوانەکەشـی زیاتر لە (٧٢٠ هەزار) کەسـە، هـە مووی کەوتـە دەسـتی داعش، بەڵام بەشـی باکوور و ڕۆژهەڵاتی موسـڵ کە پێشـتر لە دەسـتی هێزی پێشـمەرگەدا بوو، لەو پەلامـارەدا قەزای تلکێف و هەردوو نـاحـیەی وانـکـی و فـایـدە کـە ڕووبەرەکەی (١٢٨٠)کم٢ و زیـاتر لـە (١٩٥ هەزار) ژمـارەی دانیشـتوانیەتی، لە قەزای حەمدانیە هەردوو ناحیەی نەمرود و بەرتلە کە ڕووبەرەکەی (١١٥٥) کـم٢ و دانیشتوانەکەی بە (١٨٥ هەزار) کەس مەزەندەدەکرێت و ناحیەی باشـیک سـەر بە موسـڵ کە ڕووبەرەکەی (٥٠٠) کم٢ و دانیشـتوانەکەی زیاتر لـە (٧٠ هەزار) کەس دەبێـت، بەو پـێـیەش کـۆی ڕووبەری ئـە و نـاوچـانەی کـە کورد لەدەسـتـیدا (١٠٤٢٠)کم٢ دانیشتوانەکەی نزیکەی (١ مـلـیـون و ١٧٠ هەزار) کەس دەبێت، واتـا بەشـی زۆری خـاکی کوردسـتـانی پارێزگـای موسـڵ (نـاوچەی جێنـاکۆک )ی ٢٨ ئەو پارێزگایە لەدەستی کورددا نەما، بەو پێیەش کورد لەو سـنورە (٤ قەزا) و (١٠) نـاحیـە و سـەدان گونـدی لەدەسـتدا، سـەرەڕای ئە و قوربانییە زۆرە، داعش لە دوای دروسـتبوونی و پەلامـارەکانییەوە هیچ پەلامـارێکی هێنـدەی پەلامـاری (٢٠١٤/٨/٣) پڕ زیان و دەسـتکەوتی نەبووە، لەدوای ئەو پەلامارەشـەوە، ئیتر هێزەکانی هاوپەیمانان کەوتنەخۆ لە بەرامبەر مەترسـییەکانی کە ڕۆژبەڕۆژ لـە گەشەدابوو، فراوانتردەبوو[٤].

**• لێکەوتە مرۆییەکانی جینۆسایدی ئێزدییان لە شەنگال :**

لە (٣ی ئابی ٢٠١٤)دا شەنگال و ناوچەکانی دەوروبەری بەتایبەتیش ناوچەی ئیزدینشینەکان رووبەرووی گەورەترین جینوساید بوونەوە و تەواوی شێوازەکانی جینوساید لە شەنگالدا هەبووە لە (کوشتن، زیندەبەچالکردن، ئەشکەنجەدان، ئاوارەبوون، لەبرسامردن، کۆمەڵکوژی، دەستدرێژی، ڕاگواستنی منداڵ، وێرانکردنی ماڵ و حاڵ، ڕوخانی پەرستگار و شوێنی ئایینی ...هتد).

کوشتن و لەناوبردن بۆ خستنەڕووی ئاماری ئەو زیانە گیانی و ماڵیانەی کە ڕووبەڕووی هاولاتیانی ئەو ناوچەیە بوونەتەوە، پشت بەو ڕاپۆرت و لیدوانە ڕەسمیانەی کە لەلایەن سەنتەر و دامەزراوە و بەڕێوەبەرایەتییە تایبەتمەندەکان بەستراوە، لەگەڵ ئەو ئامار و داتا نارەسمیانەی کە بلاوکراونەتەوە.

یەکەمین کۆنفرانسی "لالش بۆ ئاشتی و پێکەوە ژیان"، وردترین ڕاپۆرتی لەسەر زیانەکانی دەستی داعش خستوەتەڕوو "پۆلێنی تاوانەکانی داعش دوای پەلامار و شالاوەکانی بۆ سەر شەنگال و داگیرکردنی دەکات و بەم شێوەیە دیاریان دەکات:"

**ئاوارەبوون:** ئاوارەبوونی زیاتر لە (٤٣٠) هەزار کوردی ئێزدی، نزیکەی (١٤٠) هەزاریان بۆ ماوەی زیاتر لە ١٠ ڕۆژ بێ نان و بێ ئاو لە چیای شەنگال گیریان خوارد، نزیکەی (٢٩٠) هەزاریان ئاوارەی هەرێمی کوردستان و تورکیا و سوریا بوون.

**کوشتن:** لە سەرەتای پرۆسەی پەلامار و شالاوی داگیرکارییەکەدا، زیاتر لە (١٨٠٠) هەزار و هەشت سەد کەس، دووچاری کوشتنی بەکۆمەڵ بوونەوە، کە تەنها لە گوندی کۆجۆ (٤٠٠) پیاوی ئەم گوندە لە گۆڕێکی بەکۆمەڵ نێژراون.

**ڕفاندن:** ڕفاندنی زیاتر لە (٣٠٠٠) کچ وژن و منداڵ، کە ناوی (١٦٦١) کەسیان پشتڕاست کراوەتەوە، جیاکردنەوەی ڕەگەزی مێینە لە پیاوان و بە نۆرە دەستدریژی سێکسیکردنە سەریان و بەزۆر ناردنیان بۆ شوێنانی تری ژێردەسەلاتیان و بەزۆر پێگۆڕینی

ئاین و سەپاندنی ئاینی ئیسلام بە سەریاندا.

**ونبون:** ونبوونی زیاتر لە (٥٠٠) پێنج سەد کەس، کە ناوو ناونیشان (٢٥٤) کەسیان لەلایەن کەسوکارەکانیان پشتڕاستکراوەتەوە، کە هەتا ئیستا بێسەرو شوێنن.

**مردووان:** لە ئەنجامی برسێتی و تینوێتی و ماندووبوون لە ڕێگا زیاتر لە (٦٠٠) کەس لە پیر و منالّ و ژن گیانیان لەدەستداوە.

**رووخاندنی پەرستگاکان:** ڕووخاندنی زیاتر لە (١٤) چواردە پەرستگا و شوێنی ئاینی کوردانی ئیزدی کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەها ساڵ پێش ئیستا[٥].

**سەبیکردنی کچانی ئیزدی:** ئەوەی لە شەنگال ڕوویدا، تەنها بە کوشتن و ڕاکردن و ئاوارەبوونی خەڵکەکەی کۆتایی نەهات، بەڵکو مەترسیدارترین تاوان بەرامبەر کچان و ژنانی ئیزدی کرا، ئەویش فرۆشتن و بە کەنیزەکردنی کچان و ژنانی ئیزدیە لە بازاڕەکانی ڕەققە و موسڵ و دەستدرێژیکردنە سەریان.

**داعش و تالّانی:** ئامانجی داعش لە پەلاماردانی ناوچەکان بەر لە هەموو شت تالّانکردن و بردنی کەلوپەل و دەستگرتن بە سە ر ماڵ و موڵک و سامانی تایبەتی و گشتیدا، ئەگەر ئەمە بۆ ناوچەکانی تر ڕاست بێت، ئەوا بۆ ناوچەی شەنگال زۆر زیاتر بووە، بەوەی ئەوان بە چاوی موشریک سەری ئیزدییەکانیان کردووە و پێیان وایە هەرچی دەستیان کەوێت غەنیمەیە و کچ و ژنەکانیشیان سەبایایە"[٦].

**جیاکردنەوەی دە ستگیرکراوەکان:**

لە دوای هێرشی داعش بۆ سەر شەنگال و گوند و ناوچەکانی دەوروبەری، لە (٢٠١٤/٨/٣) ژمارە یەکی زۆری هاوڵاتی کوردی ئیزدی کەوتنە دەستی چەکدارانی داعش، لە یەکەم هەنگاوی دەستگیرکردنیان لە دوای لێسەندنی کەلوپەل و زێڕو پارەکانیان جیاکردنەوەیان بوو، بەم شێوەیە: (کچە گەنجەکان بە جیا، پیاو بە جیا، ژن و منداڵیش بەجیا) ئە م شێوازە لە پرۆسەی ئەنفالیشدا بەهەمان شێوە بووە، بەلاّم تەنها جیاوازی ئەوەیە کە لەوەی ئە نفالدا جیاکردنەوەی گەنجکان بۆ گولەبارانکردن بووە و لەمەی شەنگالدا بۆ فرۆشتن و سەبیکردن بووە[٧].

**گۆڕینی ئـایین و بیروڕا:** بە پێی پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانی ٩ی کـانـوونـی دووەمـی ١٩٤٨، جینۆسـایـد بە مانای هەریەک لەم کـردەوانەی خـوارەوە دێـت، لەناوبردنی تەواو یان بەشـێک لە (گـرووپـێکی نەتەوەیی، ئەتـنیـکی، ڕەگەزی یان ئاییني[٨]. واتە هەوڵدان بۆ گۆڕینی ئـایینی کەسـێـک یـان گـرووپـێـک دەچێتـە چـوارچێوەی جینۆسـایدی نێودەوڵەتییەوە، کە لە پرۆسـەی پەلاماری شـەنگالدا داعش هەر کەسـێـکـی ئـیـزدی دەسـتگیرکردبێت، یەکەم پرسـیار داوای گۆڕینی ئـایینەکەیـان و بوون بە موسـڵمانیان لێکردوون، کە ئەم ڕەفتـارەی داعش بەتەواوی دەچێتـە چـوارچـێـوەی جـیـنـۆسـایـدی نێودەوڵەتییەوە.

**کڕین و فرۆشـتنی کچـان:** دوای پـرۆسـەی دەسـتـگـیـرکـردن و جیاکردنەوە، پاشـان پرۆسـەی کڕین و فرۆشتن و دەستدرێژی سەریان دەسـتـی پێکردووە و چۆنیـان ویستووە، فرۆشتوویانن و کڕیویانن، **( نـادیـە موراد) دەڵێت:** وەک کـاڵا مامەڵەیان بە جەسـتەمانەوە دەکرد، بە کرێیان دەدایـن، دەیانفرۆشـتین، تەنانەت هەندێک جار ئەمیرەکان لە نێوان خۆیاندا بە دیاری بۆ یەکیان دەناردین.

ئەم ڕەفتـارانـە دڕندەیی چەکدارانی داعش نیشـانـدەدات، تـا ئەوپەڕی توندوتیژی و بێبەزەیی.

**کەیسی شنگال:**

کەیسێکی نوێیە، ئەم تاوانە هێشتا لە هۆشـی مرۆڤـایەتیـدا مـاوە و ڕووداوەکـانی ڕۆژانە لەگەڵمـانـدا دەژین، پێویسـتە وەک کەیسـەکانی ئەنـفـال، کـوردە بـارزانـیـیەکـان، هەڵەبجە، سـەردەشـت و قەڵادزێ و سـەیدسـادق و ئەوانی تر فەرامۆش نەکرێت و دەبێت زۆر جددیتر و پرۆفیشـنـاڵانەتر کاری بۆ بکرێت، کـارەکـان دەکرێت لە دوو تەوەری گـرنـگـدا چـڕبـکـرێنەوە: ئەوانـیـش هەوڵەکـانـی نـاوخـۆ دەرەوەی کوردسـتانن، هەوڵەکانی ناوخۆدەبنە بنەمایەکی گرنگ بۆ دەرئەنجامەکانی هەوڵە دەرەکییەکان.

گەورەترین هەڵەی ڕابردوو کە نەکرا چ ئەنـفـال، کـۆمەڵکـوژیـی کـوردە بارزانییەکان، هەڵەبجە و سەردەشت بەفەرمی لە نێو ڕای گشتیی جیهانیدا بکرێنە جینۆسـایـد، نـایەکـانگیریی

هەوڵە نێوخۆییەکان و دەرەکییەکان بوون وبەهۆیەوە تاکو ئێستا ئەو تاوانە کۆمەڵکوژییانە وەک پێویست بەجینۆساید نەناسراون و هۆیەکی گرنگیش بوون بۆ دووبارەبوونەوەی کۆمەڵکوژیی کوردە ئێزدییەکان.

## هەوڵە ناوخۆییەکان :

دەوڵەتی ئیسلامی پاش داگیرکردنی شنگال و ناوچەکانی دەوروبەری، وێرانەیەکی گەورەی جێهێشت، هەموو ئەو وێرانکارییە گیانی، دەروونی و ماڵییانە دەبنە بنەمایەکی گرنگ، بۆئەوەی بە شێوەیەکی راست مامەڵە لەگەڵ کەیسەکەدا بکرێت و بشبێتە خزمەتێک بۆ شنگال و کوردە ئێزدییەکان لە پلەی یەکەمدا و خزمەتێکی گرنگیش بێت بە دۆزی کورد لە پلەی دووەمدا، دروستکردن و ئامادەکردنی ئەم تیهاتانە چالەنجێکی گرنگە و بەبێ ئەوان دەرهاتە دەرەکییەکان پێکنایەن و هیچ سەرئەنجامێکی ئەوتۆمان دەستناکەوێت.

## دەکرێت خاڵە گرنگەکان لەمانەدا کورت و چڕبکرێنەوە :

* دامەزراندنی وەزارەتێکی تایبەت یان هەر دامەزراوەیەکی دەوڵەتیی خاوەن کەسانی تەکنۆکرات و شارەزا لە بوارەکەدا بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەکان و دیکۆمێنتکردنیان، ئەم وەزارەتە دەبێت خاوەن بودجەیەکی تایبەتیی خۆی بێت، هەڵبەت لە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا، وەزارەتی شەهیدان و ئەنفالکراوان هەیە، ئەم وەزارەتە بەپێی هەموو پێوەرەکان نەیتوانیوە کەیسە گرنگەکان لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا بە جینۆساید بناسێنێت.. شنگال و کۆمەڵکوژیی کوردە ئێزدییەکانیش لەبەرئەوەی رووداوێکی نوێ و گرنگن، هەربۆیە پێویستیی بە دامەزراوەیەکی تایبەت هەیە، کە راستەوخۆ لەلایەن ئەنجومەنی وەزیران و خودی سەرۆک وەزیران بەڕێوەببرێت.

* کۆکردنەوەی تەواوی بەڵگەنامەکانی کارەساتی شنگال و دەوروبەری لە هاردکۆپی-کاغەز، وێنە، فیلم، دەنگ و ئنتەرسێپتی چەکدارانی دەوڵەتی ئیسلامی و ئامادەکردنیان لە ناوەندێکی ئەرشیفیی تایبەت بە دامەزراوەکەوە و وەرگێڕانیان بۆ زمانەکانی کوردی، ئینگلیزی و فەرەنسی، ئەم دوو زمانەی دوایی گەلێک گرنگن، کە ئەو

دۆکومێنتانەمان پێیان هەبن، چونکە زمانی زۆرینەی دادگا و دامەزراوە قانونی و دادییەکانی جیهانن، دۆکومێنتەکان دەبێت بە شێوەیەکی هاوچەرخ ڕێکبخرێن و ببەسترێنەوە بە ماشینێکی گەڕانی دیجیتاڵییەوە، هەر دۆکومێنتێک پێناس، سەرباس و کورتە پێناسەیەک یان چەند کلیلە وشە و میتا-داتای پێویستیان ببێت بۆ ئاسان دۆزینەوەیان، هەروەها زۆر گرنگە پرۆسەی (ئۆ.سی.ئار لەسەر ئەو دۆکومێنتە سکانکراوانە ئەنجامبدرێن، تاوەکو لە وێنەوە بکرێنە تێکست بۆ ئاسان دۆزینەوەی زانیارییەکان و ئەنجامدانی گەڕانی فوڵ-تێکست تێیاندا).

* دامەزراندنی مۆزەخانەی شنگال، ئەم مۆزەخانەیە تایبەت بێت بە کۆمەڵکوژیی ئێزدییەکان لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامییەوە، مۆزەخانەکە پێویستە ببێتە پیشانگایەکی گرنگی کۆمەڵکوژییەکە و زۆرینەی ئەو کەرەستانەی تێدا پیشانبدرێت، کە نمایشی کۆمەڵکوژییەکە دەکەن، لە دامەزراندنیدا سوود لە مۆزەخانەکانی کۆمەڵکوژیی جووەکان و ئەرمەن وەربگیرێت.

* وەزارەتە نوێیەکە یان دامەزراوەکە کۆمەڵێک ئاماری دروست کۆ و بڵاودەکاتەوە، ئەم ئامارانە تایبەت دەبێت بە ژمارەی دانیشتووانی کوردە ئێزدییەکانی ناوچەکە؛ پێش کارەساتەکە، پاش کارەساتەکە، ژمارەی کوژراوان، ژمارەی برینداران، نەخۆشکەوتووانی دەروونی بەهۆی کارەساتەکەوە، ژمارەی ڕفێندراوان، ڕەگەز، تەمەن، ژمارەی کۆچبەرە ناوخۆییەکان، ژمارەی کۆچبەرە دەرەکییەکان، باری ئابووریی ئەو ناوچانە پێش کارەساتەکە، دوای کارەساتەکە و خانووی ڕووخاو وزۆرئاماری تری پێویست کە بە هەموویان تێهاتگەلێکی گرنگ پێکدێنن، لەمەدا دەبێت ئەزموونی ئەنفال و هەڵەبجە لەبەرچاوبگیرێت و ئامارەکان دووربن لە سۆزەوە و ڕاستودروست بن! ئەگەر نا، ئەوا کەیسەکە ڕاستەڕێی خۆی لەدەستدەدات.

* دامەزراوە تایبەتەکە، جگەلەوەی لە شنگال بنکەیەکی گرنگی دەبێت، لە شارە گەورەکانی باشووری کوردستانیش بنکەی پێویست بۆ ڕێکخستنی کاروباری ئاوارە کوردە ئێزدییەکان دەکاتەوە، کەسانی

پســـــپۆڕ ئەو دۆکـومـێـنـت و کەرەســـتـانەی لە لای ئـاوارەکانە کــۆدەکەنەوە، کە پەیــوەنــدیــی راســــتەوخۆ و کــاریگەریــان بە کارەســاتەکەوە هەیە، بەو شــێوەیە دەتـوانـرێــت تـۆرێـکـی زانـیـاریـی کــۆکــردنەوە لە هەمـــوو لایەک کۆبکرێتەوە و لە ناوەندی ســەرەکیدا بپارێزرێت.

* ئەم دامەزراوە دەبـێـت، کـوردە ئێزدییەکان لە هاولاتیی پلە "دوو"ەوە بکـاتەوە هـاولاتییەکی ئـاســـــایی، ئـاشـــــکرایە کە زۆرینەی کوردە ئـێـزیـدیـیەکـان هەردەم کـاریـان خـزمەتـکـردن بـووە لە هـۆتـێـل، ریســـتورانت، مەیخانەکان و کاری کرێکاری و جوتیارییان کردووە لە شــارەکانی تری کوردســتاندا، ئەمە دەبێت بگۆردرێت و ببنەوە هاولاتییە ئاســـاییەکە و باشـــتر وێناکردنی کەســایەتیی کوردی ئێزدی لەلایان، ئەمە زۆر گرنگە، تـاکوچیدی کوردە ئێزدییەکان ولات جێنەهێلن و لەلایەن هاوزمانە کوردە موسـلمانەکانەوە بە کوردستان ئاشتبکرێنەوە.

هـاوزمـانە کوردە موســـلـمـانەکان لەوانەیە هەبــن ئەم خـــاڵەیـــان بەلاوە"ســەیر"یان گرنگ نەبێت! بەلام ئەمە راســتینەی بارودۆخ و ئاســتی کۆمەلایەتیی کوردە ئێزدییەکـانە لەلایەن کـوردە نـائـێـزدییەکـانی هاوزمانیانەوە!

* کـوردە ئـێـزدییەکـان جـگە لە ناوچەکانی خۆیان بەتایبەتی شـێخان و شـــنگال لە هیچ شـــوێنێکی تری بـاشـــووری کوردســـتـانـدا هیچ پەرستگایەکی تایبەت بە خۆیان نییە! شـــارێکی وەک ســـلێمانی هەزاران کـوردی ئـێـزدیـی تـێـدایە، تــاکە ژوورێـکـیش تــایبەت نەکراوە تـا سروتەکانی خۆیانی تێدا ئەنجامبدەن، ئەم دامەزراوە دەبێت کوردی ئێزدی و ئــاییـنی کوردی ئێزدی بکـاتە دیــاردەیەکــی بەرچــاوی هەمـــوو کوردســتان و لە شــارە گەورەکانی وەک هەولێر، ســـلێمـانی، دهۆک، کەرکوک و ئەوانی تر پەرســـتگای تایبەت بە کوردە ئێزدییەکان بکاتەوە.

ئەمە کارێکی زۆرگرنگە و هەستێکی وەهـا دەداتە کوردە ئێزدییەکـان، کە تەنها شـــنگال و شـــێخان زێدی ئەو نین، بەڵکو ســـلێمانی و دهۆکیش بۆ ئەوان هەمان نیشتمانن، کە دەتوانێت مەلەک تاوسـی تێدا دابنرێت و ئاگرە پیرۆزەکانیانی تێدا بکەنەوە، پێویستە بەرێککەوتن لەگەڵ لالش و مـیری

کوردی ئێزدییــان بۆ هەریەک لەو پەرســـتگایانە پیر، قەوال و موریدی کوردی ئێزدی دابنرێن.

لە ڕاســتیدا ئەمە دەبووایە ســالانێک لەمەوبەر لەلایەن وەزارەتـــی ئەوقـافەوە بیری لێبکرایەتەوە و ئەو پەرســـتگایانە دابمەزرابانایە، چۆن دەبێت لە شـــارێکی وەک سـلێمانی ناوەند و پەرسـتاگای زەردەشـتییان هەبێـت، کە دینـێکـی تـازادەیەک لە ناوچووی کوردبووە و کەچی ئەو هەموو کوردە ئێزدییە لەو شـــارەدا خاوەنی پەرســـتگایەکی تایبەت بە خۆیان نەبن؟!

کردنەوەی ئەو پەرســـتگـایـانە لە قوولایی باشـــووری کوردســـتاندا کوردە ئێزدییەکـان لەو پەرگیرییە دێنێتە دەرەوە، کە دانیشـــتوانێکی تەریکی فەرامۆشـکراوی باشـووری ڕۆژئاوای باشووری کوردستان بن! ئەوکات زۆرتر وابەســـتەدەبن بەو شـــار و ناوچانەی ترەوە کە تێیاندا نیشـــتەجێن، تەنـانەت دەبێـت بیر لەوەش بکرێتەوە، کە لە ولاتێکی وەک ئەڵمانیا کە ژمارەیەکی زۆری کوردی ئێزدیی تێدایە، پەرستگایەکی تـایبەت بکرێتەوە، لەمەوە دەکرێـت ســـوود لە شـــارەزاییی عەرەب و هیندۆســـەکان وەربگیرێت، کە چۆن لە زۆر شوێنی ئەوروپا و کیشوەرانی تر، شـوێنی پەرسـتش یان تێمپڵێکی هندۆســـەکانیان دروســـتکردووە و پەیڕەوکـارانی ئەو ئـایینـانە بۆ پیـادەکردنی ســـرووتە ئـایینی و چـالاکـیـیە کـۆمەڵایەتـی و "خێرخوازی"یەکانیان بەکاریاندەهێنن.

لە هەندێک ناوچەی کوردسـتان گەر کوردێکی ئێزیدی بۆ نموونە گـاوان بێت، خەڵکی شـیری مانگاکان ناکڕن و بە "حەرام"ی دەزانـــن! ئەمە وێنایەکی زۆر ناشـرینە، کە دراوە بە کوردە ئێزیدییەکان و دەبێت کاری گرنگ لەســـەر باشـــترکردنی باری کۆمەڵایەتییان لە ناو کوردســـتا ندا بکرێت.

پێویسـتە موجامەلەی هەرزان بەهای کوردە ئێزدییەکان لەلایەن هاوزمانە کوردە نائێزیدییەکان کۆتایی پێبێت، بەوەی کە کـوردی ڕەســـەنـن و ئاییەنەکەشـــیان ئاییی ڕەســـەنی کوردییە! بەڵام هیچ هەڵسـوکەوتێکی کوردە نائێزیدییەکان بەو شـــێوەیە نییە و بەگشـــتی بە شـــێوەیەکی ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵ ناکرێت!

* پاش ڕزگارکردنی شنگال هەندێک گـۆڕی بەکـۆمەڵ دۆزرانەوە، ئەم گۆڕانە یەکـێکن لە گـرنگـترین کەرەستەکانی کۆمەڵکوژیی شنگال، دەبێت کەسـانی پسـپۆڕ لێکۆڵینەوە لەم گۆڕانەدا بکەن، هەنـدێـک لە بەجێماوە نەناسراوەکانی ئەم گۆڕانە لە سـاردکەرەوەدا هەڵبگیرێن و وەک بەڵگەی تاوانەکان بپارێزرێن.

* زۆرگرنگە کەرەسـتەی تاوانەکان هەڵبـگـیرێـن، لەوانە فـیشـەک و قەوانەفیشـەک، ئامارێکی دروسـتی ئەو گۆڕە بەکۆمەڵانە بکرێن؛ چەندن، چەند کەسـی تێدا کۆمەڵکوژکراوە، ناویان، ڕەگەزیان، تەمەنیان و زۆر داتای تریان لەسـەر کۆبکرێنەوە، زۆرگرنگە هەنـدێک لەوکەرەسـتە بەجـێـمـاوانەی نـاو ئەو گـۆڕە بەکۆمەڵانە لە مۆزەخانە تایبەتییەکە نیشـانبدرێن و بە زمانە جیاوازەکان لەسەریان بنووسرێن.

* تاوانباران و بەشدارانی کارەساتی شنگال دەستنیشان بکرێن، بەپێی ناو و ڕەگەزنـامەیـان پۆلێنبکرێن، ئەو عەرەبە هاوردانەی ناوچەی شـنگال و زوممـارکە یـارمەتیی دەوڵەتیی ئیسـلامییـان دا و لەو تـاوانەدا بەشدارییانکرد، دەستنیشانبکرێن.

* ئەو دیلانەی لە دەسـتی دەوڵەتی ئیسـلامی ڕزگـارکراون، بـارێکی دەروونیی خراپیـان هەیە، ئەمـانە بەبێ هـیچ چـارەسـەرێـک یـان تراپییەکی دەروونی خراونەتە کامپی پەنـاهـاندەکـان و تێکەڵی کۆمەڵگا کراونەتەوە!

پێویسـتە کلینیکی دەروونی بۆ ئەم دیـلە ڕزگـارکـراوانە بـکـرێـتەوە و لەباری دەروونییان بکۆڵدرێتەوە و مامەڵەی تایبەتیان لەگەڵدا بکرێت و هەوڵی دوبـارە "ئـاسـوودە"ییـان بـدرێتەوە، لەمەدا جوولەکەکان زۆر سـەرکەوتووانە تراپیی دەروونییان بۆ زۆر لە قوربـانییـان ئەنجـامـدا و یـارمەتیـدەرێکی بـاش بوو بۆیـان، تاوەکو ئاسـوودەبن و بەئاسـایی تێکەڵی کۆمەڵگەی جووببنەوە، زۆر باش دەبێت شـارەزایی و ئەزموونی جـوولەکەکـان لەم سـێـکـتەرەدا لەبەرچاوبگیرێت.

* گـرنـگە زنـجـیـرەیەک فـیـلـمـی سـینەمـایی و فیلمی بەڵگەنـامەیی لەسـەرکۆمەڵکوژیی ئێزدییەکان بە زمـانەکـانی کـوردی، ئـینـگـلـیزی، فەرەنسـی و هـی تر بکرێـت و بەردەوام لە بـنکە تـایبەتەکـان و مۆزەخانەی شنگال پیشانبدرێن، ئەو

فیلمانە دەبێت بە شێوەیەکی وا پرۆفێشنال دروستبکرێن، کە تەلەڤزیۆنە جیهانییەکان پیشانی بدەن و بەهۆیەوە ڕای گشتیی جیهانی بە کۆمەڵکوژییەکە ئاشنابکرێت، دیسان لەمەشدا زۆرگرنگە کە شارەزایی و ئەزموونی جوولەکەکان لەبەرچاوبگیرێت، کە هەزاران فیلمی سینەمایی و فیلمی بەڵگەنامەییان لەسەر هۆلۆکۆست دروستکردووە و ڕۆڵی گرنگی لە پێشخستنی دۆزەکەیان هەبووە، بۆ نموونە تەنها لەسەر "ئانا فرانک" دەیان و زۆرتر فیلم و فیلمی بەڵگەنامەیی هەیە، بەدڵنیاییەوە هەر کچە کوردێکی ئێزدی ئانا فرانکێکی سەدەیەکی دواترە و ئەویش مافی ئەوەی هەیە جیهان بیناسێت و بزانێت دەوڵەتی ئیسلامی چی بەسەرهێناوە.

* وەک کاروئەرکێکی ناوخۆیی گرنگ، پێویستە پەرلەمانی کوردستان بەفەرمی دان بە جینۆسایدی هۆلۆکۆست، قەتڵوعامی ئەرمەنییەکان، جینۆسایدی گەلانی یۆگۆسلاڤیای پێشوو، ڕواندا، دارفۆر، جینۆسایدی ڕژێمی (خمێری سوور) بۆ کەمبۆدییەکان وزۆری تر بنێت، ئەمە گرنگییەکەی لەوەدایە کە ئەو وڵاتانە وەک مامەڵەی بەرانبەر زووتردان بە جینۆسایدی کوردە ئێزدییەکاندا دەنێن.

* ژیانی کۆمەڵایەتی و ئایینیی کوردە ئێزدییەکان و کۆمەڵکوژییەکانی شنگال و دەوروبەری بکرێنە بەرنامەی خوێندن و لە تەواوی خوێندنگاکانی کوردستاندا بخوێنرێن.

* هەر زانکۆیەک کە کۆلێژی زانستە مرۆڤییەکانی تێدابێت، ساڵانە لە تێزێکی ماستەر یان دکتۆرا لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و ئایینی وکۆمەڵکوژیی کوردە ئێزدییەکان یان هەر ماددەیەکی تری پەیوەندیدار بە کوردە ئێزدییەکانەوە ئامادەبکات.

* زاراوەی "ئێزدی" بەتەنها لە هیچ نووسراوێکی فەرمیدا بەکارنەهێنرێت، پێویستە نووسراوە حکومییەکان، لێکۆڵینەوەکان و میدیاکان کاتێک باسی کوردی ئێزدی دەکەن، هەمیشە دەستەواژەی" کوردە ئێزدییەکان"، "کوردی ئێزدی" یان "ئایینی کوردی ئێزدی" بەکاربهێنن، ئەمە کوردە ئێزدییەکان زۆرتر ئاسوودەدەکات،

کە بەشـــێکی دانەبڕاوی کۆمەڵگەی کوردی و خاکی کوردستانن.

**هەوڵە دەرەکییەکان:**

پـــاش ئـــامـــادەکـــردنـــی بەڵگەودیکۆمێنتەکان، دەکرێت دەست بە پـیـادەکـردنـی دەرهـاتەکـانی پرۆســـەکە بکرێت، ئەم دوو لایەنە دوو پرۆســـەی پێکـداهەڵپژاون و تێکەڵکراون، هیچیـان بەبێ ئەوی تریان ئەنجامێکی کارا بەدەســـتەوە نـادەن، دەشـــێـت هەنـدێـک لە دەرهـاتەکـان هـاوتەریـب لەگەڵ تێهاتەکاندا ئامادەبکرێن.

**دەکرێت دەرهاتە گرنگەکان لەماندا کورت و چڕبکرێنەوە :**

* لایەنە نـاوخـۆیـیەکـان بەو دامەزراوەیشی کە بۆ کەیسی شنگال دێـتەکـایەوە، نەبـنە ڕووکـاری دەرهاتەکان .

پێشتر بۆمان دەرکەوت، ئەو کەس و ڕێکخراو و لایەنانەی لە کەیسەکانی ئەنفـال، هەڵەبجە و ئەوانی تردا بە خۆبەخش یان بەفەرمی کاریاندەکرد، لەبەرئەوەی لە بابەتەکەدا پرۆفیشناڵ نەبـوون، نەیـانـتـوانـی هـیـچ ســەرئەنجامێکی ئەوتۆ بەدەســتەوە بـدەن، لەجیـاتی ئەمە دامەزراوەکە چەند بریکارێکی یاسایی نێودەوڵەتی کە لە ڕێکخراوێک یان نووسینگەیەکی قانونیی نێودەوڵەتیدا خۆیان دەنوێنن، بۆ ئەم مەبەسـتە رابسـپێردرێت، ئەم ڕێکخراو-نووســـینگە یـاســـاییە نێودەوڵەتییە، کە خـاوەن ئیمیجێکی بـاشـــە لە نـاوەنـدە یـاســـاییە نـێـودەوڵەتـیـیەکـانـدا بەرامـبەر پـاداشـــتێکی دیـاریکراو لەلایەن دامەزراوە حکومییەکەوە ساڵانە کار لە کەیســـەکەدا دەکـات، کـاری دامەزراوە نـاوخـۆیـیەکە تەنـهـا پێشـــکەشـــکردنی تێهـاتەکـان و دابینکردنی بودجە و هەمـاهەنگی و چاودێریکردنی کارەکانە[٩].

* کردنەوەی بنکەیەک بۆ ناساندن و جێبەجێکردنی کاروباری کارەسـاتی شــنگال و ئاوارە کوردە ئێزدییەکان لە ئەورووپـا، ئەم بنکەیە ســـەر بە هەمان دامەزراوە حکومییەکە دەبێت و کاریشی پێشکەشکردنی بەڵگەکان و دابـیـنـکـردنـی بـودجە و چـاودێریکردنی کـاروبـارەکـانی نووســینگە یاسـاییە نێودەوڵەتییەکە دەبێـت، شـــارێکی وەک لاهـای لە هـۆڵەنـدا بـووەتە نـاوەنـدێـکـی نێودەوڵەتی بۆ دادگاکان و بە شاری دادپەروەریـش نـاوی دەرکـردووە،

گرنگە ئەم بنکەیە لە شارێکی وەهادا بکرێتەوە و ببێتە پردێک لەنێوان حکومەتی هەرێم و نووسینگە نێودەوڵەتییەکە بۆ رێکخستن و هەماهەنگیی تەواوی کارەکان، هەمان بنکە دەتوانێت وەک باڵوێزخانەیەک بۆ کارەساتەکانی شنگال، ئەنفال، کوردە بارزانییەکان، هەڵەبجە وکۆکوژییەکانی تریش بەکاربهێنرێت.

* هەمووئەوکەرەستانەی کۆکراونەتەوە و بەشێکی گرنگی بەڵگەکانن، بە شێوەیەکی هاوچەرخ بڵاوبکرێنەوە و لە بنکە وپەرستگاکانی کوردە ئێزدییەکاندا بە زمانەکانی کوردی، ئینگلیزی و فەرەنسی پیشانبدرێن و بڵاوبکرێنەوە.

* بەستنی کۆنگرەیەکی ساڵانە لە دەرەوەی وڵات کە شێوازێکی نێودەوڵەتی ببێت لەسەر تاوانە شنگال و تاووتوێکردنی بژاردەکانی بەجینۆسایدناساندنی، هەروەها لەم کۆنگرەیەدا کارە تەواوکراوەکانی نووسینگە نێودەوڵەتییەکە بخرێتە بەر باسوخواس و بەڵگەودیکۆمێنت و دەرئەنجامەکانی تەواوی پرۆسەکە تانوپۆبکرێت، لە کۆنگرەکەدا هەرجارە و چەند پانێڵێکی گرنگ بخرێتە بەر باس و دیبەیت، کە چارەسەری لایەنە کۆمەڵایەتی، دەروونی، گوزەرانی و ...هتد بەجێماوانی کارەساتەکە بکات، لەم کۆنگرەیەدا شنگال وکۆمەڵکوژیی کوردە ئێزدییەکان شاباسەکان بن و هەرجارەو لەسەر ئەنفال، کۆمەڵکوژیی کوردە بارزانییەکان، کیمیابارانی هەڵەبجە و ئەوانی تریش لێکۆڵینەوە و پانێل بگیرێت، ئەگەر بەشێوەیەکی رێکوپێک ئەنجامبدرێن، بەدڵنیاییەوە رای گشتیی جیهانی زۆرتر بەلای کەیسی شنگالدا رادەکێشرێت.

هەڵبەت دامەزراندنی دادگایەکی نێودەوڵەتیی تایبەت بە کۆمەڵکوژیی ئێزدییەکان کارێکی گران یان لەوانەیە ئەستەم بێت، لەبەر کۆمەڵێک هۆی سیاسی، تەکنیکی و ئابووری :

* ئەو ناوچانەی کە کوردی ئێزدینشین بوون و کۆمەڵکوژییەکەی تێداکراوە، بەفەرمی دەکەونە دەرەوەی سنووری حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە، حکومەتی هەرێمیش لە رووی یاساییەوە بەشێکی عێراقە، داواکردن و دامەزراندنی دادگایەکی لەو جۆرە لە دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمدا نییە،

بەڵکو لە ڕووی یاسـاییەوە مافێکی عـێـڕاقـیـیـە، دیـارە عـێـڕاقـیـش داواکارییەکی لەو جۆرە لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ناکات، ئەگەر بیشـیکات، ئەوا بەدڵنـیـاییـەوە نە کـۆمەڵگـەی نـێـودەوڵەتـی و نە نەتەوە یەکگرتووەکانیش داواکەی بەجددی وەرنـاگرن، چونکە پێگەی عێراق لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا وڵاتێکی زۆرگەنـدەڵ، ئـاڵـۆز و خـراپە، پێشـتریش دادگای باڵای تاوانەکان هەوڵی بچووککردنەوەی کەیسەکانی ئەنـفـال، کـۆمەڵـکـوژیـی کـوردە بارزانییەکان و هەڵەبجەی دا، بەوەی سـەرەکیترین تاوانبار کە (سـەددام حسـێن) بوو لەسـەر کەیسـێکی بچووکی وەک دوجەیل سزادرا! نەک لەسەر کەیسە گەورەکانی کورد.

* پـاش دادگـاییەکـانی نورنبێرگ و تۆکیۆ، دادگـا نێودەوڵەتییەکـانی تربـانـدۆرێکی ئەوتۆیـان لەسـەر چـارەسـەرکردنی کەیسـەکان و گەڕانـدنەوەی مـافی قوربـانییەکـان نەبووە، هەربۆیە گومـانێکی زۆر بەرانبەر ئەودادگـا نێودەوڵەتییـانە هەیە، زۆریـنەی هـۆکـارەکـانـی دامەزراندنی ئەو دادگایانە سـیاسـی بوون نەک چارەسـەرکردنی تاوانی جینۆساید.

دادگـای نـێـودەوڵەتـی نـوێـنەری دادپەروەریـی نـێـودەوڵەتـیـیە، دادپەروەریش تەنهـا دادگـاییکردنی تاوانباران نییە، بەڵکو ئاسـوودەکردن و خۆشـگـوزەرانکردنی قوربانییانی دەستی ئەو تاوانبارانەیە.

* دامەزرانـدنـی دادگـایەکـی نێودەوڵەتی بودجەیەکی زەبەلاحی دەوێت و ئاسـان نییە، کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ئامادەبێت بۆک ردنەوەی دادگایەکی نێودەوڵەتی بۆ کارەساتی شـنگـال، بۆ نموونە دادگـایەکی نـێـودەوڵەتـی وەک ئەوەی (یۆگۆسـلاڤیا)ی پێشـوو سـاڵانە پێویسـتیی بە ٢٠٠ ملیۆن دۆلارە بۆ ڕاپەڕانـدنـی کـارەکـانـی ،ئەگەر دادگایەک بۆ کۆمەڵکوژیی شـنگال بێتە کایەوە، بەدڵنیاییەوە ١٠ سـاڵ زۆرتـری دەوێـت بۆ تەواوکـردنـی کـارەکـانـی، چـونـکە دادگـا نێودەوڵەتییەکـان بە خـاووخلیچکی ناوبانگیان دەرکردووە، واتە نزیکەی یەک ملیـار دۆلار زۆرتر تێچووی ئەو چەند ساڵەی دەبێت، هەڵبەت لەم قەیرانەدا نە عێراق و نە هەرێمی

کوردســـــتانیش دەتوانن ئەو تێچووە زۆرە لەئەستۆبگرن.

* لە دادگــادا دەبـێـت تــاوانـبــار وتاوانلێکراو هەبێت، ئەمانە دووان لە پــایە گـرنـگەکــانـی دادگــاییـن. لە جینۆســـــایدی ئێزدییەکاندا تاوانبار دەوڵەتی ئیســـلامییە و تاوانبارانی نە دیارن، نە بەردەستن. لەبەرئەوە ئەو دادگایە لە ڕووی تەکنیکی یاساییەوە کارێکی ئاسان نابێت[١٠].

## ئـایـا شـــــە نـگـال دەبێتە دوایەمین جینۆسایدی گەلی کورد؟

وادەزانرا، کە چیـدی ئەنفـالی کورد دو بارە نابێتەوە! پێش ڕووداوەکانی شــنگال لە ئۆگەســتی ٢٠١٤، ســـاڵی ١٩٨٨ حکومەتـی بەعـس بەتەواوی هـێـزوجـبـەخــانـەی خـۆیـەوە یـەک لە گەورەترین تـاوانەکـانی خۆیی دژی کورد ئەنجــامـدا، ئەم هێرشـــــە بە هەموو پێناس و واتایەکی، هێرشـــــی جینۆســـاید و کۆکوژکردنی کوردبوو لە باشـــووری کوردســـتاندا و ناوی نرا (ئەنفال).

ســـــاڵی ١٩٨٣ هەمان ڕژێمی بەعس قەتڵوعامی کوردە بارزانییەکانی کرد، زۆریـــنـەی ئەوانە لە ئــۆردوگــای قوشـــــتەپەوە بەرەو ماشـــــێنەکانی مەرگ بردران.

پــێـشـــــــتـریــش لە ١٩ی ژونــی ١٩٦٣حەرەس قەومییەکانی عێراق لە ســــلێمانی جینۆســـــایدی زۆرێک لە گەنجان و پیاوانی کوردی ئەنجامدا، دیســــانیش هەر هەمان ئەم حەرەس قەومییە عەرەبییە لە مانگی ئۆگەستی ١٩٦٩، نزیکەی ٦٧ ژن و منــداڵی خەڵکی هەردوو گوندەکانی "دەکا و خورت"یــان پــاش ســـــووتــانـدنی گوندەکان لە ئەشــکەوتێکدا بە گازی کیمیایی قاندا و کۆمەڵکوژیانکردن.

چەند ساڵێک پێش کارەساتی شنگال، کۆمەڵکوژیی کوردە زەرگۆشــییەکان ڕوویدا.

پێشـــتریش هەر لە ســـــاڵی ١٩٨٨ کارەســـــاتی کیمیابارانی هەڵەبجە لە ١٦ی مارسدا ڕوویدا، لەم کارەساتەدا هەزاران کەس خنکـان و ئـاوارەی نـاوچەکانی بـاشــــوور و بەتـایبەتی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوون.

گەر زۆرتر بە مێژوودا شــۆڕبینەوە، کــارەســــــاتی گەورەی دێرســــیم دەخوێنینەوە، کە چۆن تورکەکــان هەزاران کوردیــان کۆمەڵکوژکرد و دەیان هەزارکوردیشـــــیان لە زێدی

خۆیان گواستەوە بۆ ناوچەکانی تری تورکیا.

دیارە لە مێژووی کۆنتردا ڕووداوی کۆمەڵکوژیی تری زۆر ڕوویداوە و لێرەدا ریزکردنیان بەپێویست نازانرێت.

پرۆسەی کۆمەڵکوژی بووەتە خەسڵەتێکی بەرچاوی مێژووی کۆن و نوێی گەلی کورد، هەر جارێک ڕوویبدابێت، وا زانراوە، کە چیدی دوبارە نابێتەوە، ئەمە جگە لە خۆ شباوەڕی و ناواقعی کورد خۆی، هۆیەکەی تریشی دەگەڕێتەوە بۆ لەرزۆکیی ئاساییشی نەتەوەیی و باش پاسەنەکردنی سنوورەکانی، هەروەها شوێنی ئەم ناوچەیە بەتایبەتی جیۆپۆلیتیکی کوردستانیش هۆکارێکی ترە، کە کەوتۆتە دڵی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستەوە، ئەم ناوچەیە باشووری میزۆپۆتامیا هەر لە دێرزەمانەوە مۆڵگەی کۆمەڵکوژی و کوشت و کوشتار بووە، زۆرینەی کۆمەڵکوژیی سۆمەر، بابل، ئەکەد، ئاشوور، ماد و پاشان شەڕی خەلیفەکانی ئیسلام لەم ناوچەیەدا بوون و پێدەچێ کاریگەریی جینەتیکی لەسەر مێشک و نەریتی دانیشتوانی ئەم ناوچەیەدا دانابێت بۆ حەزکردنیان بە کوشتن و کۆمەڵکوژکردنی کەسانی تر دانراوە بە مەڵبەندی جینۆساید لە مێژوودا.[١١]

پاش راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی باشووری کوردستان، ڕایەکی وا هاتە ناوانەوە، کە ئیتر کۆتایی بە هەنگاوی کارەساتاویی ئەنفال و کیمیاباران هات، بەڵام ئەوەی لە ئۆگەستی ٢٠١٤ لە شنگال ڕوویدا، زۆر لەوان کاریگەرتر و کارەساتاویتر بوو لەبەر ئەم هۆیانە:

* لە ماوەیەکی پێوانەیی زۆر کەمدا، ڕووبەرێکی زۆری خاکی کوردستان کە زۆرتر لە ١٠ ساڵ ئازاد و لەلایەن کورد خۆیەوە پارێزگاریی لێدەکرا، داگیرو خاپوورکرا.

*داگیرکردنی ئەوناوچانە بووەهۆی کێشەمەکێشی ناوخۆیی و خەتابارکردنی یەکتری، ئەمەش بووە هۆی خراپتربوونی باری ناوخۆیی کوردستان و دواکەوتنی ڕزگارکردنەوەی دەستبەجێی ناوچەکان، کە زۆرتر لە ساڵێکی خایاند.

*دانیشتووانی شنگال، زوممار، شارەدێ و گوندەکانی دەوروبەری

کۆمەڵکوژکران، هەزاران ئافرەتی کوردی ئێزدی کرانە سەبییە ودەستدرێژییان کرایە سەر و زۆرینەشیان لە بازارەکانی رەققە و موسڵ وەک کۆیلە فرۆشرانە پیاوانی دەوڵەتی ئیسلامی.

* ناڕاستیی رای سیاسی و رۆشنبیرانی کورد خۆی، دەربارەی ئەوەی کە چیدی ئەنفال و کۆمەڵکوژیی کورد دوبارە نابنەوە، بەلا م لە کارەساتەکانی پێشووتر خراپتر روویدا.

* بێئاگایی دەزگای هەواڵگریی کورد لە پێشبینیی هێرشەکانی دەوڵەتی ئیسلامی.

* ناڕاستیی رای سیاسی و رای گشتیی کوردستان بەوەی کە باشووری کوردستان گرنگیی تایبەتی لە هاوکێشە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکاندا هەیە و پارێزراو دەبێت لە هەر دەستدرێژییەکی دەرەکی.

* رووداوەکانی شنگال جگە لەوەی پەیوەندیی راستەوخۆی بە باشووری کوردستانەوە هەبوو، بەڵام بووە هۆی تامپۆنێکی سیاسیی نێوان سێ پارچەی کوردستان؛ باشوور، باکوور و رۆژئاوا کە هەریەکەیان خۆیان بە خاوەنی راستەقینەی دۆزی شنگال و رزگارکردنی دەزانی.

دەکرێت زۆر هۆی تریش هەبن، بەڵام پرسیارە گرنگەکە ئەوەیە:

**ئایا شنگال دەبێتە دوایەمین ئەنفال؟**

رووداوەکانی ئەم دواییەی باکووری کوردستان وکۆمەڵکوژیی جزیرە و سووری ئامەد، کە هەزاران مرۆڤی کوردی تێدا تاک و کۆمەڵکوژکرا لەلایەن تورکەکانەوە یەکەمین وەڵامی ئەو پرسیارەن (ئایا شە نگال دەبێتە دوایەمین جینۆسایدی گەلی کورد؟)وەڵامی تریش دێن، ئەگەر گرنگیی تەواو بە رووداوێکی بۆ نموونە وەک شنگال نەدەین، کە زۆر نوێیە و بەدەردی ئەنفال کۆمەڵکوژیی کوردە بارزانییەکان و کیمیابارانی هەڵەبجە نەبرێت.

**ئاخۆ دەکرێ "مەڵبەندی جینوساید" بکەین بە "مەڵبەندی رزگار لە جینۆساید؟**

بە بڕوای من جینۆساید مەڵبەندی جینۆساید تا زەمانێک کە ناسیونالیسم و گرووپە توندئاژۆ تەکفیری و دینییەکان لە ئارادابێ و

دەسـەڵاتی سـیاسی و ئابووری بە کـوردی ( نەتەوە و ڕەگەز و قەومییەت و دین) دابەشـکرابێ بەردەوام دەمێنێ، خەباتی سـەرەکی دەبێ بۆ تێکدانی ئەم بارودوخەبێ، کە جینوسـاید پێکدەهێنێ، بەڵام خەبات بۆ تێکدانی ئەو بارودۆخە ئەوە ناگەیەنێ، کە لە چوارچێوەی باری باودا ناتوانین هیچ هەنگاوێک هەڵبگرین، خەبات لە دژی جینۆساید پێویسـتی بە زانیاری و وشـیاری سـەبارەت بەم تاوانە هەیە، ئیستا زانیارییەکی زۆر سەبارەت بەو سێ تاوانانە لەبەردەسـت دایە، کە پێویستە فێری بین و لە پەرەپێدانیدا بەشـداری بکەین، ئەوەندەی کوردستان ئامانجی تیری جینوساید بووە، دەبا تائیستا زانیارییەکی قووڵ و بەرین سـەبارەت بە ئەو دیاردەیە پێکهاتبا، بەڵام زانیاری و ئاگایی سـەبارەت بە ئەو تاوانانە لە تەجروبەیەکی دواکووتووە، چەمکی جینۆسـاید دوای دامەزرانی نەتەوە یەکگرتووەکان و هەوڵدان بۆ پەسـندکردنی کونوانسـیونی جینۆسـاید (١٩٤٥-١٩٤٧) کەوتە سـەر زاران، پێش ئەوەی نەتەوە یەکگرتوەکان ئەو بەڵگەنامەیە پەسندبکات، ئەو کات پێشنووسەکەی ڕاوێژی پێدەکرا.

بەدرخانییەکان لە یاداشـتێکدا بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان بەشـێک لە پێشـنووسـێکی ئەو بەڵگەیان لێگیراوەتەوە و باسـی جینۆسـایدی گەلی کوردیان کردووە، بە لام ئەو هەلویستەی کە وشیاری و چالاکی بەدوادا نەهات، لە سـاڵی ١٩٦٣ کە کۆماری سوسیالیستی مەغۆلستان و یەکێتیی سـۆڤیەت باسـی جینوسـایدی گەلی کوردیان لە نەتەوە یەکگرتووەکان هێنا گۆڕێ، دیسـان وشـەی جینۆسـاید کەوتە سـەر زاران، بەڵام باسی جینوساید نەبوو بە بەشـێک لە کولتووری سـیاسـیی کورد و وڵاتانی ناوچە، لەگەڵ ئەوەشدا، نووری دەرسیم لە ١٩٥٢ دا، مێژووی کوشـتاری دەرسیمی نووسیوە و بە تورکی لە شـام بڵاوی کردەوە و باسـی جینۆسـایدی کورد لە تورکیا بە شـێوەیەکی مـێژوویی و لێکۆڵینەوەیەکی هەوڵ جار لە خەباتی (ئیسـماعیل بێشـکچی)دا لە کتێبی (تونجەلی قانون)و (١٩٣٥) و درسـیم ژینوسـیدی، ئیسـتانبوول (١٩٩٠)، لە کوردسـتانی عیراق

دەستپێدەکا، لەگەڵ ئەوەشدا لە ١٩٩١ بەو لاوە ئازادیی لێکۆڵینەوە هەبووە، هێشتا بەرهەمی بەپێز و پێویست بۆ کاری چالاکی و زانیاریی لەبەردەستدا نییە و هێشتا لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە سنوورەکانی هەوەڵ لێکۆڵینەوەی ئەنفالی نەبەزاندووە، مەبەستمەکە بلێم کوردایەتی توانای خەبات بۆ بنەبڕکردنی جینۆسایدی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا نوێنەرایەتی کورد لە پرۆسەی دانانی دەستووری عێراقدا هەولێدا دەوڵەتی ناوەندی دەسەلاتی جینۆسایدو تاوانی شەڕی نەبێت، لەوەشدا زۆر سەرنەکەوت و بە بەرژەوەندیی ئەمریکا لەگەڵ ناسیونالیستە شیعەکان سازشی کرد، دیارە قانوون هەر چەندیش بەڕاشکاوی و بە تێروتەسەلی ڕێ لەو جینایەتە بگرێ، ناتوانێ بنەبڕیان بکا. دەوڵەت ئەگەر ویستی جینۆساید بکا لە دەستوور و قانوونی ناوخۆیی و نێونەتەوەیی ناپرینگێتەوە و پێشێلیاندەکا، سەرباری ئەوەی قانوون مەیدانێکی خەبات لە دژی ئەو تاوانانەیە.

ئەگەر جینۆساید تاوانێکی نێونەتەوەییە، بەربەرەکانیکردنیشی دەبێ نێونەتەوەیی بێ، لە مەڵبەندی جینۆسایددا سێ گەل تەفروتوتونا کراون (ئەرمەنی و ئاشوری و کورد) جینۆسایدی ئەرمەنی، جینۆسایدی کورد و جینۆسایدی ئاشوورییە، کوردێک بیەوێ بە ڕاستی خەباتکەری ئەو تاوانانە خە بات بکا، پێویستە دان بنێ بە بە شداریکردنی بەشێک لەڕابە رایە تی کورد لەجینوسایدی ئەرمەنی و ئاشوری داو ئە و ڕابەرایەتیە وەک دەستە ودایەرەی جینوساید چاولێبکاو مەحکوومی بکات، بەلام سیاسەت و کردەوەی نێونەتەوەیی تەنیا بە هاوکاریی ئەو سێ هاوکاری و هاوپشتیە پێکنایەت.

کوردێک یان ئەرمەنییەک کە دژایەتی جینۆسایدی گەلی فەلەستین و گەلانی تر نەکا، ناتوانێ لە خەباتی خۆیدا سەربکەوێ، تە نیا بە شۆڕشی گەلانی دنیا لە دژی ئە و جینایەتانە دەکرێ دە سەلاتداران چاوترسێن بکرێن و سیستەمی جیهانی جینوساید پاشەکشێ پێبکرێ.

لەو قسانەدا وا دەردەکەوێ، کە خە بات بۆ بنەبڕکردنی جینۆساید خە باتێکی ئالۆزە و زۆرلایەنی هە یە

(ئـاینی، ســـیاســـی، ئـایـدۆلۆژی، کولتووری، یاســـایی، ...) بەڵام گەلی کورد بە شێوەیەکی ورد و بەپلان و دروســـــت هەنگـاوەکـانی بۆ ئەم مەبەســــتە نەنـاوە و دەبـووایــە لێبڕاوانەتر لەم پرســـەدا کارسـازبێت و کـاربکـات، ئەمە ئەگەرچی وەک پێویســـت نەبووە، بەڵام کەمێک بۆ ئەو ڕزگـاربوونەوە و بەجێمـاوانە یارمەتیدەربووە، بەڵام ئەم وەزارەتە نەیتوانیوە کەیســـەکانی ئەنفـال و هەڵەبجە وەک جینۆسـاید بە جیهانی دەرەوە بناسێنێت و بەهۆیەوە دۆزی کوردیش بەرەو پێشەوە بڕوات.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**


٩ ــــ محمد ڕەئوف، پاکیزەکانی شـەنگال، چاپخـانەی شـــڤان، چاپی یەکەم،٢٠٢٠، ل(١٩١-١٩٢).

١٠ ــــ محمد ڕەئوف، پاکیزەکانی شەنگال، چاپخـانەی شـــڤان، چاپی یەکەم،٢٠٢٠، ل(١٩١-١٩٢).

١١ ــــ جینۆسایدی شەنگال و ئێزدییەکان، ئـامار و داتا/ ئـامادەکردنی جینۆســــاید کورد،٢٠١٥/٥/١٣.

http:/genocidkurd.com/ku/babati/49 .٧٣

١٢ــ محمد ڕەئوف، کورد لە ٢٥%ی خاکی کوردستانی لەدەستداوە، ڕۆژنامەی ئاوێنە، ژمارە(٤٤٠)، ٢٠١٤/٨/١٢، ل(١).

١٣ ــــ ڕاپۆرتی یەکەمین کۆنفرانسی لالش بۆ ئاشـــتی و پێکەوەژیان، لە پەرســـتگای لالش، ٢٠١٥/٤/٣.

٢٠- لەتیف فاتیح فەرەج، شەنگال ئەنفالێکی تر، چاپی یەکەم، ٢٠١٤، ل(١٣٥).

٢١ - چیرۆکەکانی دۆزەخی داعش، ریساله شارکانی، سایتی باس نیوز،٢٠١٥/٧/٣٠.

http://www.basnews.com/index.php/so/reports/367169

٢٢ - داود موختار خەتاری، جینۆســـایدی ئێزدییەکان، و/ تەها ســـلیمان، چاپی یە کە م، ل(٦٧).

٢٣- هاوڕێ باخەوان، پرسی جینۆساید و بەنێودەوڵەتیکردنی، گۆڤاری نێوەند، ژمارە ١٠٣، مانگی ئاپریلی ٢٠١٣ ل(٥٣).

٢٤- هـــاوڕێ بـــاخەوان، لە دادگـــای میلۆســۆڤیچەوە بۆ دادگاییکردنی ســەددام، ڕۆژنـامەی میـدیـا، ژمـارە ١٧٩، ٢٨-٠١-٢٠٠٥ ، کوردستان، هەولێر، ل(٣).

٣٣- کوردستان و پۆست-داعش، ناوەندی لێکۆڵینەوەی ڕووداو، ٢٠١٦.



# لێکەوتەکانی ئەنفال

# لەسەر پرسی کلتووری نەتەوایەتی کورد


پ.ی.د. ئەحمەد باوەڕ

زانکۆی گەرمیان ـ کۆلێژی پەروەردە






## پێشەکی :

هەمووومان ئەو ڕاســــتییە باش دەزانــــیــن، کــە بــزوتــنـــەوەی ڕزگاریخوازیی و ســـیاســـی گەلی کورد بە درێژایی ســالآنی ســـەدەی بیستەمی ڕابردوو لە هەموو ناوچەو پارچەکانی دیکەی کوردســـــتانی داگیرکراودا، بـە کۆمـەڵێک قۆناغی زۆر جیاوازو هەســـتیاردا تێپەڕیوە، بـەڵام لـە چوارچێوەی هـەموو ئـەم گۆڕانکـارییـەداو بـەپێی هـەموو ئـەو ڕووداو و کارەســــاتە مەینەتبارو خوێناوییانەی، کە بەسەر گەلی کورد و بارودۆخی وڵاتی کوردســــتاندا هـاتوون، هـاوکـات لـەگـەڵ خۆیـاندا کۆمــەڵێـک گۆڕانکــاریی گــەورەو دەرئــەنجــامی گــەورەو لێکــەوتــەی جۆراوجۆرو تراژیدیایی کاریگەر و دڵتەزێنیان هێناوەتەکایەوە، کە ڕەنگە بۆ هەریەک لەوانەش دەیان و بگرە سەدان سەربووردەو باس و خواسی ئـەوتۆی لـەنـاو کوردو کۆمـەڵگـای کوردەوارییدا هێنابێتە کایەوە، کە بە درێژایی مێژوو هــەڵبگرێــت، نــەوە لەدوای نەوە بۆ یەکتری بگێڕنەوەو هـاوکـات پـەنـد لـە دەرئـەنجـام و درێـژەی ڕووداوەکـانـی وەربـگرن، وەک دەبینین کارەســـــاتی بەدناوی ئەنفال یاوەکتر بڵێین جینۆسایدکردن و قــەڵاچـۆکـردنـی دانیشـــــتوانی کوردســـتان لە کۆتاییەکانی ســـەدەی بیســــتەمی ڕابردووداو لە بەشـــی باشــــووری کوردســــتاندا لە وێنە و نموونــەی هــەرە زینـدووی ئــەو کارەســـات و ڕووداوە مێژووییانەی گەلی کوردســــتانە، کە هـەرگیزاو هــەرگیز مێژوو و تێڕوانینــەکـانی مێژووی مرۆڤایەتی نەتوانن لە بیری بکەن و حەق و حیســــابی تایبەتی لـەگـەڵدا نـەکـەن. هـەرچـەنـدە ئـەم کارەســـاتە مەینەتبارەی باشـــووری کوردســــتـان لـە کـاتی ڕوودان و پـەیـڕەوکـردنـیـانـدا لـەلایـەن فەرمانڕەوایانی حیزبی لە ناوچووی بەعســــەوە لە عێراق و هـەروەهـا ســـەدام حوســـێنی ســـەرکردەیەوە لەوانە بوون، کە بەڕادەیەکی زۆرکەم نـەبێـت، زۆربــەی زۆری وڵاتـانی دونیــاو ڕێکخـراوە نــاوچــەیی و جیهانییەکانی دونیا خۆیان لە ئاستی لێکەوتەو پێشــــهاتەکانیدا بەتەواوی کەڕکردو لەگەڵ ئەوەشـــــدا بەهۆی بـەرژەوەنـدیی بـەشــــێکی یـەکجـار زۆریان لەگەڵ حکومەتی ئەوکاتەی حیزبی بـەعس لـە عێراقداو بـەهۆی ئـەو ئـاســـــانکاریی و تـەیـارکردنـە

بەردەوامەیان بۆ فەرمانڕەوایانی بەعسی عێراق لە ڕووی چەک و تەقەمەنی جۆراوجۆرەوە بە سەدان و هەزاران مرۆڤی کوردیان هەر لە پێشمەرگەو ژن و منداڵ و خەڵکانی بێتاوان بوونە قوربانی.

بەپێی ئەو خەملاندن و هەڵسەنگاندنانەشی کە لەسەر درێژەو تەواوی ڕووداوەکانی باشووری کوردستان کراون، بەتایبەتی لە کۆتاییەکانی شوبات واتە ڕەشەمێی ساڵی (١٩٨٨)ەوە بۆ سەرەتاکانی ئەیلولی هەمانساڵ کە دەکاتە ماوەی جێبەجێکردنی پرۆسەی بەدناوی سەربازیی ئەنفال بە هەموو قۆناغەکانییەوە لە ناوچە جیاوازەکانی باشووری کوردستاندا، بەسەریەکەوەو بەزۆری بریتیبوون لە وێرانکردن و خاپوورکردنی (٤٥٠٠) گوندی باشووری کوردستان و تیاچوونی زیاد لە دووسەد و پەنجا هەزار کورد بە ڕووداو و کارەساتی هەڵەبجەو سەرنگونبوونی بارزانییەکان و کارەساتی پڕ مەینەتی ئەنفال، سەرەڕای بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی قەدەغەکراوی نێودەوڵەتی لەسەر کوردو جەستەی مرۆڤی کورد لە بەشێکی زۆری ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستاندا.

بەسەریەکەوە ئەو بوارو لایەنەشی، کە ئێمە دەمانەوێت لێرەدا و لە چوارچێوەی ئەم بابەتە کورتەدا لەسەری بوەستین و تاڕادەیەک قسە لەسەر کاریگەریی و دەرئەنجامەکانی بکەین و لەم ڕووەوە جەختی لەسەر بکەینەوە، بریتییە لە لێکەوتەو شوێنەواری کارەسات و ڕووداوی بەدناوی ئەنفال لەسەر سامان و کەلەپووری نەتەوایەتی گەلی کورد، چونکە ئەم ڕووداوە هەستیارو گەورەیە بە هەموو دەرئەنجامەکانییەوە تەنها ئەوە نییە، کە ئێمەو مانان وای لێکبدەینەوە، کە تەنها تاکی کورد و مرۆڤی بێتاوانی کورد لە چوارچێوەیدا بوونبێتنە قوربانی و وەک ڕێژەی دانیشتوان پرۆسەکە بووبێتە هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی دانیشتوانی کورد لە باشووری کوردستان و ڕێژەیەکی زۆر لە کۆمەڵانی خەڵک تیاچووبێتن، کە لێرەو لەوێ لە بۆنەو

یادەوەرییەکانی ساڵانەی ئەنفالدا ئاماژەیان بۆ بکرێت و لە خەملاندنی جیاجیا و جۆراوجۆردا باسیان لێوەبکرێت و هەریەکەمان ڕێژەیەکی سەربەخۆ بۆ ژمارەی قوربانییەکانی دەستنیشانبکەین، بەڵکو ئەمەیان وەکتر هەڵدانەوەی ئەو لاپەڕە و بە دواداچوونی کێشەو گیروگرفتانەیە، کە چارەنووسی هەموومانی پێوە بەندە و بریتییە لە لەناوچوونی ڕەگەزنامەو شوناسنامەیەک، کە هەریەک لە ئێمە پێویستە لە شوێنی خۆی و لەکاتی گونجاوی خۆیدا بۆ وڵاتانی دونیا بۆ ڕای گشتی جیهانی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بەرزی بکاتەوە و هەردەم شانازی بە کەلەپوور و هەموو ئەو پاشماوە دێرینانەشەوە بکات، کە لە دێر زەمانەوە و لە باب و باپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە، لە هەمان کاتیشدا تەواوی کوردەواری و کۆمەڵگای کوردەواری بەبێ جیاوازی خاوەنی ئەو سامان و شوناسنامەیەن، کە پێی دەگوترێت کە لەپوورو سامانی نەتەوایەتیی گەلی کوردستان.

لەو دەمانەشدا، کە تاوانی نەگریس وبەدناوی ئەنفال و کیمیابارانکردن بەسەر کورد و ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستاندا هات، لەبەر ئەوەی کوردستان خاوەنی کیان و دەسەڵاتی سەربەخۆی خۆی نەبوو و بۆیە نەتوانرا وەک پێویست کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکانی جیهان لە لێکەوتەو دەرئەنجامەکانی ئاگاداربکرێتەوەو هەوڵی ئەوەش بدرێت، سەرچاوە و هۆیەکانی ڕاگەیاندنی دونیا بگەیەنرێنە ناوچەکە، بۆئەوەی بە خۆیان و بە شێوازێکی ڕاستەوخۆ بە چاوی خۆیان تەواوی ئەو مامەڵەو گەندەڵییەی دەسەڵاتی حیزبی بەعس و فەرمانڕەوایانی بەعس لە عێراقدا ببینن، کە چۆن لە ڕێگەی ئەو هەموو هێزە سەربازییەی، کە لە سەروبەندی شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێرانەوە (١٩٨٠ – ١٩٨٨) کۆیان کردبووەوەو دواتر بەپێی بنەماکانی بڕیاری (٥٩٨)ی ڕێکخراوی

نێودەوڵەتیی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆتاییان بەو شەڕە ماڵوێرانکەرەی نێوانیان هێناوەو دواتر چۆن توانیان بەشێکی زۆر لە هێزەکانیان بەو هەموو چەک و تەقەمەنی و جاش و جبەخانەوە هەواڵەی کوردستان و ناوچە کوردنشینەکان بکەن بەمەبەستی لەناوبردن و قڕکردنی خەڵکی کوردستان و هەروەها هێزی پێشمەرگەی کوردستان وەک ئاماژەی بۆکرا : یەکێک لەلایەن و دەرئەنجامەکانی پرۆسەی نەگریس و بەدناوی (ئەنفال) وەکو ئەوەی ئێمەو مانان بە چاوی خۆمان بینیمان و زۆر بێدەسەلاتانە چاودێریمان دەکرد، ئەوە بوو، کە بەشێکی گەورەی کەلەپوور و سامانی نەتەوایەتی گەلی کورد بەبێ جیاوازی لەناوچوون و هەموو بەتالان بران، کە ئەمەش بۆ خۆی پەیوەندیی گەورە و بەرچاوی بەو دابونەریت و پەیوەندیی کۆمەلایەتییەوە هەبوو، کە وەک شوناسنامەیەک لە دێرزەمانەوە کوردەواریی و کۆمەڵی کوردەواری پێدەناسرا. هەر لە ڕووخاندنی شارو شارۆچکەی جۆراوجۆر، گوند، مزگەوت، قوتابخانە، خانەقا، تەکیێ و دیوەخانی کوردەواری و هەروەها لەگەڵیشیاندا لەناوچوونی دەیان و سەدان دەستنووس و بەیاز و پاشماوەی دێرینە و کۆنینەی دانسقە لە نێوەندی کورد و کۆمەڵگەی کوردەوارییدا، جگە لەوەی کە دەیان و سەدان و بگرە هەزاران پیاو و ژنی کۆمەڵ لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان هەر هەموو لە نەریتی کوردەواری و هەریەکەیان لە شوێن و ڕێورەسم و مەقامی خۆیدا خاوەنی دابونەریتێکی زیندووی کوردەواریی و بەتەواوی تیایدا قاڵ و شارەزابوون، کەچی بێ جیاوازی هەر هەموویان بەر ئەو پرۆسەو شاڵاوە نەگریسە کەوتن. سەرەڕای ئەوەش لەگەڵ خۆیاندا هەموو ئەو دابونەریتەی کۆمەڵیان بووە خۆراکی ئەو کورە ئاگرینانەی، کە فەرمانڕەوایانی حیزبی بەعس و دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس بۆیانیان ڕاخستبوون، وەک دەبینین

دەیان و سەدان بەیت و سەربووردە و بالۆرەی نێو کۆمەڵی کوردەواری و حیکایەتی گوێ ئاگردان، کە لە ناوچەکەی خۆیدا بۆ بۆنەو ڕێوڕەسم و ڕووداوێکی دیاریکراو وتراون و لەبەر ئەوەی پێشـــوەخت دەســـتی ئەوەیان پێنەگەیشـتووە، کە بەباشـی و بـەتـەواوی کۆبکرێنـەوە و وەک کەرەســـتەیەکی خاو و ســـامانێکی دەوڵەمەند و پڕ بەهای نەتەوایەتی تۆمـاربکرێن، کـەچی هـەر هـەموو ئەوانەش لە یادەوەری و فەرهەنگی دڵی ئەوانەدا، کە بەرشـالاوی ئەنفالی بەدناو کەوتوون، بەتەواوی سڕانەوە و لـەگـەڵ هـەڵکردنی گـەردەلوولی ڕووداوەکـانی ئـەو کـارەســـــاتـە مـەینـەتبـارەدا، ئـەوانیش بـەبێ نـازی گیانیان ســـپارد. بۆ نموونە زۆرجار لەو بۆنە ئایینی و کۆمەلایەتیانەی کوردەوارییـدا ئـەگـەر بـەوردی و بەجوانی ئاوڕت لێیان بدایەتەوە و بتڕوانیبایەتە قورئانخوێن یان مەلای مـزگـەوتـێـکـی کـوردســــتـان واڕێککەوتووە بە ســـەلیقەی خۆی و لە سەرکێش و ڕیتمی ئاواز و مەقامە کوردییـە ڕەســـــەنـەکانی نـاوچـەی گەرمیانی وەک ئەڵلاوەیســــی، قەتار، خورشـــیدی، خاوکەر ... بەتایبەتی لە ناوچەیەکی زۆر دەوڵەمەندی وەک کـەرکووک و دێهـاتـە ئـاوەدانـەکـانی گــەرمیــانــدا قورئــانی پیرۆزیــان دەخوێنـد، کــە ئــەمــەش بۆ خۆی بــەدرێژایی مێژوو وەک نــەریتێکی بــاوی کــوردەواری دەمــاودەم و پشـــتاوپشـــت بووبووە میرات و بۆ خۆی مۆرک و ڕەســـــەنایەتییەکی کـوردانــەی لــەخـۆگـرتـبـوو وەکـو ئاماژەی بۆ کرا: جگە لە ســـووتاندن و لــەنــاوچــوونــی هــەمــوو ئــەو دەســـــتنووس و بـەیازو ســـــیپارە نووســــــراوە دەگمــەن و هــەمــە چەشـنانەی، کە لەسـەر ڕەفەی مالان و مزگەوت و خانەقا و تەکیەکانی کوردســــتاندا هەموو بوونە خۆراکی ئاگر و بەر شـــــالاوی نەگریســــی (ئەنفال) کەوتن یان هەڵوەشاندنەوەی ئەو ســیما و خەسـڵەتەی کۆمەڵگەی کشـــتوکاڵی ولاتی کوردســــتان و هەموو ئەوکەرســــتانەی کە بۆ ئەو مەبەســـتە بەکاردەهێنران، کە لەگەڵ

خۆیدا خاوەنی نەریت و دابێکی کۆمەڵایەتی تایبەت بووە و ئەوەش بۆ خۆی بە زۆری لە ناوچە جیاجیاو دێهاتە ئاوەدانەکانی باشووری کوردستاندا ساڵانە دووبارە و چەند بارە کراوەتەوە وەک دەتبینی لەکاتی دروێنەکردن و گەلە دروێنەی خەڵکی لادێنشینی کوردەوارییدا و هەموو ئەوانەی، کە لە دوای (هۆناس)[١]واتە سەردەستەی دروێنەکارانەوە دەڕۆیشتن و پەیتا پەیتا دروێنەیان دەکرد، هەر یەکەو لەلای خۆیەوە چەندین ئاواز و گۆرانی کوردانەی لەو بۆنەیە و لەو ڕێوڕەسمە ڕەسەنەی کوردەواریدا دەوتەوە، هاوکات هەریەکەشیان بۆ خۆی جۆرێک لە خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆیان هەبووە، وەک ئەوەی هەموو ئەو هەڵبەست و ئەو شیعرو بابەتە فۆلکلۆرییانە بارگاوی ئەو ڕێوڕەسمەیان دەکرد و هەر هەمووشیان لە ناخی کوردەواریی و کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە هەڵدەقوڵان و سەرچاوەیان دەگرت، هاوکات هەر یەکەش بۆ خۆیان پەیوەستبوون بە ناوچە و هەرێمێکی دیاریکراوی کوردستانەوە و بەهۆی بارودۆخی کوردستان و ناڵەباریی و نائاسایی ناوچەکەوە بەشێکی یەکجار زۆر لەو کەرەستە خاوانەی ئاوازو گۆرانی و سامانی فۆلکلۆریی کوردەواری تیاچوون و ڕەسەنایەتی کۆمەڵی کوردەوارییان تا ڕادەیەکی زۆر لەبەر یەکترهەڵوەشاندەوە یان ئەو هەموو سامانەی ئاژەڵ بە هەموو بەشەکانییەوە لە ناوچە و دێهاتەکانی کوردستاندا، کە سەرچاوەیەکی سەرەکی خۆراکی و بنەمایەکی گرنگی پیشە دەستییەکانی کوردستان و ئابووری زیندووی کوردستان بوون و ڕۆژانە دانیشتوانی ئەم وڵات و ناوچەیە بەتایبەتی (کۆمەڵی لادێنشین)ی کوردەواریی پشتیان پێدەبەست بۆ

[١] – هۆناس : بەوکەسە دەوترێت، کە لە کاتی دروێنەکردندا پێش هەموو دروێنە کاران دەکەوێت.

نموونـه ئـەگـەر لـەم لایـەنـەوە و بەوردی سـەیری ناوچەیەکی گرنگی وەک گـەرمیـانـت بکردایـە لـە کـاتی ڕاگواسـتن و ئەنفالکردنی خەڵکە بێ دەرەتانەکەیدا بەسـەدان و هەزاران سـەر ئاژەڵی وەک: مەڕ، بزن، مانگا، وڵاخی بەرزەی جۆراوجۆر تەنانەت سەگ و پشیلەو گوێدرێژ و مریشک و جوجـەڵـەی دیهـاتـەکـان هـەموو لـەوانـە بـوون، کـە بـەتـەواوی دەوروبـەری شـارەکانی کەلار و کفری و خوورماتوو و چەمچەماڵیان هەموو تەنی بوو. لەگەڵ ئەوەشـدا سـەرەڕای پیاوانی سـەر بـە دامودەزگـاکـانی حیزبی بـەعسـی لـەنـاوچوو، زۆرێـک لـە خـەڵکـانی کـاسـەلێس و خـائین و جـاش و سـەرەک جاشـی کوردیش بۆ خۆیان و بێشـەرمـانـە ئـالووێریـان پێوە دەکردن و بە نرخێکی زۆر هـەرزان هەڕاجیان دەکردن و بەرەو وڵاتانی دەوروبەریان دەبردن، بە ڕاسـتی هەموو ئەو وێنە سامناک و تراژیدی و واقعیانەی ئەودەمانە بۆ خۆیان ڕۆژی حەشـرو قیامەتێکی تایبەت بوون، کە هەر بۆ کورد و خەڵکی بێ دەرەتـانـی گـەلـی کـوردسـتـان هەڵخرابوون و لێرەشدا ڕەنگە بواری ئەوە نەبێت، بەو ئاسـانییە لەسـەر درێژەی وردە کارییەکانی بدوێین و باسـیان لێوەبکەین، هەر بۆ نموونە دەڵێم : نـازانم پـەڕەمووچی کـام هونـەرمـەنـدی نـاسـراوی دونیـا دەتوانێت بەجوانی گوزارشـت لـە وێنەی تەرم و لاشـەی ساردوسڕی ئـەو دوو مێرد منـاڵـەی کوردی ئەنفالکراوی گەرمیانی و لە دایک و باوک دابڕاو بکێشـێت، کە لە کاتی پرۆسـەو هێرشـە بەدناوەکانی ئەنفال و لە ناوەڕاسـتی خەلەیەکی دەشـتی گـەرمیـانـدا، کـاتێـک بـە ڕێکـەوت دۆزرانەوە بە هەموو توانایانەوەو لە ترسـاندا و لەبرسـانا ئاوێزان و باوەشـیان بە یەکتردا کردبوو و پێکەوە گیانی پیرۆزیان سـپاردبوو، یـان هـەر زۆر زۆر چاکم لـەیـادە، کـاتێک بـە چـەند سـەیارەیـەکی کۆسـتـەری ئـەوکاتە ژمارەیەکی زۆری ژن و مـنـاڵ و پـیـاوی پـەککـەوتـەی دێهـاتـە جیـاوازەکـانی

گەرمیانیان، کە یەکێکیان خوالێخۆشبوو کاک مەحموود حەرەس زەنگەنە (١٩٣١ – ١٩٩٣)ی خەڵکی گوندی (بنەکەی خەپەکوێر)ی ناوچەی زەنگەنەی خزمم بوو لە مەنفای (نوگرەسەلمان)[٢]و باشووری عێراقەوە هێنایاننەوە بۆ شاری کەلاری ئەو کاتەو لە دەورووبەری دوای بانگی عەسرو ڕۆژێکی هاوینی زۆر گەرمی ساڵی (١٩٨٨)دا، هەر هەموویانیان کردە نێو حەوشەی قوتابخانەی (لەیلا قاسم سەرەتایی)ی ئێستای کەلارو (رسالة خالدة)ی ئەو کاتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆریش لە جاش و ئیستخبارات و پیاوانی سەر بە سەرۆکایەتی فیرقەی حیزبی بەعسی قەزای کەلار وەک سەگی هار

[٢] – نوگرەسەلمان: دەکەوێتە ناوەندی بیابانی (سەماوە)وە، لە ناوچەی سەلمان و نزیکەی (١٥٠) کیلۆمەتر لە شاری(سەماوە)وە، بە رووکاری سنووری عەرەبستانی سعویەدا دوورە، ئەم زیندانە، کە لە سەرەتادا بریتیبووە لە قەڵایەک و لە ساڵی (١٩٢٨) دا، لەلایەن سەرکردەی سەربازی بەریتانی (گلۆپ پاشا) وە دروستکراوە، وەک سەربازگەیەک بۆ بنکەی هێزەکانی بیابان و بەمەبەستی چاودێریکردنی بزوتنەوەی خێڵەکان و بەتایبەتی وەهابیەکان، کە بەزۆری لێرەوە هێرشیان کردۆتە سەر ناوچەکانی باشووری عێراق، هەروەها ئەم ناوچەیەش بۆیە بۆ مەبەستی ناوبراو دەستنیشانکراوە، بەوەی کە گوایە خاڵێکی ناوەندی بووە لە نێوان سنووری هەریەک لە وڵات و شانشینەکانی ئەو کاتەی وەک: عێراق و ئەردەن و عەرەبستانی سعودیەدا، بەپێی لێکدانەوەی مێژوونووسی ناسراوی عێراقی عەبدولڕەزاق ئەلحەسەنی، کە خۆیشی بۆ ماوەیەک یەکێک بووە لە زیندانیانی سەربازگەی (نوگرەسەلمان) لە بارەیەوە دەنووسێت: نوگرەسەلمان بۆ یەکەم جار وەک زیندان لە دوای شکستهێنانی بزوتنەوەی مایسی (١٩٤١)ەوە بەکارهێنراوەو بەزۆری هەموو ئەوانەشی، کە تیایدا زیندانی کراون، لەوانە بوون، کە دەستیان هەبووە لە (بزوتنەوەی مایسی ١٩٤١)دا یان لایەنگیری ئەو بزوتنەوەیە بوون، کە خۆی لە خۆیدا وەک سەربازگەیەک لە دوو قەڵا پێکهاتووە، یەکەمیان: دەکەوێتە لای باکوورییەوەو ئەوی کەشیان دەکەوێتە لای باشوورییەوە، هەریەکەشیان ژێر زەمینێکی تایبەت بەخۆی هەیە و لە ڕێگای پلەکانەی ئاسنینەوە واتە (سلم حدیدی) بۆی دادەبەزیت. بڕوانە: الدکتورحیدر حمید رشید، خفایا من تاریخ العراق المعاصر، (دمشق: ٢٠١٠)، ص(٨٩–٩٠).

بەدوایانەوە بوون و لێیان نەدەبوونەوە و هەرجارەی بەجۆرێک پروپاگەندەو قاوی ئەوەیان بۆ خەڵکەکە ئەدا و بڵاودەکردەوە، کە چۆن ئەوان ئەیانەوێت لەوێدا بەرەڵلایان بکەن، جار ناجارێکیش بە خەڵکەکەیان دەوت (مەبەستم لە کەسوکاری گیراوەکان و ئەنفالکراوەکانە) بڕۆن بۆ لای بارەگای سەرەکی فیرقەی حیزبی بەعس لەوێ بەرەڵلادەکرێن و هەندێکیشیان دەیان وت چاوەڕوانبن، هەر ئێستا بەرەڵلادەبن و هەموو ئەوانەشیان بۆ ئەوە بوو، کە ئەو کۆبوونەوەی کۆمەڵانی خەڵک لە ناوەڕاستی بازاڕی کەلاردا کەمبکەنەوە. ئەوەبوو بۆ شەوەکەیشی چووینە ماڵی خوالێخۆشبوو حاجی عەلی حوسێن ئەمنەی باوکی کاک ڕەحمان خانی و خەڵکێکی زۆر و خزمانێکی زۆر لە دەوری خولێخۆشبوو کاک مەحموود حەرەس کۆبووبووینەوەو ئەویش زۆر بەتەوسەوەو وەک چیرۆکێکی بەرئاگردانی واقیعی باسی لەسەربووردەو ژیانی هەموو ئەوخەڵکەی دەکرد، کە برابوونە مەنفای (نوگرە سەلمان) زۆر چاکم لە یادە، کە باسی پیاوێکی بەتەمەنی وەک خوالێخۆشبوو حاجی حوسێن ئەمنە (١٨٧٠ - ١٩٨٨)ی کرد بۆ کوڕو کەسوکارەکەی لەبارەیەوە دەیوت : «کە لەوێ بووین، حاجی حوسێن زۆر نەخۆش و لاواز بووبوو و هەر لەوێشدا گیانی سپارد، ئێمەش هەر بە پاڵتۆکەی خۆیەوەو لەو دەشتە چۆڵەی نوگرەسەلماندا ئەسپەردەی خاکمان کرد». بە هەرحاڵ ئەوە بوو، هەر لەوێدا و لەو دەمەو ئێوارەیەدا هەموو ئازادکران و لەو ئان و ساتەشدا خۆم و برادەرێکی هاوپۆل و هاوکۆلێژم لەگەڵدابوو (کاک فەرهاد محەمەد ئەمین)، کە ئەوکاتە هەردووکمان پێکەوە خوێندکاری زانکۆی بەغدا ـــ کۆلێژی ئەدەبیات بووین و لە کاتی پشووی هاوینەدا، گەڕابووینەوە لای کەسوکارمان لە کەلار لەو کاتەدا دەیان جار دەموت: خۆزگە ئێستا ترسی ئەم

چاوچنۆکانەت نەبووایە و کامێرایەکت پێ بووایە، بۆئەوەی وەک یادگارێکی تاڵ و بۆ ڕاستی و بۆ مێژوو وێنەی یەکەبەیەکە یانت بگرتایە. هەر ئەوکاتە پیاوێکی بەساڵاچووی زۆر پیرم بە چاوی خۆم دی، تاوەکو ئەو کاتەش، کە گەڕابووەوە پارچە لێفەیەکی زۆر شڕی دابووە سەر باڵیاو لە زۆر شوێنەوە لۆکەکەی هاتبوونە دەرەوە، دوای ئازادبوونی هەر لەوێدا لێفەکەی فڕێدا و لەگەڵ بەشێک لە کەسوکاریدا ڕۆیشتن و جارجاریش ئاوڕی لە دواوەی خۆی و لە لێفەشڕەکەی سەر باڵی دەدایەوە.

هەروەها بە چاوانی خۆم بینیم، بەشێکی تر لەو ژن و مناڵ و خەڵکە بێدەرەتانە هەریەکە و قتویەکی (یەک کیلۆ) یی ڕۆنی (راعی) ئەو کاتەیان بە دەستەوە بوو، کە بەشێکیان لە پەڕۆی جۆراوجۆر و بەرگێکی هاکەزاییان بۆ کرابوو، دیاربوو، بۆ ئەوەیان بوو، ئاوی تیا بخۆنەوە. ئەمانە بەشێکی یەکجار بچووکن لەو سەربوودەو وێنانەی، کە هەرگیزا و هەرگیز لە بیرو فیکرو ئاوەزم ناچنەوە و بگرە زیاتر وێنەی دەیان و سەدان لە هەموو ئەو خزم و کەسوکارەم دەهێننەوە یاد، کە لە ڕۆژگار و ساڵانی نەگریسی ئەنفالدا لە دەستمدان، لەوانە: کامیل و جەلال و حوسێنی پورزام، کە تاوەکو ئیستاش خێزانەکانیان بێوەژنن وکچ و کوڕەکانیشیان بە هەتیوی گەورە بوون و خوێندنیان تەواوکردو وا وردەوردە دەچنەوە سەر ماڵ وحاڵی خۆیان، هەروەها کاک خورشید ئەحمەد ئەمین ژاڵەیی (١٩٥٢-١٩٨٨) هاوڕێ و خاڵۆزام، کە ماوەیەکی زۆر فەرمانبەری (فەرمانگەی کارەبای کەلار) بوو و لەو کاتەدا وەک کەسێکی هەڵاتوو لە دەستی فەرمانڕەوایانی حیزبی بەعس لە گوندی (پیرەمۆنی) ناوچەی زەنگەنە کەوتە دەستی جاش و هێزەکانی حیزبی بەعسەوە و بەیەکجاری بەجێیهێشتین و تەنها شوناسنامەو ڕەگەزنامە و کۆمەڵێک ئەوراق و وێنەی لای من ماونەتەوە. جگە لە هەموو ئەوانەش هەرگیزاو هەرگیز

ئەو قسەیە خۆشەی مام فاتیحی گوندی کەریم باسامم لەبیرناچێتەوە، کە دوو ژنی هەبوو بە ناوەکانی (خەیریە) و(ئاسکە) ئەمەی دواییان ژنی بچووک و لەوی دییان جوانتر و بە دیمەنتر بوو، جا کە مام فاتیح بچووبایە بۆ هەر بۆنەو رێو رەسمێک ژنەی بچووکی لەگەڵ خۆی دەبرد و لە پێشا ئاگاداری دەکردنەوە و بە پێکەنینەوە دەیگوت : «ئاسکە خۆت خاسکە» واتە خۆت بگۆرە و ئامادەبە. بە خەیریەی گەورە ژنیشی دەگوت : «خەیە توو مەیە» واتە خەیریە تۆمەیە و لە مالابە....بەلام ئەفسووس پرۆسەی نەگریسی ئەنفال هەموو ئەمانەو هەموو قسەخۆش و یادگارییەکانیانی هەڵلووشی. جا لێرەداو لە رێگەی ئەم بابەت و نووسینە کورتەوە بۆ جارێکی دیکە پێشنیاردەکەم، کە هەردوو بینایەی (لیوا)ێ کۆنی کەلار و قوتابخانەی سەرەتایی (لەیلا قاسم)ی ئێستا، کە جاران (رسالة خالدة)ی پێ دەوترا بکرێنە دوو ناوەند و سەنتەری سەرەکی، کە بۆ خۆیان گوزارشت لە (ئەنفال) و پرۆسەی بەدناوی (ئەنفال) بکەن و هاوکات هەوڵیش بدرێ، هەموو ئەو کەرەستەو بابەتانەی، کە پەیوەستن بەم کارەساتەوە لەم شوێنانەی (گەرمیان)دا وەک بە ڵگەنامە و وەک دۆکۆمێنتی تایبەت بە ئەنفالەوە کۆبکرێنەوە و بپارێزێن، تا ببێتە گەواهێک بۆ راستی و بۆ مێژوو بخرێنە بەرچاوی نەوەکانی داهاتوومان.

[3]- لە کاتێکدا ئەم بابەتە دەنووسمەوە، خۆشبەختانە بینای لیوای کۆن کە لە ئێستادا سەرۆکایەتی دووەمی زانکۆی گەرمیانە، ئەوا ئەمساڵی (٢٠٢٤) سەنتەرێکی جینۆسایدی سەر بە سەرۆکایەتی زانکۆی گەرمیانی تێدا کراوەتەوە، هیوادارم بتوانێت لەم بوارەی کە لە پێناویدا دروستبووە، رۆڵی کاریگەریی خۆی سەبارەت بە پرسی ئەنفال لەئەستۆبگیرێت.



# دەروازەیەکی گشتی دەربارەی جینۆساید

# (جینۆسایدی کوردانی فەیلی بە نموونە)

پ. ی. د. یاسین ئاشور جوهر
زانکۆی گەرمیان/ کولێجی پەروەردە
بەشی جوگرافیا

م. د. هێمن نصرالدين محمد امين
زانکۆی گەرمیان/ کولێجی پەروەردە
بەشی جوگرافیا



کۆمەڵکوژی (جینۆساید) یەکێکە لە سیما دیارەکانی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی، بەدرێژایی سەردەمە مێژووییەکانی مرۆڤایەتی تاوانی کۆمەڵکوژی لەکات و شوێنی جیاجادا بەرامبەر بە گرووپە نەتەوەیی و نەژادیی و ئاینیی و مەزهەبییە جیاجیاکان بەکارهاتووە، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا ئەم تاوانە بە شێوەیەکی فراوان و درندانەتر پیادەکرا.

## یەکەم: چەمک و ڕەهەندەکانی جینۆساید

چەمکی جینۆساید بۆ یەکەمجار لەلایەن (ڕەفایل لیمکین – Raphael Lemkin)ی بە ڕەچەڵەک جوولەکە لە ساڵی (١٩٤٤) داهێنرا(مارتن شو، ٢٠١٧، ص ٣١ ومابعدها). چەمکەکە لەو کاتەوە بووەتە بەشێکی گرنگی یاسای تاوانی نێودەوڵەتی. هەڵبەتە هەوڵەکانی (لیمکین) وەهای کرد، هەر لە یەکەم ساڵی دامەزراندنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە؛ ئەو ڕێکخراوە کار بۆ بە تاوانناساندنی جینۆساید بکات. بۆیە لە ماوەی کەمتر لە سێ ساڵ لە دوای دامەزراندنی ڕێکخراوەکەوە لە ساڵی (١٩٤٨) پەیماننامەیەک بۆ قەدەغەکردن و سزادانی تاوانی جینۆساید دەربکرێت بە ناوی (پەیماننامەی بەرلێگرتن و سزادانی تاوانی جینۆساید) کە یەکێکە لە پەیماننامە سەرەتاییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان و لە ساڵی (١٩٥٢)ەوە چووەتە بواری کارپێکردنەوە(جون اس. جیبسون، ١٩٩٩، ١٧٤).

پەیماننامەی جینۆساید یەکەمین ڕێککەوتنامەیە کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ دەرچوونبێت. بە شێوەیەکی گشتی ڕێککەوتنامەکە جەختدەکاتەوە سەر گرنگیدان بە پاراستنی کەمە نەتەوەایەتیی و ئاینیی و ڕەگەزییەکان لەو مەترسیانەی، کە دەبنە هەڕەشە بۆ سەر بوونیان. ئەو جۆرە کارانەی بۆ پاراستنی کەمە نەتەوایەتیی و ئاینیی

و ڕەگەزییەکان کاری لەپێشینەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوەکانی پاراستنی مافی مرۆڤە لە سەرتاسەری جیهاندا. لەپاڵ ئەمەدا، ڕێککەوتنامەکە ئاماژەی گرنگ و سەرەکی بە ڕۆڵی دادگا و لێپرسینەوە لە تاوانکاریی دەدات بۆ پاراستن و چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ.

لە دیباجەی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە کە: (جینۆساید بەگوێرەی یاسای گشتی نێودەوڵەتی لەگەڵ گیان و ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ناگونجێت و؛ جیهانی شارستانیش سەرکۆنەی دەکات). هەروەها ئەوەش رادەگەیەنێت کە جینۆساید بەدرێژەی چەرخەکانی مێژوو زیانی گەورەی بەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی گەیاندووە. بۆ دەربازبوونی مرۆڤایەتیش لەم کردەوە ناشرین و قێزەونانە پێویستە هەماهەنگیی و هاوکاریی نێودەوڵەتی هەبێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەقەی سەرەوە ئەوە ڕووندەبێتەوە، کە بۆ نەهێشتن و ڕێگریکردن لەم کردەوە قیزەونە پێویستە ولاتانی جیهان هەماهەنگیی یەکتری بکەن و پێکەوە کار بکەن بۆ شکۆدارکردنی مافەکانی مرۆڤ و فراوانترکردنی پانتایی ماف و ئازادییە گشتییەکان.

لە مادەی یەکەمی ڕێککەوتنامەکەدا هاتووە، کە جینۆساید دەکرێت لەکاتی جەنگ و لەکاتی ئاشتیشدا پیادەبکرێت. ناوەڕۆکی ئەم مادەیە بەڕوونی دەقی لەسەر ئەوە داوە، کە مەرج نییە، کردەی جینۆساید تەنها لەکاتی جەنگدا ئەنجامبدرێت، بەڵکو کردەیەکە لەکاتی ئاشتیشدا دەکرێت ئەنجامبدرێت. ئەمەش بۆ ئەوەیە چاوپۆشی لەو دەوڵەت و لایەنانە نەکرێت، کە لەکاتی سەقامگیریی و نەبوونی جەنگدا بە پاساوی ئاسایشی نیشتمانیی و پاراستنی پایەکانی دەوڵەت هەستن بە ئەنجامدانی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی

لەسەر بنەمای ئایینی یاخود نەتەوەیی یاخود ڕەگەزیی.

شایانی ئاماژەیە لە هەر سێ سیستەمی بنەڕەتی دادگای تاوانکاری نێودەوڵەتی بۆ (تاوانکاری بۆ یوگسلاڤیای پێشوو، دادگای نێودەوڵەتی تاوانکاری بۆ ڕووەندا، دادگای تاوانی نێودەوڵەتی) لە پێناسەکردنیاندا بۆ تاوانی جینۆساید هەمان پێناسەکەی مادەی (٢) ی پەیماننامەی بەرلێگرتن و سزادانی تاوانی جینۆسایدیان؛ بەکاریانهێناوە.

مادەی (٢) ڕێککەوتنامەی ناوبراو پێناسەی جینۆساید بەم جۆرە دەکات کە: (بریتییە لە تێکدان و هەڵتەکاندنی گشتەکی یاخود بەشەکی کۆمەڵەیەکی نەتەوەیی یان ئایینی یان نەژادیی، ئەم کردەوانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە:

١- کوشتنی ئەندامانی ئەو گروپە.

٢- زیانپێگەیاندنی جەستەیی و هزریی گەورە بە ئەندامانی ئەو گروپە.

٣- ناچارکردنی بەئەنقەستی گروپەکە، بەوەی لە بارودۆخێکی ژیانکردنی وەهادا بژین، کە ببێتە هۆی لەناوچوونی بەشێک یان هەموویان.

٤- گرتنەبەری ڕێو شوێنی توند کە ببێتە کۆسپ لە بەردەم زیادبوونی وەچە.

٥- ڕاگواستنی منداڵ لە گرووپێکەوە بۆ گرووپێکی تر بەزۆر.

بێگومان پرسی تاوانەکانی جینۆساید لەلایەن شارەزایانی بوارەکە و یاساناسان و توێژەران و چالاکوانانی مافەکانی مرۆڤەوە زۆری لەسەر نووسراوە و لێکدانەوەی هەمەجۆری بۆ کراوە، هەر لەبەر ئەم هۆکارە لەم توێژنەوەیەدا نامانەوێت بەتەواوی ئەو ئەدەبیاتانە بچینەوە، کە لەم بارەیەوە بەردەستن. لە هەمان کاتیشدا مەبەستمان نییە لە مێژوو و بنەچەی کوردە فەیلەکان بکۆڵینەوە، جگە لە ئاماژەدانێکی کورت نەبێت بە کرۆنۆلۆژیایەکی ئەو تاوان و کردەوە نامرۆڤایەتییانەی کە لەلایەن

ڕژێمە یەک لەدوای یەکەکانی عێراقەوە دژ بەکوردە فەیلییەکان پیادەکراوە. هەروەها ناشمانەوێت کۆی ئەو بەڵگانە بخەینەڕوو، تا بیسەلمێنین، کە کوردە فەیلییەکان جینۆسایدکراون، چونکە خۆشبەختانە ئەم پرسە واتە (دۆسیەی تاوانی جینۆسایدی کوردە فەیلەییەکان) لەلایەن داداگای باڵای تاوانەکانی عێراقەوە لە ڕێکەوتنی (٢٠١٠/١١/٢٩) بە جینۆساید ناسێنرا.

**دووەم: کرۆنۆلۆژیای جینۆسایدی کوردە فەیلییەکان لەسەر دەستی حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق**

مەبەستمانە لێرەدا تەنها گوزەریکی خێرا بەناو ئەو مێژووەدا بکەین و لەسەر ئەو وێستگە گرنگانەی بوەستین، کە تیاندا کوردانی فەیلی بەپلانی بەرنامە بۆ داڕێژراو لەپشت مانقێستبوونی گوتارێکی شۆڤینی عەرەبی و ئایدیۆلۆژیایەکی نامرۆڤدۆستییەوە لەسەر دەستی دەسەڵاتدارانی حکومەتە یەک لەدوای یەکەکان لە ساتەوەختی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقییەوە ڕووبەڕووی هەموو جۆرەکانی جینۆساید بوونەتەوە.

نەهامەتی و دووڵبوون لە هاونیشتیمانیبوونی کوردە فەیلییەکان لە عێراقدا لە سەروبەندی دیاریکردنی سنووری نێوان عێراق و ئێران وەک دوو دەوڵەتی سەربەخۆ هاتەکایەوە. ئەم سنوورکێشانەی نێوان دوو دەوڵەتەکە بووە مایەی پەرتکردنی نەتەوەی کورد بەگشتی و دابڕینی تیرە و هۆزی کوردە فەیلییەکان لێکتریی‌و لاوزاکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی نێوانیان (خلیل ئیسماعیل، ١٩٩٨، ل١٠٨). لە هەمان کاتدا دەرچوواندنی یاسای ڕەگەزنامەی عێراقی ژمارە (٤٢) لەساڵی (١٩٢٤) بۆ خۆی ڕێگەخۆشکەربوو، کە وەک فاکتەر و بەهانەیەکی یاسایی دژ بە مافی هاوڵاتیبوونی کوردانی فەیلی لە عێراق بەکاربهێنرێت (زكي جعفر

الـفـيـلـي، ٢٠٠٩، ص ٤٩٢-٤٩٤).
یاســاکە بەگشــتی عێراقییەکانی بۆ دوو بەشــی ســەرەکی دابەشــکرد: شوێنکەوتووانی دەوڵەتی عوسمانیی تورکی و شــوێنکەوتووانی دەوڵەتی ئێرانی. بە شــێوەیەکی گشــتی لایەنگری مەزهەبی ڕۆڵی ســەرەکی لە هــاوکــێشــەکەدا هەبــوو. شوێنکەوتووانی عوسمانی بەبێ هیچ ئاستەمێک بوونە خاوەن ڕەگەزنامەی عێراقی، لەکاتێکدا شــوێنکەوتووانی دەوڵەتی ئێرانی ئەوانەی لەناو خاکی عـێـراقـدا بـوون بەمەرجی قـورس ڕەگەزنـامەی عێراقییـان پێـدەدرا، یاخود هەر لێی بێبەشکران. بەشێکی زۆری کـوردانـی فەیـلـی بەهـۆی کوردبوونیـان و مەزهەبی بوونیـان کە شــیـعە بـوون، بە ئەســتەم ڕەگەزنـامەی عێراقییـان وەرگرت و ژمارەیەکی زۆریشیان لێبێبەشکران (خلیل اســمـاعیـل محمـد، ٢٠١٣، ص ٣٤-٣٥). ئەمە ســەرەتـایەکـی ترســناک بوو بۆ جینوســایدکردنی کوردانی فەیلی لە عێراق.

یەکەمین پرۆســەی کۆچپێکردنی کوردە فەیلییەکان لە ســاڵی (١٩٣٦) لە ســەردەمی کابینەی حکومەتەکەی (تەها یاسین هاشمی) دەستی پێکرد. بە دوایـدا شــەپـۆلـی دووەمـی کۆچپێکردنەکە لە سەردەمی (ڕەشید عالی گەیلانی) ڕوویدا. لە ئەنجامدا ژمـارەیەکی زۆری خێزانی کوردە فەیلییەکان بەپاســاوی نەبوونی هیچ بەڵگەنـامەیەک بیســەلمێنیـت، کە شـوێنکەوتویی دەوڵەتی عوسـمانی بوونە یـاخود شــوێنکەوتوویی دەوڵەتی ئێرانن؛ ئاوارەی ئێران کران و شوێن و خاکەکیان تەعریبکرا(زكي جعفر الفيلي، ٢٠٠٩، ص٤٩٢-٤٩٤ ).

پاش ڕووخانی سیستەمی پادشایەتی لە ســاڵی (١٩٥٨)، بەجۆرێـک لە جۆرەکان ئەو فشـارە زۆرە لەسـەر کوردە فەیلییەکان نەما (ســلیم مطر، ٢٠٠٤، ص ٣٠٢) و (ریاض جاســم محمـد فیلي، ٢٠٠٨/٧/١١)، بەڵام بە هەڵگیرسـانی (شـۆڕشـی ئەیلول) لە ســاڵـی (١٩٦١) و کـرژبـوونـی پەیوەنـدییەکـانی نـێوان هەردوو

حکومەتی عێراقی و ئێرانی جارێکی دیکە نەهامەتی بەرۆکی کوردە فەیلییەکانی گرتەوە. کۆدەتای بەعسییەکان بەسەر (عبدالکریم قاسم)دا لە ساڵی (١٩٦٣) کوردە فەیلییەکان جارێکی دیکە لەسەر دەستی (گاردی نەتەوەیی - الحرس القومي) ڕووبەڕووی جینۆساید بوونەوە بەتایبەتی لەگەڕەکی (گعد الاکراد) لە بەغداد (منذر الفضل، ٢٠٠٤، ص٧٠). دانیشتوانی ئەو گەڕەکە کە زۆربەیان کوردی فەیلیبوون بەهۆی لایەنگیریان بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان و حزبی شیوعی عێراقی لەسەر دەستی گاردی نەتەوەیی قیزەوەنترین تاوانیان بەرامبەر ئەنجامدرا.

بێگومان مەینەتی و کارەساتی کوردە فەیلییەکان لێرەدا کۆتایی نەهات؛ بەڵکو لەدوای کۆدەتای دووەمی بەعسییەکان لە (١٧ تەموزی ١٩٦٨) بە هەمان پاساوی عێراقی نەبوون لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٩، ١٩٧٠، ١٩٧١) سەرانی بەعس هەستان بەکۆچپێکردنی بەزۆری نزیکەی (٧٠) هەزار کوردی فەیلی (ریاض جاسم محمد فيلي، ٢٠٠٧/٩/١٢). شایانی ئاماژەیە ئەمە لەکاتێکدا بوو، کە ڕێکەوتنامەی (١١ ئازاری ١٩٧٠) لەنێوان (پ.د.ک) و (حکومەتی بەعس) واژۆکرابوو.

ئەوەی ئەم قۆناغە لە جینۆسایدی کوردە فەیلییەکان جیادەکاتەوە، ئەوەیە کە چیتر توندوتیژیی دەسەڵاتداریتی (العنف السلطوي) کارێکی تاکەکەسی یاخود باڵێک لە باڵەکانی حزبی فەرمانڕەوا نییە، بەڵکو بووە کارێکی فەرمی سیستەماتیک و پلان بۆ دارێژراوی حکومی و خودی حکومەت و حزبی بەعس سەرپەرشتی پرۆسە تاوانکارییەکانیان دەکرد. ئەنجامدانیشی بوو بە ئەرکێکی فەرمی(طالب جبار احمد، ١٩٩٧، ص ٤٢-٤٣).

لە پاش ڕێکەوتنامەی جەزائیر لەنێوان عێراق و ئێران لە ساڵی

(١٩٧٥) و شکستی شۆڕشی کوردی، جینۆسـادی کوردانی فەیلی پێیی نایە هەرە مەتـرسـیـدارتـریـن قۆنـاغەکـانییەوە. بۆ تواندنەوەی نەتەوەی کورد لە عێراقدا، حکومەتی بەعس ئەمجارە بە پلانێکی تۆکمە و بەهێزەوە هەسـتا بە ڕاگواسـتن و چۆڵکردنی گوندە سـنوورییەکـان بەقـوولایـی (١٠- ٢٠کـم) بەنـاوی (پشتێنەی ئەمنیەوە). بەشێکی زۆری نـاوچەکـانی کوردە فەیلییەکـان لە ڕۆژهەلاتی قەزای خـانەقین بەر ئەم شـالاوە کەوتن(ئەمین قـادر مینە، ٢٠١٢، ل ٢٧١-٢٧٦).(احمد ناصـر الفيلي، ٢٠١٢، ص١٤٢-١٤٣).

لە سـەرەتای هەشتاکانی سـەدەی بیسـتەم بە مـاوەیەکی کەم پێش بەرپابوونی شـۆڕشـی ئیسـلامی لە ئـێـران و ڕووخـانـی ڕژێـمـی شـاهـانشـهـای لەو ولاتە؛ پەیوەندییەکانی نێوان عێراق و ئێران ئالۆزبوون، کەمتر لە سالێک لە دوای ئەو شـۆڕشـە جەنگی نێوانیـان بەرپابوو. لەو جەنگەدا دیسـانەوە کوردە فەیلییەکـان بە شـێوەیەکی فـراوان و دڕنـدانە ڕووبەڕووی جینۆسـاید بوونەوە. لە سـەرەتا و مـاوە و کۆتـایی جەنگەکەدا؛ ڕژێمی بەعس لە بـالاترین دەسـەلاتییەوە (ئەنجومەنی سـەرکردایەتی شـۆڕش) بە بیـانووی ڕەچەڵەکی ئێرانی و خۆفرۆشـی و خیـانەتکـاری و دڵسـۆزی نەبوون بۆ پرەنسـیپەکانی شـۆڕش ژمارەیەک بڕیاری دەرکرد، کە زیاتر دژ بەکوردانی فەیلی بوون. سـەرەتا لە ڕێگەی بڕیاری ژمارە (١٨٠) لە (١٩٨٠/٢/٣) کە دەسـەلاتی ڕەهـادرابووە وەزیری نـاوخۆ بۆ بەخشـین یاخود ڕەگەزنامەی عێراقی بە بیانییەکان. شـایانی ئاماژەیە ئەم بڕیارە ژمارەیەک عەشیرەتی کوردی بە بیانی دانابوو وەک عەشیرەتەکانی (سـوەرمیری، گورکوش، زەرگوش، مەلەکشاهی، قەرەلووس، ئەرکەوازی، فەیلی و کۆیـان). هەروەهـا بڕیـاری (٢٠٠) لە (١٩٨٠/٢/٧) و بـڕیـاری (٥١٨) لە (١٩٨٠/٤/١٠) کە بـیـانـی ئـێـرانـی واتە ئەوانەی ڕەچەڵـکـی ئێرانیـان هەیە، بڕیـاری (١٨٠)ی

تایبەت بە پێدانی ڕەگەزنامە نایانگرێتەوە. شایەنی ئاماژەیە دەرکردنی هەموو ئەو بڕیارانە ڕێگەخۆشکەربوون بۆ دەرکردنی بڕیاری (٦٦٦) لە (١٩٨٠/٥/٧). ئەم بڕیارە گوزارشتێکی ڕوون و بێ پێچوپەنابوو لە نیازی ڕەگەزپەرستی و ئایدیۆلۆژیای شۆڤێنیستی ڕژێمی بەعس. ئەم بڕیارە دەسەڵاتی دابووە وەزیری ناوخۆ، کە ڕەگەزنامەی عێراقی لە هەموو ئەو هاوڵاتیانە وەربگرێتەوە، ئەگەر دەرکەوت کە دڵسۆزیی بۆ گەل و نیشتمان و ئامانجە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییە باڵاکانی شۆڕش نییە. بێگومان ئەم دەربڕینە ئاماژەیەکی ڕوون بوو، بۆ ئەوەی کە بە ئارەزووی خۆیان چۆنیان بوێت، ئاوەها ڕەگەزنامە لە هاوڵاتیان وەربگرنەوە. لە ئەنجامی ئەم بڕیارەدا بە شێوەیەکی دڕندانە دەستکرا بە جینۆسایدی کوردانی فەیلی و ڕەگەزنامەی عێراقییان لێوەرگیرایەوە و دەستگیرا بەسەر ماڵو سامانی گوێزراوە و نەگوێزراوەیاندا. بەگوێرەی سەرچاوەکان؛ لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٩٨٠-١٩٩٠) نزیکەی (٥٠٠) هەزار بۆ (٦٠٠) هەزار کوردی فەیلی ڕەگەزنامەی عێراقییان لێوەرگیرایەوە و بەکۆمەڵ ڕەوانەی ئێران کران. ئەمە جگە لە بێسەر و شوێنکردنی نزیکەی (٢٠) هەزار گەنج و لاوی کوردانی فەیلی ئەوانەی کە بەندینخانەکانی ئەبو غرێب و نوگرەسەلمان و زیندانەکانی دیکەی عێراق زیندانیکرابوون. (کامل جسان المرایاتی، ٢٠١٢، ص ٤٦٥-٤٦٨). (صلاح الدين انور منصور فيتولي، ٢٠٠٧، ص ١٧٩). (ماجد السورميري، ٢٠٠٩، ص ١٤-١٦). (ئاسۆ جەبار، ٢٠١٦).

هەڵبەتە مەینەتی کوردە فەیلییەکان لێرەدا کۆتایی نایەت و جەورو ستەمی سەریان هەر بەردەوام بووە، چی ئەوانەی لە ناوخۆیی عێراق ماونەوە بە هەرێمی کوردستانیشەوە، یاخود ئەوانەی لە کۆمەڵگا نیشتەجێبووەکانی ئێران بوون، یاخود بۆ وڵاتانی دیکە کۆچیان کرد. ڕووخانی ڕژێمی

بەعس لە ساڵی (٢٠٠٣) و دووبارە بونیادنانەوەی عێراقی نوێ بەجۆرێک لە جۆرەکان مەینەتی کوردە فەیلییەکان کەمبوویەوە، ژمارەیەکی زۆریان گەڕانەوە بۆ عێراق و زێدی خۆیان. لە هەمان کاتدا بەگوێرەی مادەی (١٧) لە یاسای ڕەگەزنامەی عێراقی ساڵی (٢٠٠٦)؛ بڕیاری (٦٦٦)ی (ئەنجومەنی سەرکرادیەتی شۆڕش)ی ڕژێمی بەعس هەڵوشاپەوە. ئەمە هەلێکی باشی بۆ بەشێکی زۆری کوردانی فەیلی ڕەخساند، کە ڕەگەزنامەی عێراقی وەرگرنەوە.

بەگوێرەی توێژینەوەیەکی مەیدانی کۆمسیۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کاروباری پەنابەران لە عێراق کە لە کۆتایی ساڵی (٢٠٢١) دەربارەی حاڵەتەکانی نەبوونی ڕەگەزنامە و مەترسییەکانی نەبوونی لە عێراق لەلای کوردە فەیلییەکان و ئەوانەی ڕەگەزنامەیان نییە (البدون) یاخود کۆچەرییەکان ئەنجامدراوە. ئەوەی تایبەتە بە کوردانی فەیلی؛ لە توێژینەوەکەدا (٥٧٠) خێزانی کوردانی فەیلی (٢٤١٠) کەس) وەک سامپڵی توێژینەوەکە وەرگیراون. (٩٦%) یان ڕەگەزنامەی عێراقییان وەرگرتووەتەوە. تەنها (٤%)یان هێشتا نەبوونەتە خاوەن ڕەگەزنامەی عێراقی. (مركز البيدر للدراسات والتخطيط، ٢٠١٦).

هەروەها بەگوێرەی لێدوانێکی (حيدر ستار مندلاوی) بۆ ئاژانسی (شەفەق نیوز) لە (٢٠٢١/١/١٥) هەموو ئەو کوردە فەیلییانەی لە سەردەمی ڕژێمی پێشوو لە خانەقین و مەندەلی و بەدرە تەرحیلکرابوون، ڕەگەزنامەی عێراقییان وەرگرتووەتەوە (اتهامات تطال الكورد الفيليين في خانقين، ٢٠٢١). هەروەها بەگوێرەی لێدوانی فەرمی حکومەتی فیدراڵی عێراق (٩٧%) کوردانی فەیلی ڕەگەزنامەی عێراقییان وەرگرتووەتەوە، بەڵام هیچ داتاو ئامارێکی فەرمی لەم بارەیەوە نەخستووەتە بەردەست.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشـــدا هێشـــتا پرســـی ســـتەمدیدەیی و مەینەتی کوردانی فەیلی و بێبەشـــبوونیان لە زۆر مـافی هـاوڵاتیبوون مـاوە. بە دانپیدانانی زۆربەی دەســەڵاتداران و سـیاسـییە باڵاکانی عێراق لە هەموو نەتەوە و مەزهەبەکـان هێشـــتـا کوردانی فەیلی مـافی تەواوەتی خۆیـانیـان لە عێراقدا وەرنەگرتووە. بەگوێرەی ڕاپۆرتێکی وەزارەتی دەرەوە و بـازرگـانی حکومەتی ئوســترالیا و نووســینگەی ئەورووپی بۆ پاڵپشتی پەنابەران هێشتا بەشێکی کوردانی فەیلی ڕووبەڕووی زۆر گــرفــت دەبــنەوە، وەک (ئەوانەی ڕەگەزنامەی وەرگرتووەتەوە، ڕەنگی جـیـاوازە، ئەمەش وەک ئـێـرانـی دەریاندەخات، کە ڕەنگە تووشـــی جـیـاکـاری ڕەگەزی و نەژادیـان بکاتەوە، هەروەها بۆ گەڕاندنەوەی موڵک وماڵەکانیان هێشـــتا کۆســـپی گەورە لە بەردەمیـانـدایە، لە هەموو قورســـتر ئەوەیە کە بۆ دەرکردنی ڕەگەزنـامەی عـێراقی پـێویســـتە کوردانی فەیلی بەڵگەنامەی تۆماری ســـاڵی (١٩٥٧)یان هەبێت، ئەمەش کـارێکی ئەســـتەمە، چونکە بەهۆی نەمان و فەوتانی بەشـــێکی زۆر لەو بەڵگەنامانە هێشتا ژمارەیەکی زۆری کوردانی فەیلی ناتوانن ڕەگەزنامەی عێراقی بەدەســـتبهێنن. ســـەرباری ئەمـانە دۆکۆمـینـتـو بەڵگەنـامەی کوردانی فەیلی هێشتا لە بەشی بیانی بەڕێوەبەرایەتی گشـتی ڕەگەزنامەی عێراقی دانراوە). ئەمە جگە لەوەی بەهۆی هەڕەشـــەی تیرۆر و بوونی عەرەبی هاوردە لە شـوێنی کوردانی فەیلیی هێشـتا باجی قورس دەدەن و زۆربەی شـــوێنەکـانی خۆیـانیـان بەجێهێشـــتووە و لە ناوەندی قەزای خانەقین یاخود بەغدا یان هاتوونەتە شـــــارەکـانـی دیـکـەی هەرێـمـی کوردستان.

**سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:**


١ ) شـــو، مـارتـن (٢٠١٧)، الإبـادة الجماعية: مفهومها وجذورها و تطورها وأين حدث، ت: محيي الدين حميدي. المملكة العربية السـعودية الرياض: العبيكان للنشر.

٢ ) جيبســـون، جون أس (١٩٩٩): معجم قانون الانسان العلمي، ت: سمير

عزت نصار. عمان: دانر النسر للنشر والتوزيع.
٣ ) محەمەد، خەلیل ئیسماعیل (١٩٩٨): کوردە فەیلییەکان و خەونی گەڕانەوە بۆ وڵات، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژمارە ٨.
٤ ) محمد، خليل اسماعيل (٢٠١٣): الكرد الفيليون بين حملات التسفير وسياسة التهجير. السليمانية: منشورات مكتبة ماركريت، ، ط٢.
٥ ) العلوي، زكي جعفر الفيلي (٢٠٠٩): تاريخ الكرد الفيليين وآفاق المستقبل: دراسة في الجذور التاريخية والجغرافية ومراحل النضال، بلا اسم ومكان مطبعة.
٦ ) مطر، سليم (٢٠٠٣): جدل الهويات: عرب- اكراد- تركمان- سريان- يزيدية (صراع الانتماءات في العراق والشرق الاوسط). بيروت: المؤسسة العربية للدراسات والنشر، ط١
٧ ) فيلي، رياض جاسم محمد (٢٠٠٨): ثورة ١٤ تموز والزعيم والكرد الفيليين، الحوار المتمدن، العدد (٢٣٣٩) في (٢٠٠٨/٧/١١) منشور علي الرابط الالكتروني
٨ ) الفضل، منذر (٢٠٠٤): دراسات حول القضية الكردية ومستقبل العراق. اربيل: دار ئاراس للطباعة والنشر ، ط٢.
٩ ) مینە، ئەمین قادر (٢٠١٢): ئەمنی ستراتیجی و سێکۆچکەی بەعسیان: تەرحیل- تەعریب- تەبعیس. سلێمانی: لەبڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیرانی (ی.ن.ك).
١٠ ) احمد، طالب جبار (١٩٩٧): الحياة الاجتماعية في المهجر. فرنسا: بنك المعلومات العراقي.
١١ ) الفيلي، ناصر احمد (٢٠١٢): الفيليون: الاصالة التاريخية والمواطنة المهدورة. اربيل: دار ئاراس للطباعة والنشر.
١٢ ) المراياتي، كامل جاسم (٢٠١٢): واقع مشكلات الاثنيات والاقليات في العراق. بغداد: بيت الحكمة.
١٣ ) قيتولي، صلاح الدين انور (٢٠٠٧): "منصور التحليل الجغرافي لسياسة التعريب في قضاء خانقين (دراسة في الجغرافية السياسة)": رسالة ماجستير (منشورة)، كلية العلوم الآنسانية، جامعة السليمانية.
١٤ ) السورةميري، ماجد (٢٠٠٩): محكمة الجنايات العليا ومظلومية الكورد الفيليين، مجلة فيلي، العدد (٤٠).

# یاد ڤاشێم

# ناوەندی جیهانی دیکۆمێنتاری و لێکۆڵینەوە و پەروەردەیی بۆ یادکردنەوەی هۆلۆکۆست

پ.د. ئومێد برزان برزو



سیاسەتی نازییەکان بەرانبەر بە جـــوولەکەکـــان بە کـــردەوەی تیرۆریســـتی و دابڕانی ســـیاســـی و ســـنووردارکردنی ئـابووری و زەوتـــکـــردنـــی مـــافە مـــرۆیـــی و مەدەنییەکان و فشارەکان بە ئامانجی دوورخســـتنەوەیـــان لە ئەڵمـــانیـــا دەســـتپێیکرد، ئەم ســـیاســـەتە بە قـــڕکـــردنـــی نـــزیـــکەی تەواوی جوولەکەکان لە ئەورووپای داگیرکراو کۆتاییهات. ئەم ســـیاســـەتە لەلایەن پـارتی نـازی و دەســـەلاتـدارانی جۆراوجۆری دەوڵەتی ئەڵمادیا و لە ڕێـــگەی ئەو هـــاوکـــاریـــیـــانەوە جێبەجێکرا، کـە لـە لایەن هێزە دژە جوولەکە کانی لایەنگری نازییەوە لە نـاوچەکـانی ئەڵمـانەکـان لـە دووەم جەنگی جیهـانی داگیریـان کردبوو. ئەو وڵاتـانەی بەدەوری ئەڵمـانیـادا دەسوڕانەوە، لەم پرۆسەیەدا ڕۆڵیان هەبوو، چـونکە دوژمـنـایەتی دژە جوولەکە لەو سەردەمەدا لە ڕاستیدا بەهۆی دژە جوولەکەگەرایی نەریتی ســـووتەمەنی بوو، هەرچەنـدە بە شـــێوەیەکی ســـەرەکی بەهۆی دژە جوولەکەگەرایی ڕەگەزپەرســـتـانە بـــوو، کە دڵـــی ئـــایـــدۆلـــۆژیـــای ناســـیۆنالیتی ســـۆســـیالیســـتی بوو، پێیـان وابوو، کە جوولەکەکـان هیچ شوێنێکیان لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا نییە. قۆنـــاغەکـــانی جێبەجێکردنی ســـیـاســـەتی نـازی بە هۆکـاری جۆراوجۆر دیـاریـدەکرا، ئەوانیش پێگەی ســـیاســـی ئەڵمانیای نازی لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، تـا چەنـد کۆمەڵگەی ئەڵمـانیا و گەلانی دیکەی ئەورووپـای داگیرکراو بیروبـاوەڕی نازییان قبوڵکرد، هەروەها هەندێک ڕەچـاوکـردنی ئـابووری جگە لە ڕەوتی شەڕەکە، بەڵام ئەوە عەقیدەی نـازی دژە جـوولەکە بـوو، کە لە شـــیـکاری کۆتـاییدا تەرازووەکەی وەرچەرخـــانـــد و ئەنـــجـــامەکەی قڕکردنی نزیکەی شـــەش ملیۆن جـوولەکە بـوو، کە نـزیـکەی یەک لەســـەر ســـێی گەلی جوولەکەکانە، هۆلۆکۆســـت شـایەتحاڵی نەهێشـتنی ســـەدان و ســـەدان جوولەکە بوو، مەزهەبەکان و کۆچبەران و کۆمەڵگە جوولەکەکـان بە هەموو ســـامـانە ماددی و ڕۆحییەکانیانەوە، لە ڕووی پانتایی و ســـروشـــتەوە گەورەتر دەبن، تاوانێک کە بەدرێژایی مێژووی خۆی بەسەر گەلی جوولەکەدا هات. کاتێک نازییەکان بە ســـەرۆکایەتی ئەدۆلف هیتلەر لە ٣٠ی ژانویەی

١٩٣٣ دەسەڵاتیان لە ئەڵمانیا گرتە دەست، سیاسەتیان بەرامبەر بە جوولەکەکان دوو ئاراستەی گرتەبەر، یەکەمیان هەنگاوی دەستووری فەرمی بوو، کە بە تایبەتی پلانی بۆ دانرابوو بۆ نەهێشتنی بوونی جوولەکەکان لەبەردەم خەڵکدا و... ژیانی کۆمەلایەتی و زەوتکردنیان لە مافەکانیان و هاوولاتیبوون و لەناوبردنیان لە رووی ئابوورییەوە. هەنگاوی دووەم هەڵمەتی بوختان و چەواشەکاری بوو، جگە لە هەراسانکردن و توندوتیژی لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا. ئامانجی هەموو ئەمانە ئەوە بوو، کە جوولەکەکان ناچاربکەن، ئەڵمانیا بەجێبهێڵن.

تەنها دوو مانگ تێپەڕیبوو، تا هێرش بۆ سەر جوولەکەکان لە شەقامە سەرەکییەکانی شارەکانی ئەڵمانیا دەستپێبکات، چونکە ئەندامانی سەربازە زریانەکانی ئەڵمانی ناسراو بە ئاس بە یاوەری جەماوەرێکی وروژێنەر جوولەکەکانیان لە پۆستەکانیان لە کەرتی گشتیدا بە شێوەیەکی جەستەیی دوورخستەوە، بۆ نموونە دادوەرەکە لە هۆڵی دادگاکەیەوە، پارێزەر لە ئۆفیسەکەیەوە، مامۆستا لە ئۆفیسەکەیەوە، قوتابخانەکەی و پزیشکەکە سەبارەت بە شوێنی کارکردنی لە سیستەمی تەندروستیدا دوورخرانەوە. لە ١ی نیسانی ساڵی ١٩٣٣ بایکۆتی ئابووری جوولەکەکانی ئەڵمانی ڕاگەیەندرا، کە لەنێو شتەکانی تردا دانانی پاسەوانی بایکۆت لە بەردەم هەموو دوکانێکی جوولەکە یان دامەزراوەیەکی بازرگانی بۆ ڕێگریکردن لە چوونە ژوورەوەی کڕیارانی ئەڵمانی. بایکۆتەکە بۆ ماوەی یەک ڕۆژ بە فەرمی ڕاگەیەندرا، بەڵام بۆ ماوەیەک بە شێوەیەکی نافەرمی بەردەوام بوو، دواتر بە شێوەیەکی کاتی وەستا بەهۆی کاردانەوەی جیهانییەوە کە لەلایەن جوولەکە و غەیرە جوولەکەکانەوە هاتبوون. لە ٧ی نیسانی ١٩٣٣ یاسایەک دەرچوو، کە بەپێی ئەو یاسایە سەدان جوولەکە لە خزمەتی شارستانی دەرکراون. هەر لەو ساڵەدا ژمارەی خوێندکارە جوولەکەکان لە خوێندنی باڵا کەمکرایەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕێژەی جوولەکەکان لە کۆی

دانیشتووانەکەدا بگونجێت، کە کەمتر بوو لە سەدا یەک، بۆیە زۆر کەمتر بوو لەوەی پێش دەستبەسەرداگرتنی نازییەکان بوو. لە ٢٩ی ئەیلوولی هەمان ساڵدا هونەرمەندانی جوولەکە لە یەکێتی هونەرمەندانی ئەڵمانیا دەرکران و جوولەکەکانیش لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیری دەرکران، لەوانە ڕۆژنامە و سینەما و شانۆ.

**مۆزەخانەی مێژوویی هۆلۆکۆست و بەشەکانی:**



مۆزەخانەی مێژووی هۆلۆکۆست کە دە ساڵێکی خایاند بۆ دروستکردنی، باشترینەکانی ئەزموون و سەرچاوە و پێشانگە پێشکەوتووەکانی یاد ڤاشێم کۆدەکاتەوە، بۆ هێنانی یادەوەری هۆلۆکۆستی جوولەکەکان بۆ ناو سەدەی بیست و یەکەم.

مۆزەخانەی هونەری هۆلۆکۆستی (یاد ڤاشێم) بە گەورەترین و گشتگیرترین کۆمەڵەی هونەری هۆلۆکۆست لە جیهاندا دادەنرێت، کە نزیکەی ١٠ هەزار بەرهەمی هونەری لەخۆدەگرێت، کە زۆربەیان مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ خودی سەردەمی هۆلۆکۆست بە مەبەستی نمایشکردنی ئەم کۆمەڵەیە، بەتایبەتی بەرهەمەکانی سەردەمی هۆلۆکۆست، مۆزەخانەیەکی ناوازە لە جۆری خۆی لەم دواییانەدا دروستکرا، بە پاڵپشتییەکی بەخشندەی لەلایەن (ماری و شێڵدۆن ئیدێلسۆن) لە ئەمریکاوە پێشکەشکرا، دەزانن کە هونەر دیدێکی جیاواز بۆ هۆلۆکۆست دابیندەکات، کە دیدگای تاکە، ئامرازێکە بەتەنها مێشک ناکاتە ئامانج، بەڵکو ڕاستەوخۆ دەچێتە ناو دڵ و دزە دەکاتە ناو دڵەوە.

سەردانیکەری مۆزەخانەی هۆلۆکۆست لەلایەن دیوارێکی کێشراوەوە پێشوازی لێدەکرێت، کە لەسەری هەڵبژاردەکانی کۆمەڵەکە

نمایشکراون کە لەلایەن هونەرمەندەکانی جۆراوجۆرەوە دروستکراون. سەبارەت بە فەزاکانی دیکەی، پێشانگاکە بەپێی بابەتەکان ڕێکخرابوو، تیشکی خستە سەر وێنەی مرۆڤ و دیمەنە سروشتییەکان، لەوانەش دیمەنی گێتۆ و کەمپەکە لە ناوەوە و دەرەوە. شوێنێکی تایبەتی بۆ هونەرمەند (شارلۆتا سۆلۆمۆن و هونەرمەند کارل دۆیچ) تەرخانکرا.

نمایشکردنی داهێنانی هونەری لە سەردەمی هۆلۆکۆستدا نوێنەرایەتی مەترسییەکی بۆ سەر ژیان دەکرد و هونەرمەندان بەرهەمەکانیان لە کەرەستەی نزیکەی نەبوو، لە ماوەیەکی کورتدا و لە چوارچێوەی ژیانێکی زۆر سەختدا بەرهەمدەهێنا. ئەم جۆرە بەرهەمانە ماونەتەوە، بەڵام ئەو هونەرمەندانەی دروستیان کردووە، بەزۆری لە ژیاندا نامێنن.

زۆربەی کارەکان لەسەر پارچە کاغەزێکی تەنک و وردە وردە بەرهەمهێنراون، کە پێویستیان بە چاودێری هەیە، بۆیە پێشانگاکانی مۆزەخانەکە هەمیشە لە نمایشدا نامێننەوە، بەڵکو هەر چەند مانگ جارێک گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، بۆ ئەوەی ئەو کەرەستانە بگەڕێننەوە، کە لەکاتی نمایشکردنیان لە مۆزەخانەکە. ئەم گۆڕانکارییە هەمیشەییە ڕێگە دەدات، ژمارەیەکی زیاتر لە کارە هونەرییەکان لە مۆزەخانەکەدا نمایشبکرێن.

سەردانیکەرانی پێشانگاکە چاوەڕێی ئەزموونێکی ناوازەن، جا لەڕووی بابەتی هۆلۆکۆستەوە بێت، یان لە ڕووی هونەرییەوە، چونکە بەرهەمەکان تەنها بەڵگەنامە نین، بەو پێیەی ئەم پارچە کاغەزانە هێزێکی داهێنەرانە سەرسوڕهێنەر دەردەبڕن لە چرییەکەیدا، وەک چۆن هونەرمەند کە دروستی کردوون، دەیزانی کە ئەوە تاکە دەرفەتێکی دەگمەنە کە هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ داهێنان، لە ڕێگەی ئەو چەند دێرەی کە لەسەر کاغەزەکە کێشرابوو، هەموو ئەو شتانەی کە هەیبوو دەریدەبڕی.

مۆزەخانەی مێژووی هۆلۆکۆست دەکەوێتە سەر ڕووبەرێکی زیاتر لە ٤٢٠٠ مەتر چوارگۆشە، کە زۆربەیان ژێر زەوین. لە یەک کاتدا نێوان زانستەکان و بڕبڕەی دیسیپلینەکانە، گێڕانەوەی هۆلۆکۆست لە ڕوانگەیەکی ناوازەی جوولەکەکانەوە

دەخاتەڕوو، جەخت لەسەر ئەزموونەکانی قوربانییەکان وەک تاکێک دەکاتەوە لە ڕێگەی شوێنەوارە ڕەسەنەکان، شایەتحاڵی ڕزگاربووان و کەلوپەلی کەسییەوە.

پێکهاتە هێڵییەکەی کە شێوەی تیرێکی هەڵگرتووە و درێژییەکەی ١٨٠ مەتر دەبێت، دەچێتە ناو شاخەکەوە تا کۆتاییەکەی بە ڕووناکی ئاسمانییەک کە لە نوکی شاخەکەوە دەردەچێت. لەم کۆریدۆرە تیرئاسایە لق و پۆپی پێشانگاکانن، کە ئاڵۆزی دۆخی جوولەکەکان لەم ساڵە ترسناکانەدا نیشاندەدەن، لە کاتێکدا کونە دەرچوونەکە بە شێوەیەکی سەرنجراکێش لە لای شاخەکەوە دەردەکەوێت، ئەمەش ڕێگە بە دیمەنی دۆڵی دەدات، کە لە خوارەوە درێژ دەبێتەوە. دەوروبەر و پاشخان و فەزاکانی درێژی جیاواز و پلە جیاوازەکانی ڕووناکی تیشکدەخاتە سەر خاڵە سەرەکییەکانی ڕۆمانەکە، کە ڕووداوەکانی یەک لە دوای یەک دەگێڕێتەوە.

یەکێک لە گرنگترین ڕێنماییەکان بۆ دیزاینی مۆزەخانەکە بریتیبوو لە دروستکردنی ڕێگایەک بۆ سەردانیکەر، کە بە پەرەپێدانی ڕۆمانەکە دیاری کرابێت و سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی هەبوو. کۆریدۆرێک لە شێوەی پریزمدا دروستکرا، گەلەرییەکان لە هەردوو لا لقیان کردبووەوە، بە بۆشاییە تێپەڕنەکراوەکان جیاکرابوونەوە، کە بە درێژایی زەوی پریزمەکە درێژدەبنەوە، ئەم بۆشاییانە بەربەستێکی فیزیکی پێکدەهێنن، کە سەردانیکەر ئاراستەی گەلەرییە تەنیشتەکان دەکات و لە هەمان کاتدا کات ڕێگە بە بەرکەوتنی بینراو دەدات بۆ سەردانیکەر بە هەردوو سەری پریزمەکە. بەم شێوەیە پریزم نوێنەرایەتی میحوەرێکی درێژخایەنی یادەوەری مێژوویی دەکات، کە سەردانکەران لە کاتی گواستنەوە لە پێشانگایەکەوە بۆ پێشانگایەکی دیکە و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە دەیبرن. پێشانگاکان کە (شوێنەوارە ڕەسەنەکان، بەڵگەنامە، شایەتحاڵ، فیلم، کتێب، یادەوەری، نامە و کاری هونەرییان) تێدایە، تیشکدەخەنە سەر گێڕانەوەی مرۆیی ناوازەی دانیشتوانی جوولەکەکانی ئەورووپا لەو ساڵە ترسناکانەدا. ئەم بەشە تێڕوانینێکی گشتی بۆ هەر

پێشانگایەک دەخاتەڕوو، لەوانە وەسف و دیمەنەکانی ئەو کارە هونەریانەی کە تێیدا نمایشکراون. مۆزەخانە نوێیەکە نزیکەی ١٠٠ شاشەی ڤیدیۆیی لەخۆدەگرێت، کە شایەتحاڵی ڕزگاربووان و کورتە فیلمی تێدایە.

لە کۆتایی گێڕانەوەی مێژوویی مۆزەخانەکەدا، "هۆڵی ناوەکان" ئاشکرا دەبێت، کە ئەو شوێنەیە کە "بەڵگەنامەی شایەتحاڵی" بۆ ملیۆنان قوربانی هۆلۆکۆستی تێدا دانراوە، هەروەها نوێنەرایەتی شوێنێک دەکات بۆ یادکردنەوەی ئەو کەسانەی لەوێ لەناوچوون. لە "هۆڵی ناوەکانەوە"، سەردانیکەرانی مۆزەخانەکان بەردەوام دەبن لە ڕێگاکەیان تا خاڵی کۆتایی و پاشان بۆ باڵکۆنەکە کە دەڕوانێتە دیمەنێکی پانۆرامای شاری ئۆرشەلیمی قودس. هۆڵی ناوەکان لە یاد ڤاشێم یادگارییەکە بۆ هەموو جوولەکەیەک کە لە هۆلۆکۆستدا لەناوچوون، هەروەها شوێنێکە بۆ یادکردنەوەیان بۆ نەوەکانی داهاتوو. ئەم هۆڵە هۆڵی بازنەیی سەرەکی کۆمەڵەیەکی گشتگیری "بەڵگەنامەی شایەتحاڵی"ی تێدایە، کە کورتە ژیاننامەیەک لە ژیانی هەر قوربانییەکی هۆلۆکۆستە. ژمارەی ئەو بەڵگەنامانەی کە لە کۆگا بازنەییەکەی دەوروبەری لێواری دەرەوەی هۆڵەکەدا هەڵگیراون، نزیکەی دوو ملیۆن بەڵگەنامەیە، بەو پێیەی دەزانن، کە دەتوانێت بەڵگەنامەی لەسەر هەر شەش ملیۆن جوولەکە لەخۆبگرێت، کە لە هۆلۆکۆستدا لەناوچوون. سەقفی هۆڵەکە لە کونێک پێکهاتووە، کە دە مەتر بەرزدەبێتەوە وەک ئەوەی تامەزرۆی گەیشتن بە ئاسمان بێت، کە ٦٠٠ وێنە و پارچە بەڵگەنامەی شایەتحاڵی تێدا نمایشکراون. ئەم نمایشە نوێنەرایەتی بەشێکی کەم لەو شەش ملیۆن پیاو و ژن و منداڵە مردووە دەکات، کە لە هەموو جیهانی جوولەکەکانەوە هاتبوون، کە لەلایەن نازییەکان لەناوچوون. وێنەی قوربانییەکان لە ئاوەکەدا ڕەنگدەداتەوە لەسەر بنەمای گۆچکەیەکی هاوتا کە لەناو بەردەکانی شاخدا هەڵکەندراوە. لە سەرەکەی تری هۆڵەکەدا شاشەیەکی شووشەیی هەڵواسراوە، کە بەڵگەنامەکانی شایەتحاڵی لەسەر پێشاندەدرا و دواتر مرۆڤ دەتوانرا

بچێتە ناو ناوەندێکی کۆمپیوتەرەوە بۆ ئەنجامدانی گەڕانێک لەناو بنکەدراوەی ناوەندی ناوی قوربانیانی هۆلۆکۆست، بە هاوکاری ئەو ستافەی کە کاریان دەکرد لە هۆڵی ناوەکان، هەروەها فۆرمی سپی بۆ بەڵگەنامەی شایەتحاڵی و فۆرمی دیکە بۆ تۆمارکردنی ناوی ڕزگاربووان لەبەردەستی سەردانکەراندایە.

هەروەها بەشێکی تر لە مۆزەخانەکە، کۆشکی پێشانگاکەیە جۆرەها پێشانگای مێژوویی و بابەتی و هونەری لەخۆدەگرێت، پەنجەرەی ناوازە دەکاتە جیهانی دەرەوە و ناوەوەی قوربانیانی هۆلۆکۆست و زیادکردنی دیدگای ناوازە بۆ هەوڵە بەردەوامەکان بۆ تێگەیشتن لە گرنگی هۆلۆکۆست، وەک پێکهاتەیەکی سەرەکی کۆمەڵگەی مۆزەخانەکە، کە ڕووبەرەکەی ٧٠٠ مەتر چوارگۆشەیە، ئەم کۆشکە ڕێگە بە یاد ڤاشێم دەدات پێشانگای گەورەی فرە پسپۆڕی ئەنجامبدات و بەرهەمی هونەری و پەیکەری ئینستێلاسیۆنی گەورە نمایشبکات. لە وتارێکدا کە یاد ڤاشێم سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی ئەڤنەر شالێڤ لە میانی مەراسیمی دەستبەکاربوونی کۆشکەکەدا پێشکەشی کرد، ئاماژەی بەوەدا کە یاد ڤاشێم لە ئێستادا مامەڵە لەگەڵ (تەحەدای سەرەکی چۆنیەتی کردنی یادەوەری هۆلۆکۆست پەیوەندیدار بە گەنجانەوە دەکات... بۆ... بینەرانی ملیۆنان گەنجمان بهێڵینەوە، دەبێت بۆ ئەوەی دینامیکی بین، ئەمەش ئەوەیە کە پێشانگەکانی کۆشکەکە ڕێگەمان پێدەدەن بیکەین).

هەروەها بەشێکی تر لە مۆزەخانەی هۆلۆکۆست (ناوەندی فێربوون)ە، سەردانیکەرانی مۆزەخانەی نوێی مێژووی هۆلۆکۆست پێدەچێت تووشی کۆمەڵێک دووفاقی ئەخلاقی، پەروەردەیی، تیۆلۆژی و فەلسەفی ببنەوە، هەروەها هەندێک پرسی پڕ لە کێشە کە لە تەنها باسکردنی ڕووداوە مێژووییەکان تێدەپەڕن: چۆن گەلێکی خوێندەوار لە ئەورووپای ناوەڕاست لە سەدەی بیستەم ببنە ئەنجامدەری جینۆساید؟ چی هۆلۆکۆست دەکاتە ڕووداوێکی ناوازە؟ چەمکی "چاکە" و "خراپە" لە دوای هۆلۆکۆست چی بەسەر هات؟ چۆن زەبر و زەنگی هۆلۆکۆست سروشتی جیهان و شوناسی

جوولەکە و ئیسرائیلی لەقاڵبدا؟ چۆن دەتوانین یادەوەری هۆلۆکۆست لە مێشکی نەوەکانی داهاتوودا بچەسپێنین؟

بۆیە سەنتەری نوێی فێربوون کە بەهۆی پاڵپشتی بەخشندەی ستیلا و سام سکورا (ئەمریکا) دروستکراوە، یارمەتی سەردانیکەر دەدات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو جۆرە پرس و نیگەرانیانە، بە ڕێنماییکردنیان، بۆ ئەوەی لایەنە جیاوازەکانی ئەم پرسانە لەبەرچاوبگرێت. سەنتەری فێربوون کە بە سەنتەری بەشداریکردن لە پرسە گەورەکانی هۆلۆکۆست ناسراوە، ناوەندێکی زانیاریی کۆمپیوتەریی ئاسایی نییە، بەڵکو بە شێوەیەک داڕێژراوە، کە سەردانیکەر بتوانێت بچێتە گەشتێکی تایبەتی دۆزینەوە. لە دەرگای چوونە ژوورەوەی ناوەند، تیشکێکی ڕووناکی وردەوردە پرسیارەکان دەخاتە سەر ناوەندی زەوییەکە، کە لە دڵۆپە ئاو دەچن، پاشان پرسیارەکان کۆدەبنەوە، بۆ ئەوەی وەک شەپۆلی ئاو دەوری ژوورەکە بدەن، ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەو بیرۆکەیە دەبێت کە تاکە پرسیارێک هیچ نییە، بەڵام دڵۆپێک لە دەریایەکدا، بەڵام توانای دروستکردنی شەپۆل و شەپۆلی پرسیارەکانی تری هەیە لە کاتی جوڵانەوەدا.

سەنتەرەکە لە نێوان ١٠ بۆ ٢٠ پرسیاری بنەڕەتی دەخاتە ڕوو، کە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی جددی و قووڵ هەیە. ناوچەیەک لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕێگە بە گرووپەکان دەدات لە ڕێگەی ژمارەیەکی زۆر لە پێشکەشکردنی ناوەندی میدیایی بخوێنن و باس لە هەندێک لەو پرسیارانە بکەن، کە پەروەردەکارانی ڕاهێنراو لە فاکەڵتی قوتابخانەی نێودەوڵەتی توێژینەوەی هۆلۆکۆست یاوەری دەکەن. بازنەی دەرەوەی دەوروبەری ناوچەی کۆبوونەوەکە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بە کۆمپیوتەر و هێدفۆن تەیار کرابوو، کە ڕێگە بە خوێندنی تاکەکەسی یان دوولایەنە دەدات، کە سەردانیکەر سەیری ئەو بۆچوونانە دەکات و دەبیستێت و دەخوێنێتەوە، کە لە لایەن ڕزگاربووانی هۆلۆکۆست، سەرکردە ڕۆحییەکانەوە سەبارەت بە "پرسە گەورەکان" دەربڕدراون، بیرمەندان، نووسەران، هونەرمەندان، مێژوونووسان و توێژەرانی پێشەنگ. توێژەران بریتین لە مێژوونووسانی

بالای یاد ڤاشێم وەک: پرۆفیسۆر ئیسرائیل گوتمان، پرۆفیسۆر یەهودا باوەر، پرۆفیسۆر دەیڤید بانکەر، پرۆفیسۆر دان میچمان، جگە لە پرۆفیسۆر کریستوفر براونینگ، پرۆفیسۆر ڕائول هیلبێرگ، پرۆفیسۆر ئۆمەر بارتۆڤ، پرۆفیسۆر دەیڤید ئەنگێل، پرۆفیسۆر ئیبەرهارد ییکڵ، پرۆفیسۆر ستیڤن ئاشایم، و پرۆفیسۆر جۆرج بن شۆشان و ئەوانی تریش، بە زانینی ئەوەی کە کۆبوونەوەیەکی لەو شێوەیە بە کلیلی گفتوگۆ و بیرکردنەوەی بەرهەمدار دادەنرێت. بۆ ئەوانەی دەیانەوێت قووڵتر بچنە ناو ئەم پرسانەوە، یاد ڤاشێم بنکەدراوە و ئامرازە پەروەردەییەکان لە ناوەندی فێربووندا دەخاتە بەردەست.

بەشێکی تر لە مۆزەخانەکە (کەنیسە)یە، ئەڤنەر شالیڤ سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری یاد ڤاشێم دەڵێت: "کەنیسەی نوێ لە سەنتەری کەرەستەی بینراوی یاد ڤاشێم شتومەکی پەرستنی جوولەکەکانی کەنیسەکانی ئەورووپا نمایشدەکات". کەنیسەی نوێ، دیزاینی تەلارساز موشێ سەفدییە و دیزاینی ناوەوەی لەلایەن کۆمپانیای تەموزەوە ئەنجامدراوە، شوێنێک دەبێت، کە سەردانیکەران دەتوانن دوعای قەدیش بۆ گیانی قوربانیانی هۆلۆکۆست لە خێزانەکانیان بخوێننەوە، بە تاک یان بە گروپ لە کەشوهەوای کۆمەڵایەتی نوێژبکەن، کە کەنیسەکە ئیلهامبەخشە، ئەم کەنیسەیە وەک یادگارییەک بۆ کەنیسەکانی وێرانبووی ئەورووپی کاردەکات. ژمارەی پێشانگەکانی ناو کەنیسەکە ٣١ تابوتە کە پەرتووکی تەورات و کەرەستەی تری پەرستن و نوێژیان تێدایە، کە لە هەندێک لە کەنیسەی سەرتاسەری ئەورووپادا ماونەتەوە.

هەموو تابوتەکانی تەورات لە ڕۆمانیا هێنراون، بە هاوکاری (پرۆفیسۆر نیکۆلای کاخال) کۆچکردوو، سەرۆکی پێشووی یەکێتی پێکهاتەکانی جوولەکەکان لە ڕۆمانیا و بە پشتیوانی حکومەتی ڕۆمانیا. بەڕێوەبەری مۆزەخانەکان، یەهودی ئینبار و هاڤیڤا بیلد کارمێلی، سەرۆکی کۆڕاتۆری شوێنەوارەکان، بە سەرتاسەری ڕۆمانیادا گەشتیان کرد بۆ گەڕان بەدوای پێداویستییەکانی جوولەکەدا کە

ماوونەتەوە بۆ کۆمەڵگەی جوولەکەکانی ڕۆمانیا، کە یەکێک بوو لە مەزهەبە جوولەکەکانی گەشەسەندوو. لەنێو ئەو شتانەی کە دۆزییانەوە، کەشتییەکی پەرتووکی تەورات هەبوو لە ماڵی هاوڵاتییەکی ڕۆمانیدا، کە وەک دۆلابی جلوبەرگ بەکاری دەهێنا. هەروەها تابوتی پەرتووکەکانی تەوراتیان دۆزیەوە، کە لە کەنیسەی یەکێتی بازرگانانی سێو لە شاری لاسی ڕۆمانی مابووەوە، هەروەها پەردەیەک بۆ تابوتێک لە شاری کلوجەوە دۆزیەوە. سەبارەت بە گرنگترین کەشتی تەورات، ڕووبەرەکەی لە پارلاد دۆزرایەوە. هەروەها کەنیسەی مۆزەخانەکە هەندێک کەلوپەلی پەرستنی لە پۆڵەندا، یۆنان، ترانسنیستریا، ئەڵمانیا و سلۆڤاکیا لەخۆدەگرێت. بۆیە ئاڤنەر شالیڤ وتی: کەنیسەی یاد ڤاشێم وەک یادگاری شوێنە وێرانبووەکانی پەرستنی جوولەکەکانی ئەورووپا دەمێنێتەوە، شایەتحاڵی ئیمان و دەوڵەمەندی بنبڕنەکراوی جیهانی ڕۆحی جوولەکەکانی ئەورووپا و... خواستی نائاسایی گەلی جوولەکە بۆ مانەوە و یادکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەیە”.






کۆتا بەش (سەنتەری کەرەستەی بینراوە)، بەڕێز ئەڤنەر شالیڤ، سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری یاد ڤاشێم دەڵێت: “سەنتەری کەرەستەی بینراو تایبەتە بە کۆکردنەوەی گشتگیرترین کۆمەڵە فیلم لەسەر بابەتی هۆلۆکۆست و ئامانجی سەرەکی ئەم سەنتەرە ئەوەیە کە دروستکردنی پۆرتاڵی پێشەنگ کە زانایان، خوێندکاران، سینەماکاران و خەڵکی گشتی دەتوانن دەستیان بە فیلم بگات، دەربارەی هۆلۆکۆست و بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی کۆمەڵەکە ئەو فیلمانە لەخۆدەگرێت، کە یاد ڤاشێم لە ماوەی ساڵانی

ڕابردوودا خاوەندارێتییان کردووە بۆ بینین و خوێندن. سەنتەری کەرەستەی بینراو نەک تەنها سەرقاڵی کۆکردنەوەی فیلمی زیادە و چارەسەرکردنی کێشەکانی خاوەندارێتی فیزیکییە، بەڵکو گەشەپێدانی بنکەدراوەی زانیاریی وردە لەسەر هەموو ئەو فیلمانەی کە تا ئێستا لەسەر هۆلۆکۆست دروستکراون، هەروەها شایەتحاڵی ڕزگاربووان. ئەم داتابەیسە هەزاران فیلم لەخۆدەگرێت، کە ئیندێکس کراون و زیاتر لە نیوەی ئەم فیلمانە ئێستا دەتوانرێت لە خودی ناوەندەکەدا سەیربکرێت. هەروەها دەتوانن سەیری هەموو ٥٢،٠٠٠ ئیفادەی ڕزگاربووان بکەن، کە لەلایەن دامەزراوەی سندوقی هۆلۆکۆستی USC تۆمارکراون، هەروەها نزیکەی ١٠،٠٠٠ ئیفادەی ڕزگاربووانی هۆلۆکۆست لەلایەن خودی یاد ڤاشێمەوە.

سەردانیکەرانی سەنتەری کەرەستەی بینراو دەتوانن بە کلیکی ماوسێک لەسەر یەکێک لە پەنجا کۆمپیوتەری کەسی سەیری فیلمەکان بکەن، یان بە هەڵبژاردنی بەناوبانگترین فیلمەکان کە لەلایەن ستافی سەنتەرەکەوە پێشنیازکراون، یان بە گەڕان بەدوای فیلمەکاندا بەپێی ژانەر، بابەت، یان پێوەرێکی تایبەتتر. هەروەها فیلمەکانی سەنتەرەکە بەکۆمەڵ لە هۆڵێکی تایبەتمەندا نمایشدەکرێن، کاتێک کۆنفرانس و سیمیناری زانستی و پەروەردەیی لەسەر بابەتی هۆلۆکۆست و سینەما بەڕێوەدەچێت.





بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە:
https://www.yadvashem.org/ar.html?fbclid=IwAR2oC72HXDbrz0nct409zc2IWOMxzRiiAoioSrgezJwLZ4IpIuabxCWow2g_aem_AbmArfUTQJluPVHGazPSNhwya2qmoyfsMYySfiZFUEx5YVuVKD8wu0ht7OjwOaxGw6m045ZQj-3ZAqM-IIWu1hZ2



# مشاهدات و انطباعات أليمة وحزينة داخل معتقل

## ( نقرة السلمان )

رفعت محمد رشيد



في شهر آيار من العام الماضي سافرت وبمعية أعداد كبيرة من ذوي المؤنفلين الى محافظة السماوة أقصى الجنوب العراقي من أجل اقامة مراسيم الذكرى الخامسة والثلاثون لعمليات الابادة الجماعية ضد الشعب الكوردي بمسمى ( عمليات ألأنفال ) بمراحلها الثمان . كان البرنامج المخطط لها ان ننطلق في ساعات الصباح الاولى من مناطق كرميان والتوجه بقافلة كبيرة من ذوي المؤنفلين والاعلاميين والناشطين في مجال الابادة الجماعية وتكون باكورة فعالياتنا اللقاء مع محافظ المثنى والتنسيق معه في اقامة ذلك المراسيم وكذلك تقديم واجب الشكر والتقدير له وللاجهزة الامنية التي تكفلت بحماية القافلة منذ دخولنا حدود محافظة السماوة لحين خروجنا منها في اليوم التالي ،والشطر الثاني من البرنامج كانت التوجه نحو المقابر الجماعية ومعتقل نقرة السلمان الرهيب والتي لايمكن لاي روائي أو قاص ان يكمل كتابة نص لما يختلج في نفوس ذوي المؤنفلين وهم يتلون المشاهد الحزينة والاليمة يوم كانوا معتقلين في زنزانات هذا المعتقل الرهيب نقرة السلمان .

منذ انطلاقنا من مدينة كفري وفي اللحظات الاولى من السفر احسست ان هناك تخبط في جدولة وبرنامج السفر وعدم الالتزام بالوقت المحدد لانطلاقنا نحو الرحلة الاليمة لهذا تأخر انطلاقنا لساعات عديدة كان بالامكان استغلالها في قطع المسافة الطويلة نحو محافظة السماوة ، ناهيك عن كثرة التوقفات العديدة في الطريق الامر الذي أطال موعد وصولنا الى مركز محافظة السماوة بنحو ساعة قبل غروب الشمس ،مع رفع تكبيرة اذان صلاة المغرب خرجنا من مدينة السماوة وتوجهنا نحو الصحراء الممتدة الى مناطق المقابر الجماعية ويالها من رحلة رهيبة ومرعبة في ظلام دامس ، الشعور بالخوف كان يختلج في صدورنا ونحن نستذكر كيف كان السيارات العسكرية و الحافلات تنقل اقربائنا وقد انهكهم التعب والجوع والعطش في تلك المسافات الطويلة نحو المجهول و المصير المأساوي الأبدي ، كنا تستذكر ونحن نرتشف بين الحين وآلاخر المياه المعدنية الباردة ، كيف كان اقربائنا يبكون من العطش دون ان تعطى لهم قطرات من الماء الحار ، كنا نستذكر صياح الاطفال و بكاء الامهات والنساء وهن ودعن ابنائهن و أزواجهن قسرا

في معسكر (طوبزاوا ) بمحافظة كركوك . يا سبحان الله ، هذه الليلة نتوجه الان نحو الصحراء حيث يرقد احبتنا في مقابر جماعية دون ان نعلم في قبر جماعي يرقدون ؟ أضوية السيارات كانت تذكرني بأضوية العجلات العسكرية و الحافلات عند نقل اقاربنا لدفنهم في الحفر العميقة المخصصة لدفنهم بعد اطلاق النار عليهم لتأتي الجرافات بعدها و يكب التراب على اجسادهم المخضبة بالدماء .مرت ست وثلاثون عاما ونحن نعيد الحكاية من جديد عام بعد عام وفصول الحكاية لاتنتهي أبدا مع موت الكثير من شخوص الحكاية الاليمة والتي تسمى ( عمليات الانفال )

**ليلة بين المقابر و آذان كوردي في الصحراء**

حين وصولنا الى المنطقة المحددة كونها مقابر جماعية ، قرر المشرفون على برنامج الرحلة البقاء تلك الليلة بالقرب من المقابر ورفضوا مغادرة المكان وأصروا على البقاء بالقرب من مقابر ذويهم عسى ان تشفي الغليل في قلوبهم بعد خمسة وثلاثون عاما من الفراق القسري لأحبتهم وهاهم يحتضنون قبورهم بدلا من اجسادهم ، كانت المشاهد حزينة ومؤلمة جدا فلا احد يمكنه السيطرة على مشاعر ذوي المؤنفلين وهم يقفون فوق قبور ابنائهم واخوتهم واخواتهم يبكون عليهم بعد بكاء الفراق قبل خمسون وثلاثون عاما ، كانت العزاء الوحيد لذوي الضحايا ومطلبهم ان تشكل لجنة للبحث والكشف للمقابر واعادة الرفاة الى أماكن سكن ذويهم في كوردستان ولكن الذي كان يحز الانفس هو التلكوء الطويل واللامبرر من عدم اعادة الرفاة الذين عثر عليهم في المقبرة الجماعية الاولى القريبة من تلك المقبرة ،قضينا ساعات عديدة بين البكاء والنحيب من النسوة اللواتي لم يتحملن صدمة مشاهدتهن للمقابر فبدأن في بكاء و نحيب هستيري لا يستطيع انسان ذي ضمير حي ان يصف تلك المشاهد والتي نقلها عدسات القنوات الفضائية الكوردية والعراقية ليلتها ، أشعلن الشموع و البعض منهن قرأن القرآن ودعون الله ان يشمل الؤنفلين بواسع مغفرته ، مع اقتراب ألساعة من موعد صلاة الفجر ، صعد شاب كوردي لسطح حافلة ورفع آذان الفجر ليدعونا لأقامة صلاة الفجر جماعة و بأمامة عالم دين كوردي في مشهد كان المجرمون القتلة في السابق ينادون بأنفلة كل ما يتعلق

بالقرويين الكورد كأنهم كفار يستباح سبيهم وغنيمتهم ، بعد الانتهاء من اداء صلاة الفجر جماعة ، رفعنا ايادينا نحو السـماء و دعونا الله ان يشمل ذوينا المؤنفلين بواسع مغفرته و أن يسكنهم فسيح جناته .

**معتقل نقرة السلمان وأكثر من صدمة**

في الطريق نحو معتقل نقرة السـلمان كنت أحسـب الدقائق و الثواني للوصـول الى ذلك المعتقل الرهيب والتي كنت اسمع سـيرتها السيئة والرهيبة منذ عشرات (٣٥) سـنة ، كان يجلس بجانبي عـدد من ذوي المؤنفلين ممن زاروا المعتقل قبل سنوات ماضية ، كنت اسـتمع اليهم عن بعد المسـافة وعن الطرق المتجهة اليها وانقطع كل تخيلاتي عندما لمحت المعتق من بعيد ، حينها انهمر الدموع في أعين معظم من كانوا في حافلتنا ،كانت أعيننا ترنوا لحظة بلحظة نحو المعتقل وكنا نمني النفس لو كنا نمتلك اجنحة للوصـول باقصـى سـرعة الى داخل المعتقل ونلمس روحيا كل بقعة فيها ونستذكر اقاربنا داخل زنزاناتها . وحال نزولنا من الحافلات ، انتظمنا في تجمع ودخلنا سـوية ونحن نرفع اللافتات و صور شهدائنا المؤنفلين وحسننا فعلت ادارة محافظة السـماوة فقد جهزت كل المسـتلزمات البروتوكولية للمراسـيم قبل الموعد لهذا لم نعاني من مشـكلة ترتيبات القامة المراسـيم الا في أخطاء قليلة كان بالامكان تجاوزها لو قام المشرفون على اقامة المراسيم باستشارة المختصين في اللغة العربية لتلافي الاخطاء النحوية في كتابات الملصـقات واللافتات المكتوبة باللغة العربية حتى انني واجهت صـعوبة في فهم والقصـد من تلك الكتابات فما بالك لو قراها شـخص عربي واراد ان يفهم محتوي والقصـد من الكتابة الامر الاخر الذي دونته في سجل ملاحظاتي هي التقصـير في عملية الترجمة من اللغة الكوردية الكوردية الى العربية وبالعكس من اجل تسهيل فهم الحوار و خطابات المشاركون في المراسيم. بعد الانتهاء من المراسيم وعندما تجولنا في قاعات الاعتقال المتتالية من الجهة الشـرقية للمعتقل رأينا العجب و راودنا ألالم وألحسـرة كنت متلفا لرؤية كتابات الضـحايا المؤنفلين وتصـويرها كحالة اثبات وشـهود لفترة اعتقالهم وما كانوا يعانون من العذاب والالم وكنني صدمت كثيرا فقد رأيت تجاوزا كبيرا على كل المشـاهد والدلائل التي ترتبط بذكريات المؤنفلين ، هنالك تجاوزات لا يمكن

تبريرها أو السكوت عنها ، فقد امتلأت جدران القاعات بالمئات من الكتابات الحديثة لكلمات العشق والغرام و باللغة العربية و بمقاييس كبيرة جعلتها تمحوا كل الكتابات التي كانت تشهد للمعتقلين الكورد في سنة ١٩٨٨ ، والاغرب من ذلك رايت في جدران القاعات من الجهة الغربية ان معظم الشعارات و الكتابات التي تمجد الطاغية صدام وزبانيته المجرمة والاشادة بحزب البعث و الجيش العراقي لا تزال باقية كما كانت دون ان تجري عليها تغييرات أو محوها وقمت بتصويرها وتوثيقها عسى ان أتمكن من عرضها على المسؤولين في وزارة شؤون الشهداء والمؤنفلين ، هنالك فجوات كبيرة من أطراف المعتقل يمكن للحيوانات البرية ان تدخل كيفما و متى شاؤوا الى اقبية المعتقل وبالتالي ستزداد معها وساخة اماكن قاعات المعتقل و ينفر منها الزائر لكثرة النفايات والوساخة والروائح الكريهة .

## التجاوز على المقابر المحيطة بالمعتقل

على الجانب ألايسر من المعتقل وعلى بعد مئتي متر ، هناك مقبرة كبيرة تضم رفات المئات من المؤنفلين الكورد ،وبشهادة عدد من اقارب ذوي المؤنفلين انهم كانوا ينقلون جثث الموتى و ينقلونها بعربة حمل يدوية وبمرافقة جندي ويقوم ذوي الميت بعمل حفرة لا تتعدى عمقها ثلاثين او اربعين سنتمتر لدفن الميت ولكن سرعان ما يأتي كلاب سوداء لتنهش بجسد الميت وسط دموع وأسى اقارب المؤنفلين هذه الرواية قالها لي احد المعتقلين في نقرة السلمان وكان حينذاك لايتجاوز عمره ثلاث عشر عاما واليوم عاد لزيارة معتقل نقرة السمان ليروي ايام اعتقاله وأسرته وفي قرارة قلبه أنين والم وهو يستذكر موت عدد من أفراد اسرته الواد تلو الاخر امام عينيه. ومكان المقبرة هي منطقة صخرية جرداء غير صالحة مطلقا للحرث والزراعة الامر الذي ادهشنا ونال من استغرابنا بأننا سمعنا و شاهدنا بأن هناك أشخاص يحاولون العبث بالمقبرة و تحويلها الى مساحات زراعية في تحدي صارخ ودون اية مراعاة لشعور المواطنين الكورد لان تلك المنطقة لا تستطيع اكبر دول العالم تطورا من الناحية التكنولوجية والعلمية تحويلها من منطقة صخرية جرداء جافة الى منطقة زراعية فكيف بفلاح يمتلك جرارة زراعية ويحلم بتحويلها الى مساحات خضراء

؟ ولكي يمنع ذلـك الفلاح من المضـــي في محاولته ، عرضـواعليه مبلغا من المال لكي لا يعبـث بـالمقبرة لـمدة من الزمن عســى ان يتدارك المســؤوولين خطورة ذلك الموقف ، واســـتغربت كثيرا من ذلك الموقف لم ذلك الاصــرار على حراثة منطة صــخرية ان لم يكن في الامر قصد اخر. تلك المقبرة لم يزرها اي فريق من الوزارات المعنيــة بـالامر و لم يقوموا يتســيجها خشــية العبث فيها وتغيير ملامحها وهذه نقطة ســـلبية نؤشـــر عليها لعدم تدراكها رغم مضـي عشـرون عاما على تغيير النظام البعثي الصدامي .

## صلاة الغائب بين اقبية معتقل نقرة السلمان

ونحن نشـــد الخطى للرحيل ومغادرة معتقل نقرة السلمان تشير الساعة الى منتصف النهار وحانت صلاة الظهر وقام الجميع بأداء صلاة الظهر والعصر جمعا بسبب مستلزمات السفر والعودة الى منطقة كرميان دون ان يبســـط الظلام بســـاطـه ونحن على طريق العودة تجنبا لكافة احتمالات الســـفر ومع ذلك لم ننسى ان نصلي صلاة الغائب لاروح ضحايانا المؤنفلين في يوم كـانوا معتقلين بين أقبيـة تلك الزنـزانات وهم لا يـستطيعون أداء صلاة













أو القيام بركن من أركان الاســلام لنعلن معا ونثبت للجميع ما أجمل الرســالة الكوردية والتي قدمناها داخل معتقل نقرة الســلمان ،

قبل خمس وثلاثون عاما جعلونا في صورة الكافر الذي يستباح غنيمته وتناسوا ان في كل قرية مسجد و في كل منزل هنالك قران و سجادة للصلاة ، قبل خمس و ثلاثون عاما مضت لم يسمح لذوينا المؤنفلين ان يسبغوا الوضوء لاقامة صلاة واحدة ، بل لميسمح لهم بتلاوة الشهادتين قبل اطلاق النار عليهم ودفنهم في المقابر الجماعية ، ولكن ذوي الضحايا اقاموا الصلوات الجماعية طيلة يومين متتاليين غير مبالين بعناء مشقة السفر وعدم وجود مياه كافية للوضوء واثبتوا ان اطلاق سورة الانفال على عمليات الابادة ما هي الا تبرير لساديتهم الوحشية في القتل والارهاب .

**وزارة شؤون الشهداء والمؤنفلين و مناشدات غير مجدية**

بعد عودتنا من حافظة السماوة ، وفي يوم (١٧ آيار ٢٠٢٣) بادرت بالاتصال الى سكرتير وزير شؤون الشهداء و المؤنفلين من أجل تحديد لقاء مع الوزير(عبدالله الحاج محمود) لغرض مناقشة تلك الامور والانطباعات التي شاهدتها في معتقل نقرة السلمان و أماكن المقابر الجماعية والانتقادات الكثيرة التي وجهت لوزارة شؤون الشهداء والمؤنفلين ولكن بعد انتظار اكثر من ثلاث أشهر استلمت ردا غير مقنع من قبل سكرتير الوزير وأبلغني ما معناه ان الوزير ليس راغبا في مقابلتي ومناقشة الامور التي ذكرتها لسكرتيره الشخصي واقفل الموضوع تماما ، وأنا اتساءل ومتى يبادر الوزير الى الاسراع بالاتصال والتعاون مع الجهات ذات العلاقة بالامر في الحكومة المركزية في بغداد لمنع التجاوز و التشويه في معتقل نقرة السلمان والمقبرة الجماعية المحيطة بالمعتقل ؟ الى متى لا يبادر الوزير بتشكيل لجان خاصة لزيارة المعتقل وأماكن المقابر الجماعية والاتصال والتعاون مع الادارات المحلية في محافظة السماوة وقضاء السلمان للاهتمام بالمعتقل وحمايته من اية أعمال تشويه وتجاوز على جدران قاعات الزنزانات ؟ الى متى لايشكل لجان مشتركة مع الجهات ذات العلاقة بالامر لتحديد أماكن بقية المقابر الجماعية في محافظة السماوة والمناطق الاخرى ؟ للاسف كل تلك الاستفسارات تنصدم بحقيقة مرة وهي ان القائمين بشؤون الوزارة ليسوا على اهلية المسؤولية الحقيقية والادارية للقيام بتلك الامور نتيجة عدم تخصصهم في ذلك الجانب المصيري من التأريخ المأساوي للشعب الكوردي.





# "کوڕم بگەرە فریای خوشکەکانت لە گەرمیان ئەنفالە !!"

فەخرەدین گەرمیانی

ئوستراليا

٢٠٢٤/٣/١٧

له ســـــاڵی ١٩٨٣ بەهۆی هەڵاتنم له ڕیزەکانی ســـــوپای عێراق، که ئەو کاته له ڕۆژهەڵاتی بەســـره بووم، له هەمـان کـاتـدا فەرمـانبەر بووم له پەیمـانگەی تەکنیکیی له کەرکووک، له کـارەکەم دەرکرام، لەبەر ئەوەی چـیـتر نەمــدەتوانی له کەرکووک بمێنمەوە، مـاڵومنداڵم پێچـایەوە ڕۆیشـــتم بەرەو شــاری هەولێری سەربەرز و لانەی گەرمی به سۆزیی ســەدان هەزار ئاوارەی کەرکووک و گەرمیـان، هەرچەنـده به دەســـت مەفـــرەزەکـــانـــی (ئەمـــن و ئیســـتخباراتەوە(١) ژیانمان ببووە ژەهری مـار و کون بەکون و کۆڵان بەکۆڵان به دوای خەڵکدا دەگەڕان، بەڵام زۆر له کەرکووک باشـــتربوو، هەر هـیـچ نەبێـت له هەولێر زۆر نـاســـیـارم نەبوو، هەروهـا خەڵکی بەشـــەرەفی شــاری هەولێر تا بۆیان کرابا، داڵدەیان ئەدایت نەک خەبەر یان زمانت لیدەن و به گرتنت بدەن. بەهەر حــاڵێـک بێـت، هەولێر له کەرکووک زۆر بـاشـــتربوو بۆ من لەبەر: یەکەم/ نـاســـــنـامەیەکـی پەیمـانگەی تەکنیکیی کەرکووکم هەبوو، که پێشتر که فەرمانبەر بووم و کـارم دەکرد، ئیتر به زانـایی

برادەرێکم مێژووی ناسنامەکەی بۆم چاککرد و گۆڕی، به جورێک که هیچ کەس شـک نەکات، که ناســنامەکەم کۆنه! دووەم/ هەر له منـاڵـیـیەوە مووی ســـەرم پاک وەک لۆکه سـپی بـوو، ئەوە زۆر بـاش بـوو، که مەفرەزەکان تەمـاشـــای ســـەرو ســـیمـایـان دەکردم، هەرگیز به خەیاڵیاندا نەدەهات، که من سەربازی ڕاکردوو بم، بەو جۆره له هەولێر ترســـی گرتنم نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی هـیـچ دەرامەتـم نەبـوو و کەســـیشـــم بەچـاکی له هەولێر نەدەنـاســـی و بـاری ژیـانم زۆر نالەبارو قورس بوو، چونکه ئەو کاته خاوەن سـێ منداڵی سـاواش بووین، ڕۆژ تا ئێواره دەســووڕامەوە، بەڵکو کارێکم دەستبکەوێت و تۆزێک باری ئابووریم ڕاســت بێتەوە، تاکو توانیم کــارێـکـی بـچـووک پەیـدابکەم له دوکـانێکی دیکۆرات، ئەویش لای مامۆسـتای بەڕێز فوئاد چەخماخچی "دیکۆراتی ئـارین " مـاڵی ئـاوابێـت، کارێکی ئاســـانی دامێ و بەو بابەته بژی و مەمره ژیـانم له هەولێر بەڕێدەکرد. لای کاک فوئاد ماوەی ٣ ســاڵێک مامەوە، ئەوە بووە هۆی که برادەرو دۆســـتێکی یەکجار زۆر له

هەولێر پەیدابکەم، ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ئەوەنەی برادەری خۆشەویست و چاکم لە هەولێر هەیە، نیو ئەوەنەم لە کەرکووک نییە، چونکە ماوەی ١٣ ساڵی تەواو لە هەولێری خۆشەویست ژیام و تا ماویشم چاکەی هەولێرم پێنادرێتەوە، هەرچەندە خزمەتێکی بەدڵ و بەگیانم پێشکەشکردن بۆ ماوەی شەش ساڵی تەواو، کە کارمەندیی ناوخۆیی یەکەمی رێکخراوی خۆراکی جیهانیی WFP سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان(٢) بووم لە هەولێر، بەڵام هەرگیز ئەوە ناکاتە بەشێکی بچووکی میهرەبانیی خەڵکی بەشەرەفی شاری هەولێر. بەهەر حاڵ با بگەڕێمەوە سەر بابەتەکە، لە ساڵی ١٩٨٧ ئوتێلی "قەسر زەهەبی" کۆشکە زێڕینەی کاک فاتح ئاڵتونچی(٣) کە خەڵکی کەرکووکە، لە هەولێر دروستکرا، بە حوکمی ئەوەی کە ناسیاوی خزمەکانی کەرکووکم بوو، خوالێخۆشبوو "شێخ حەسیب شێخ ئیسماعیل بەرزنجی" لە رێگەی کاک حەسیبەوە کاک فاتح ئاڵتونچی کردمیی بە بەڕێوەبەری بەشی پێشوازیی "ئیستقبال" لە ئوتێلەکەی، بەهۆی ئەوەی کە زمانی ئینگلیزیم بە چاکی ئەزانی و هەروەها شارەزایی تەواوم لە ئامێری گەیاندنیی تەلیکس هەبوو، بەراستی من (بەشی گەیاندنی تەلیکسی زانکۆی سلێمانیم) لە ساڵی ١٩٧٨ دامەزراند، پاش ئەوەی بە یەکەمی ئێراق لە پەیمانگەی تەل و بێتەلی لە بەغدا دەرچووم، ئیتر بەتەواوی باری ژیانم بەرەو باشی دەڕۆیشت و مووچەکەم بەچاکی بەشی دەکرد، ماڵی باوکم هەر لە قادرکەرەم بوو لە گەرمیان، بەهیچ جۆرێک نەمدەوێرا سەردانی ماڵی باوکم لە قادرکەرەم بکەم، چونکە دەبووایە بە کەرکووکدا تێپەڕم بۆ قادرکەرەم، ئەوەش بۆ من بڤە بوو، بۆیە هەر ئەوان دەهاتن بۆ هەولێر بۆ سەردانی ئێمە، رۆژی ٠٨-٠٤-١٩٨٨ وەک رۆژانی دیکە لە ئۆتێل بووم، کە بینیم، پیاوێکی پیری (کەواو سەڵتە ٤) لەبەری گەرمیانی خۆی کرد بە ئوتێلەکەدا و لە یەکێک لەو کارمەندە "میسری"یانەی کە لە ئوتێلەکەدا زۆربوون، بە کوردی پرسیاری لێکرد و گوتی من هاتووم بۆ لای کاک فەخرەدین گەرمیانی؟ کە گوێم لێبوو، یەکسەر فەرمووم لێکرد و گوتم خاڵە گیان فەرموو من فەخرەدینم؟ ئیتر بێئەوەی هیچ بڵێت

لێوەکانی تەتەڵەی ئەکرد و بە قورگی پڕ لە گریـانەوە ئەوەنەی بۆ کرا، گوتی کاکە گیان فەرموو ئەم نامەیە لە باوکتەوە "حاجی نەسـرەدین"ەوە بۆ تۆم هێناوە، دەستی کردە گیرفانی بەربـاخەڵی سـەڵتەکەیا و پـارچە مقەبایەکی پاکەتی جگەرەی بەغدادی دەرهێنا و دایە دەسـتم، کە تەماشـام کرد بە خەتێکی درشـت نووسـراوە ((کورِم بگەرە فریای خوشکەکانت لە گەرمیان ئەنفالە))، ئیتر ئەژنۆم شـکا و گەرووم وشـک بوو، هەر ئەوەنەم بۆ کرا لە تەنیشت ئەو پیاوە دانیشم، پرسـیم خاڵە گیان مەسـەلە چییە؟ وتی کاکە گیان لەو گەرمیانە ڕۆژی حەشرە، مەگەر ئەو خوایە ڕەحمکات، ئەگەر نـا ئەوە لەو گەرمیـانە کەس نامێنێت و (داڵەوازمان (٥) لێئەوڕێت، خۆ دێهـات نەمـا، مەڕومـاڵات نەمـا، ناموسـمان نەما، گشـتی وەدەسـت عـارەب و جـاشـەوە زیرەی تیَ!!! ئەوەنەی تر تێکشـکام لەبەر عەیبە و شـەرم نەبووایە، بە دەنگێکی بەرز دەسـتم ئەکردە گریان و باوکەڕۆ، بەڵام خۆم گرت و لێم پرسـی خاڵە نـاوت چییە و خەڵکی کـام دێی؟ فەرمووی ناوم سـەید ئەحمەدە و خەڵکی دێی "چاڵەودوانەم (٦)" تۆ من ناناسـیت، بەڵام برادەر و دوسـتی نزیکی باوکتم، ئەوجا بیرم کەوتەوە، خۆ من هەر هیچ نەبێت، با پەرداخە ئاوێک و چایەک بدەمە ئەم میوانەم، کەوتمە گفتوگۆ لە گەڵ سەید ئەحمەد و پرسـیم خـاڵە بـاسـێکی ئەو ڕووداوەم بـۆ بکە، خـاڵە ئەحمەد فرمێسک بە چاوانیەوە نەدەوەستا و بەسـەر ڕیشـە سـپی و ڕوومەتە هەڵپڕوکـاوەکەیـدا دەهـاتە خوارێ، خێرا خێرا بە لفکەی جەمەدانییەکەی فرمێسـکەکانی دەسـڕی، بەڵام هەر فریـاش نەدەکەوت، بە دەنگێکی کزو لەرزۆکەوە گوتی، کورِم گویَ بگرە، (بـان جەبـاری و هەردەی زەنگنە و ناوچەی شـێخان و بناری گل (٧) پەیتا پەیتا زیلو ئیڤای عەسـکەری بارئەکەن، لە خەڵکی ئەو دێهاتانە بە ژن و منـاڵ و کـچی عـازەویش کەسـیش نـازانیَ بۆ کویَ؟ دار هەڵـدەی وە عەرز نـاکەویَ لەبەر جەیش و جاش، ئەوەی لە دەسـت عەسـکەر نەجاتی بێت، جاشـەکە تەسـلیمیـان ئەکـات، بـڕۆ لەو قـادرکەرەمە لەبەر جەیش و جـاش ڕێت نییە، ئەو زاڵم باوکەش کە ناوی بـارقە (٨) لە قـادرکەرەمە و کەس نـاوێرێت بێژێت لەل لە بەردەمیا و

ئەو عـالەمەیـان برد، جـاریّ خۆ هەرچۆنیـک بیّـت زەلام قەینـاکە ، قورەکە ئەوەیە عـافرەتیش ئەوەن کەس نازانیّت چییان وەسەر تیّت؟؟؟ ئـای چیمـان وەســـەرهـات؟ چۆن شـــەرەف و ناموســـمان با بردی وەدەست عارەب و جاشەوە؟ بەدەم قســـەکـردنـی زاراوەی نـاوچەی گەرمیانەوە لیّوەکانی خۆی دەکرۆژی و بە حەسرەتەوە وەک شۆڕەبی لیّو چەمـی بـاســـەرە بەدەنە لاواز و وشـــکەکەی دەلەرزی، قومیّکی لە ئاوەکە خواردەوە، بەلاّم پیالە چایەکە سـارد بووەوە و نەیخواردەوە، گوتم خالە ئەی مالّ و مندالّەکانت لە کویّن؟ بریا ئەو پرســـیارەم نەکردایە!! دایە پرمەی گریـان و گوتی لە خۆم و کوڕەزایەکی مندالّی ٩ سـالاّن کەسـم بـۆ دەرنەچـووە، دەســـتـی کـردە گیّڕانەوەی ڕووداوەکە بەم چەشنە... ڕۆژیّک پیّشـــتر کە خەبەرمان زانیی ئەنفالە، ئیتر کەوتینە تەقەلای ئەوەی تە نیـا ژن و منـدالّ ڕزگـارکە ین، ئەوەبوو زۆربەی خیّزانەکان ریّگەی قـادرکەرەمیـان گرتەبەر، چـونکە ئەوەی دەرفەت بـیّـت نەمـابـوو، خـیّـزانەکەی مـنـیـش کە هەردوو کوڕەکەم و سـیّ کچ عازەب و ژن و منـدالّەکـانی هەردوو کوڕەکەم کە پیّکهـاتبوون لە ١٧ کەس لە بەین قادرکەرەم و چالّەوددووانە تووشـــی مەفرەزەی جاش هاتن و گشـــتییان دەستگیرکران و ڕۆیشتن، تەنیا وەک وتم کوڕەزایەکم لەلا مـابوو، ئیتر کەسـم بۆ دەرنەچووە، سـەد خۆزگە خۆیشـــم لە گەلّیان بوومایە، من بە ملشکاوم چوزانم ئاوامان وەسەرتیّت ؟

گوتم خالّە دەفەرموو با بچینە مالّی ئیّمە نزیکە، میوانم بە تا بزانین چۆن ئەبیّت، فەرمووی خـالّە گیـان خەمی منت نەبیّت، من خزمم لە بنەســـلاّوە زۆرە، تۆ برۆ فریـای بـاوکـت و مالّەوەتان بکەوە لە قادرکەرەم، ئیتر سـەید ئەحمەد هەسـتا و خواحافیزی کرد لیّم و ڕۆیشـــت. ســـەر دونیام لیّهـاتە یەک، نەمـدەزانی چیبکەم !! چۆن یەکەم جـار دانیشـــتبووم لە جیّگەی خۆم نەمدەتوانی ڕاستببمەوە ؟ دەسـت و قاچم سـڕبوون، هەسـتم ئەکرد سـەرمامە و هیّلّنجم دەهات و خەریک بوو برشـــیّمەوە، خیّرا لەو پەرداخە ئاوەی کە بۆ سەید ئەحمەدم هیّنابوو، نەیخواردەوە، هەندیّ ئاوم پـرژانە ســـەروچـاوم، کـریّـکـارە میســـرییەکە هەسـتی کرد، کە تەواو

نیم خێرا خێرا دەیپرسی ( خێر حەسەڵ ئێ؟ ئەنتە عەییان ؟(٩) واتە خێرە چ ڕوویداوە ؟ تۆ نەخۆشی ؟ لەم کاتەدا بوو کاک فاتح ئاڵتونچی خاوەن ئوتێلەکە هاتە ژوورەوە، کە تەماشای کردم، یەکسەر هاتە لام و پرسی چ ڕوویداوە؟ پارچە پاکتەکەی کە بۆم هاتبوو دامە دەستی، کە تەماشای کرد، یەکسەر لە مەسەلەکە گەیشت و دەستی کردە دڵنەوایم و گوتی کاکەگیان یەکجار بەو دەرەجەیەش نییە، خۆت وا سەغڵەت کردووە، لە وەڵامدا گوتم کاک فاتح تۆ زۆر باش دەزانیت، کە باوکم لە من زیاتر کوڕی نییە و خاوەن حەوت خوشکم! ئەگەر باوکم نەکەوتبێتە حاڵەتێکی زۆر نالەبار و خراپەوە، دڵی نایەت بە دوای مندا بنێرێت؟ ئەو زۆر باش ئەزانێت، من بگیرێم، ئیتر ڕزگاربوونم نییە، ئەگەر باوکم لەوپەڕی بێ ئومێدیی نەبێت، ژیانی من ناخاتە خەتەرەوە، بۆیە هانای بۆ من هێناوە، دیارە خۆی هیچی پێناکرێت، دەبێت هەر ئێستا بڕۆم بۆ قادرکەرەم، کاک فاتح گوتی ئاخر براگیان بەم ئاخر زەمانە چۆن دەرەچیت تۆ فیراری عەسکەریت، تۆ چۆن ئەگەیتە قادرکەرەم؟ گوتم ئەگەر زانیومە سەریشم تیدا بچێت، هەر ئەبێت بڕۆم...

کە زانی فایدەی نییە، دەستیی کردە گیرفانیا و سەفتەیەک گەورەی دە دیناری و پێنج دیناری دایە دەستم و گوتی پارە لەم ڕۆژە ڕەشەدا بەکەڵک دێت، لەگەڵ خۆتدا بیبە، ماڵی ئاوابێت، بەڕاستی ئەو پارەیە بە کەڵکم هات ... خێرا چوومە ماڵەوە و بە خێزانەکەم گوت، کە بە کوێ ئەچم، هەرچەند هەوڵی لەگەڵمدا، کە ئەگەر بڕۆم، دەرناچم و ئەگیرێم، گوێم لێنەگرت و بەرەو کەرکووک ڕۆیشتم، لەبەر ئەوەی ئەنفال هەموو ناوچەی گەرمیانی گرتبووەوە، لە بازگەکان پرسیاریان نەدەکرد، بەعس و ئەمن و هەموو حکومەت نەشئەی سەرکەوتنیان لە ئەنفال وایلێکردبوون، کە بازگەکان ئەوەنە توند نەبن، چونکە ئەیانزانی چ حەشرێکە بە کورد دەیکەن، گەیشتمە کەرکووک و چوومە گەرەکی شورجە، تاکو بتوانم ئوتۆمبیلێک پەیداکەم، بڕوات بەرەو قادرکەرەم، بە هەر کەسێکم ئەوت ئەچم بۆ قادرکەرەم، ئەیوت کورە ئەوە تۆ هاربووی یان شێت؟ کەس هەیە، خۆی بە دەستی خۆی بڕواتە

بەردەستــــی دوژمنەکەی؟ ئـیتـر خەریکبوو شـــێت بم، گوێم لێبوو، کەسێک لە پشتەوە بانگم ئەکات، کە ئاوڕم دایەوە، تەماشـــام کرد، کاک شـــێخ لەتیف شـــێخ ئیبراهیمە، پاش چاک و خۆشی پرسی ئەوە لێرە چی ئەکەی؟ گوتم کـاک لەتیف ئەمەوێ بچم بۆ قادرکەرەم، بەڵام ســـەیارەم دەسـت ناکەوێ؟ گوتی باشــە لەگەڵ ئێمە وەرە وا باوکیشـــم لە گەڵمانایە ئەچین بۆ قادرکەرەم، لە خۆشـــییا نەمزانی چیبکەم، ئەوەش لەبەر دوو هۆ بوو، یەکەم کاک شـــێخ ئیبراهیم شـــێخێکی گەورە و هەموو کەس ڕێـزی دەگـرێ و تـاکـو زۆربەی عەرەبەکـانیش نـاوبـانگی دەزانن و ڕێزی دەگرن، ئەمەش بۆ من زۆر چاکە و ترســی گرتنم نابێت، دووەم کەس ناتوانێت ڕێگە لە شـێخ بگرێت، واتا بەئاســـانی دەگەمە قادرکەرەم... لەگەڵ کاک لەتیف و کاک شێخ برایم ســـواری ســـەیارە بووین و بەرەو ڕێـگـای لەیـلان لە کەرکـووکەوە دەرچووین، لە ڕێگـا تـاکو گونـدی مامشە هیچ نەبوو، بەڵام کە گەیشتینە نزیک گوندی (زەردە و عەلی مستەفا (١٠)، ئیتر لەوێوە حەشـــر دەســـتی پێکرد، ئەو ناوە لەبەر جاش و جەیش دیـارنەبوو، هەرچی گرد و دۆڵ و جـادە هەیە لەبەر دەبـابە و ئیـڤـا و ســـەیارەی هەمەجۆری جاش ڕێگات نەبوو، دەشـــت و دەر هەمووی گیرابوو، کاک شێخ برایم بە دەنگێکی خەمـاوی هەر دوعـای ئەکـرد و دەیگـوت ئەی خـوایە ئەمە قبـووڵ نەکەی، ئەم زوڵـمە لە ڕادەبەدەرە، کەی ئینســـان بەم دەرەجەیە ئەبێ زاڵم بێت، لە پەنجەرەی سەیارەکەوە من تەمـاشـــام ئەکرد، لەبەر چاوم دارو بەرد ئەگـریـا، گـوڵاڵەی ئەو بەهارە سـیس و ژاکاو بوون، هەموو شتێک لەبەر چاوم ڕەش هەڵگەڕابوو، جـاشـــەکـانم وەک بەراز دەهـاتنە بەرچـاو، بەهەرحـاڵ پێش نیوەڕۆ گەیشـتمە ماڵی باوکم، تەماشـام کرد، نە جـێـگـە هەیە و نە ڕێـگـە لەبەر خزمانی قەڵامکایل کە هەموو یان لە مـاڵی ئێمە بوون، بەتـایبەت مـاڵی هەموو پوورەکـانم کە لە قەڵامکـایل هەڵاتبوون بۆ قادرکەرەم، بەڵام تەنیا کچ و ژنەکـان لەوێ بوون، کەوتمە پرسیاری پوورزاکانم پرسیاری هەر کامیانم کرد، گوتیان هەموو پێکەوە سـواری ئیڤا کران و نازانین بۆ کوێ چوون، هەندێک ئەڵێن بۆ ســـلێمانی یان کەرکووک یان چەمچەماڵ، ئیتر

بەڕاستی کەس نەیزانی هەموویان ڕاپێچی تۆپزاوەی کەرکووک کراون، هەندێک لە پوورەکانم جارناجارێک بە خێرایی دەرئەچووە دەرەوە و تەماشای ڕێگای کەرکووکی ئەکرد و ئەیوت ڕەنگە بۆ ئەم ئێوارەیە بگەڕێنەوە؟ کە پرسیم چۆن ئەگەڕێنەوە، لە وەڵامدا ئەیانوت موستەشارەکان (جاشەکان) پەیمانیان داوە کە ئەیانکەن بە جاش و بەریان ئەدەن، لە ڕاستیدا جاشەکان بە فەرمانی ئاغاکانیان بەو گەنجانەیان گوتبوو، ئەوەی چەکی نییە، دەبێت چەکێک پەیدابکات، ئەوجا خۆی تەسلیم بکات، ئەگەرنا ئێمە وەریان ناگرین لای خۆمان، ئەم پیلانە تەنیا بۆ ئەوە بوو کە هەر هەموویان بە پێشمەرگە لە قەڵەمبدەن و بڵێن ئێمە پێشمەرگەمان گرتووە... لەگەڵ باوکما دانیشتم و پرسیم باوەگیان چیبکەین؟ لە وەڵامدا گوتی کوڕم بەس خوشکەکانت و دایکتم بۆ ڕزگاربکەیت، من هەرچۆنێک بێت، ئەتوانم دەرباززبم، گوتم کام ڕێگە ئاسانترە؟ لێرەوە بۆ کەرکووک لە ڕێگەی لەیلانەوە یان لە ڕێگەی دووزەوە؟ باوکم گوتی لە ڕێگەی دووزەوە باشترە، هەندێک خێزانمان بەڕێکرد لە دووزەوە ڕزگاریان بووە، بەڵام گەورەترین گرفت ئەوەیە سەیارە نییە، تەنیا لۆری عارەب هەیە، ئەوانیش هاتوون مەڕوماڵاتی تاڵانی یان هەرزانفرۆش ئەبەن، بەڵام لە ناویانا پیاوی باشیش هەیە، کە تا ئێستا چەندین خێزانی کوردی دەربازکردووە، ئەگەر بەیانی یەکێک لەوانەمان دەستکەوێت، ئەوە ئەتوانین ماڵی خۆمان و ماڵی پوورەکانت بە لۆرییەک دەربازبکەین، من خۆیشم تەوەکەل بەخوا لەگەڵیان ئەڕۆم، بەڵام پێویستمان بە پارەیەکی زۆرە و من خۆم ئەو پارەیەم نییە، گوتم باوە لە پارە مەترسە، من پارەیەکی باشم هێناوە، ها ئەوەتا هەموویت با لا بێت و لۆرییەکە داوای چەندی کرد، بیدەرێ، گرنگ ئەوەیە ئەو ژن و کچانە نەکەونە دەستی ئەو بێشەرەفانە، قەیناکە خۆیشت لە گەڵیانا برۆ، بەڵام نەکەی لە کەرکووک ڕاوەستی، چونکە لە کەرکووک ئەمن ماڵ بە ماڵ ئەسوڕێتەوە و بە کوردەکان ئەڵێن نابێت، هیچ کەسێک بگرنە خۆتان، ئەگەرنا ئێوەش لە گەڵیاندا ڕاپێچی زیندان ئەکرێن، ئێوە یەکسەر برۆن بۆ هەولێر، من لەگەڵ کاک لەتیف لە

هەمان ڕێگاوە ئەگەڕێمەوە بۆ کەرکووک، لەوێشەوە بۆ هەولێر لە من مەترسە دەرباز ئەبم، پاشان باوکم گوتی کوڕم بەخوا فریامان نەکەوتیتایە، ئێمە ڕۆیشتبووین، چونکە لەم ڕۆژە ڕەشەدا کێ هەیە، دینارێک بداتە کەس، خۆ من ئەمزانی تۆ وەزعت چۆنە، بەڵام کەسی ترم نییە، تاکو هانای بۆ بەرم لە خواو تۆ زیاتر، من ڕۆحم لە مشتمابوو، لە ترسا نەوەک لەو ڕێگایە شتێکت بەسەر بێت.. گوتم بابە گیان دڵت هیچ نەکات، ئێوە سبەی دەرچن، بەڵام نەکەن چاوەڕوانی من بکەن، یەکسەر بچن بۆ هەولێر بۆ ماڵی ئێمە. بۆ سبەی بەیانی زوو باوکم لۆریەکی پەیداکرد، لۆریەکە پڕی بوو لە مەڕ و بزن و مانگا، بەڵام ئەوەنە جێگەی هەبوو، کە ماڵی پوورم و ماڵی ئێمە بتوانن بڕۆن، ئەوانم بەڕێکرد و خۆیشم لەگەڵ کاک لەتیف بەرەو کەرکووک بەڕێکەوتین، ئێمە دەرنگێک گەیشتینە کەرکووک، لە شۆرجە خەبەرم زانی، کە ماڵی باوکم بە سەلامەتی گەیشتوون و ڕۆیشتوون بۆ هەولێر، ئەوجا هۆشم هاتەوە سەرخۆم و هەستم کرد برسیمە ٣ ڕۆژ بوو، هیچم نەخواردبوو، نەک لەبەر ئەوەی خواردن نەبێت، بەڵکو هیچم بۆ نەدەخورا لە جگەرە و ئاو زیاتر...

بۆ سبەی گەڕامەوە هەولێر، پوورم فەریدە کە ٣ کوڕی هەبوو، هەرسێکیان گیرابوون، لە گریان زیاتر هیچی تری نەدەکرد، تاکو ئەوەنە گریا هەردوو چاوی کوێر بوو، ئیستاشی لەگەڵدا بێت، کە بە تەنیا مایەوە لە ئوردوگای شۆڕش لە چەمچەماڵ و هەر چاوەڕوانی هاتنەوەی (ڕەئوف و وهاب و لەتیف)ی کوڕی دەکرد ، تاکو مردیش هەر دەیوت دێنەوە...

من هەرچۆنێک بوو، توانیم هەر ٧ خوشکەکانم و ژمارەیەک لە کچە پوورزاکانم ڕزگارکەم، بەڵام لەولاوە بە دەیان هەزار خوشکی کوردی دیکەم گیرۆدەی چنگی ڕەشی ئەنفال بوون ...

........................................................

١.ئەو مەفرەزانە پێکهاتبوون لە ئەمن و ئیستخبارات و جاش، خەڵکی هەولێر بە وانەیان دەگوت "مشتەرەکە"

٢. ماوەی ٦ ساڵ لە هەولێر کارمەندی یەکەمی ئەو ڕێکخراوە بووم، لە ڕێگەی ئەو ڕێکخراوە کە خۆراکی بە دەست بوو توانیم خزمەتێکی باشی خەڵکی بەوەفای هەولێر بکەم ، بەڵام وەک گوتم هەرگیز

ناگاتە بەشـــێکی زۆر کەم لە میهرەبانی خەڵکی هەولێر.

٣. کاک فاتح ئاڵتونچی پیاوێکی دەســـت و دڵپاک بوو، هەمیشە بۆ یارمەتیی دۆست و برادەر ئـامـادە بوو بەتـایبەتی لە کـاتی تەنگـانەدا، ئێســـتـا هەر لە کەرکووکە و خەریکی زێڕینگەرییە کە پیشـــەی تایبەتی خۆیەتی.

٤. کەواو سـەڵتە، زۆربەی خەڵکی گەرمیان بەتایبەت پیرەکان یان کەواو ســـەڵتە یان کەواو چاکەت لەبەرئەکەن.

٥. داڵەوازمان لێئەبرن، بە زاراوەی ناوچەی گەرمیان واتا تاکمان لێناهێڵن، هەموومان ئەکوژن، یان بێسەرو شوێنمان دەکەن.

٦. چـاڵەودووانە، گونـدێکی بچووکی ٢٠ مـاڵەیە دەکەوێتە باشـــووری ڕۆژهەڵاتی قـادرکەرەم بە پێ مـاوەی ٢ کـاتژمێرێـک دوورە لە قادرکەرەمەوە.

٧. ناوچەکانی جەباری، زەنگنە، شـــێخان، بنـاری گـل، ژمـارەی دێهاتەکـانی ٩٦ دێ بوون، هەمووی ئەنفالکرا، تەنیـا یەک دێ چییە نەما و بەعس تەختیانی کرد.

٨. بـارق: مەخســـەدی لە ژەنەراڵ بـارق عەبـدوڵا بـوو، کە ســـەرپەرشـــتـیـی ئۆپەراســـیۆنی ئەنفالی ناوچەی گەرمیانی دەکرد و تـاکو شــــەڕی دووەمی کەنـداو (داگیرکردنی کوێت) خۆشەویستی سەددام بوو، بەڵام پاش شــــەڕی کوێت دۆڕاندنی ســـەددام لەو شـــەڕە ، بارق بە دەســـتی سەددام کوژراو سەگتۆپ کرا.

٩. ژمــارەیکی زۆر لە عەرەبی میســـر هــاتبوونە عێراق و لە هەموو شــــارو شارۆچکەیەکی وڵاتەکە میسری لێبوو.

١٠. زەردەو عەلی مســـتەفا، دوو گوندی نزیکن لە یەکتر چەنـد کیلۆمەترێـک لە قادرکەرەم دوورن و مۆڵگەیەکی جاشەکان نزیک گوندی زەردە بوو لەســـەر ڕێگای قادرکەرەم.



# ڕەحمە یاوەر ...

# لە زێدی خۆمانەوە بۆ زیندان

سیروان سلێمان



**دیباچە:**

ڕەحمە یاوەر محەمەد سەرحەد لە ساڵی (١٩٧١) لە گوندی کانیمارانی سەر بە ناوچەی گەرمیان لە خێزانێکی جوتیار هاتووەتە ئامێزی ژیانەوە، بە کاری کشتوکاڵی بە چاندنی گەنم و جۆ و خزمەتکردنی ئاژەڵداری خجڵی ژیان بوون، لە نێو گوندێکی خنجیلانە لەگەڵ خەڵکی دێنشین پێکەوە ژیانێکی سادە و جوتیارانەیان بەڕێدەکرد، لە بەرەبەیانی گوند هەر ماڵێک بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری خۆی دەڕۆیشت، لە یاڵە بەرزەکانی گوندەوە بنواڕی بە نێو پانۆرامایی خەڵکی دێنشیندا، درامایەکی تایبەتی سروشتی دەبینی، لە نێو هونەرمەندە بەتواناکانی دونیادا ناتوانێت سیناریستێک لەو دیمەنە دڵڕفین و جوانە بنووسێت، ڕژێمی عێراقی بە تاوانی کوردبوون و خزمەتکردنی هێزەکانی پێشمەرگە لە ناوچە ڕزگارکراوەکانی ژێر قەڵەمڕەوی هێزەکانی پێشمەرگە لە نێو شاڵاوی سێی ئەنفالی گەرمیاندا لە دوازدە قۆڵەوە هێرشی سەربازی و ئاسمانی کردە سەر گوندنشینەکان و خەڵکەکەی ئەنفالکرد و گوندەکانی ڕووخاند، لەم دیمانە تایبەتەدا سەرنجتان بۆ نێو خێزانێکی ئەنفالکراو ڕادەکێشم، کە لە (١١) کەسی پێکهاتبوون و دوو برای شوان بوو لەو دەشت و دەرە و ئەوانیتر لە نێو زیندانەکانی ڕژێمی ئەفلەقی خۆیان بینیەوە، باوکی لە قۆرەتوو لێیان دابڕێندرا و ئەنفالکرا و دوو برای لە نوگرەسەلمان مردن و خۆی و دایکی و سێ خوشکی و برایەکی بۆ ماوەی سێ مانگ لە دوبز و چوار مانگ و نیو لە زیندانی نوگرەسەلمان مانەوە.

**گوندی کانیماران:**

گوندی کانیماران لە باکوور هاوسنوورە لەگەڵ ناحیەی سەرقەڵا، قەزای کفری، ئیدارەی گەرمیان لە باشووری کوردستان، ئەم گوندە یەکێکە لەو گوندانە وەک هەزاران گوندی تر بەر شاڵاوی ئەنفال دەکەوێت، لە نێو شاڵاوەکانی ئەنفال نغرۆی هێرش و پەلاماری سوپای عێراق بووەتەوە، بەدەر لەوە جاش و خۆفرۆشەکانی کورد بوونە چاوساغی هێزەکانی سوپای عێراق، سوپای عێراق لە نیوەی شەودا دەستیانکردە تەقەکردن و تۆپ تەقاندن، بۆیە خەڵکەکەش لە چەمی

قووتەکەوە بە ماڵ و منداڵ بە تراکتۆر بەرەو گوندی سماق کەوتنەڕێ. لە گوندی سماقیشەوە بەرەو گوندی تەپەسەوز ڕۆیشتن، بەدەم خەو و ئاە و ناڵە و گریانەوە ملی ڕێگیانگرتەبەر تا گەیشتنە گوندی قەڵاقۆچاڵی، بە ترس و لەرز و برسێتی و تینێیتی شەوێک لە گوندی قەڵاقۆچاڵی مانەوە.

**گوندی ملەسوورە:**

سوپای عێراق خەڵکەکەیان بەرەو گوندی ملەسوورە برد، لە گوندی ملەسوورە بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێک مانەوە، ئەو خەڵکەی لەوێندەرێ کۆبوونەوە، خەڵکی ناوچەکانی قەرەداغ و سماق و تەپەسپی و کانیماران و درۆزنەکان و ...تاد لە ماوەی ئەو شەو و ڕۆژەدا لەگەڵ خەڵکەکە کرانەوە و زۆربەیان بوونە ناسیاوی یەکتری و یەکیان دەناسی، خەڵک بە باوش نانیان دەهێنا، بۆ ئەو خەڵکەکە بیخوات، هەرچەندە خەڵک لە نێو ترس و لەرز و لە هەولێ ماڵ و منداڵدا گەدەی بەسترا و نانی بۆ نەدەخورا، لەو سەردەمی ئەنفال و مەینەتی و داماویدا باران وەک دەمی کوندە دەهاتە خوارەوە، خەڵکەکە خۆیانکردە نێو گەوڕ و خانووەکاندا، خێزان خێزان لە شوێنێک لە ناچاریدا خۆی گرمۆڵەکە کردبوو، جەیش و جاش کەوتنە ئەو خەڵکە و هەموویان کۆکردەوە بە زلە و شەق و پاڵنانەوە، نزیکەی (١٥ بۆ٢٠) زیل هاتن و خەڵکەکەیان بارکرد، زیلەکانیش زۆر بەرزبوون، منداڵەکان نەیاندەتوانی سەربکەون، دایک و باوکیان یارمەتیان دەدا، تا سەردەکەوتن، خەڵکی کانیماران هەشت بۆ هەشت نۆ ماڵێ سواری یەک زیل بوون، بۆئەوەی لەیەکتر دانەبڕێن، هەر کەسێک دەنگەدەنگ و قسەی بکردبا، بە کێبڵ و شەق و زلە بێدەنگیان دەکرد، کاتێک خەڵکەکە سواری زیلکرا نزیکەی (٦ بۆ ٧) سەربازی عێراقی بە چەک و تاخمەوە لە نێو زیلەکە پاسەوانیان بوون، بۆئەوەی خەڵک لە دەستیان ڕانەکات، تا گەیشتنە زیندانی قۆرەتوو.

**زیندانی قۆرەتوو:**

قۆرەتوو کەمپی کۆکردنەوەی ئەنفالکراوەکانی گەرمیان بوو، کە لە نێو گۆڕەپانێکی گەورەی زەوی هەموو خەڵکەکەیان کۆکردەوە، خەڵکەکەیان کردە دوو بەشەوە، ژن و پیاو لە یەکتر جیاکرانەوە، هەر

خێزانێک لە نێو خۆیدا کۆبووەوە، ژن و پیاو لەیەکتر دادەبڕێت، یاوەر باوکی ڕەحمە پێش دەستپێکردنی پرۆسەی ئەنفال کۆمەڵێک حەیوانی فرۆشتبوو، بڕی (٨٠٠) دینار چاپی سویسری پێبوو، دەستیکردە گیرفانی و زۆرینەی پارەی داوە خێزانی بەناوی (ئاڵتون)، بۆئەوەی بتوانێت بۆ منداڵەکانی خەرجی بکات.

**هەڵوێستی شێخ حسێن هەزارکانی لە زیندانی قۆرەتوو:**

لە نێو زیندانی قۆرەتوو لە تەنیشت ماڵ شێخ حسێن هەزارکانی بەیەکەوە بوون، یاوەر وتی: منیش لەگەڵ شێخ حسێن هەزارکانی بۆ هەر کوێیەک بڕوات، منیش بۆ هەمان ئاراستە دەڕۆم، لەسەر زیندانی قۆرەتوو فڕۆکەیەک هاتە خوارەوە و بانگی شێخ حسێن هەزارکانیان کرد، وتی: خۆت و چەند ماڵت لەگەڵدایە، وەرە بە فڕۆکە دەبرێیت و ئازاددەکرێیت، شێخ حسێن هەزارکانی وتی: من لەگەڵ عام یان عام لەگەڵ من، دوای ئەوە نەگەیشتن بە ڕێکەوتن و فڕۆکەکە هەڵسا و گەڕایەوە. لە نێو زیندانی قۆرەتوو ئەوەندە خەڵک کۆکرابووەوە، چەندین خەڵک لەیەکتر بزربوون، دوای ئەوە یاوەر گەڕایەوە و وتی: بەخوا دەستمان لەبەر و دواتان بڕا و لەگەڵ پیاوەکان برا و ئەنفالکراو و ئیتر نەبینرایەوە!. بەرەو مەغریب دەڕۆیشت، لایەکی مەنشئەی سپی و شەکەری داخراویان هێنا، خەڵکیان سوارکرد و نیوەی خەڵکی کانیماران لە نێو ئەو ئۆتۆمبێلە داخراوە جێگایان کرایەوە، بە ڕێگەیەکی دوور و درێژ بردیانن، دوای ڕێکردنێکی زۆر تا گەیشتن بە زیندانی دوبز.

**زیندانی دوبز:**

لەگەڵ گەیشتنی ئەو خەڵکە بە دوبز، بووە چی هەرا و هۆسە و قاڵەقاڵێک و کەس لە کەس نەبوو؟ وەک ڕۆژی قیامەتی لێهاتبوو! لەوێندەری ژن و منداڵ و گەنج و پیرەکان لەیەکتر جیاکرانەوە، چەندین گەنج لە دایک و باوکیان دابڕێنراون، شێت بوون، لەلایەن سەربازەکانەوە بەسترابوونەوە، بۆ ماوەی سێ مانگ لە زیندانی دوبز مانەوە، لە نێو حەشامەتی خەڵکدا چەندین نەخۆشی وەک: گرانەتا، حەمەماڵتا، سکچوون و لەرزوتا لە نێو خەڵکدا بڵاوبووەوە، بەبێ ئەوەی دکتۆرێک بێت، لە دوبز بەیانیان نیسک و دوو سەمون و ئێواران شۆربایی گۆشتێکی بێتام بە

ماعکەرۆنی لە نێو سندوقە فیشک بۆ خواردن پێیان دەدرا، بەڵام ئاو و ئاودەستی بوو، خێزانێکی هەشت کەسی سندوقە فیشەکی خواردنیان بۆ یەک ڕۆژ پێدەدان، دوبز شوێنی باشتر و فراوانتر بوو لە زیندانی نوگرەسەلمان، دایکی ڕەحمە منداڵێکی چلەداری بوو، ئەو منداڵە ناوی (سەرباز) بوو، کەلوپەل و شتی پێ نەبوو، پارچە پەڕۆی بچوک بچوکی دەدۆزییەوە و لە نێو زیندانەکە بە تەلەدرک دەورە درابوو، چوار دەوری سەرباز بوو، سەربازەکانی عێراق بە ئاڵتونیان دەوت: ئەو پەڕۆ تەڕانە بۆ منداڵەکان شۆردبووی و هەڵیدەخست، بۆ ئەوەی وشک بێتەوە، پێت بزانن یان بتبینن خراپت بەسەر دەهێنن، خێزانێکی هەشت کەسی یەک بەتانییان پێبوو، بۆ ژێر و سەرەوە پشوویان پێدەدا، لەگەڵ ئەویشدا خەڵکێکی زۆر دەمردن، سەرەڕای ئەوە لە زیندان بوون، خەڵک هەواڵی لە قەزای کەلارەوە دەگەیشت بە نێو زیندان، کە خەڵکی دێیەکان بەشێکیان لە کەلار و سمود نیشتەجێبوون، دوای ئەوە مەنشەئەی داخراوی سەربازیان هێنا و لە کاتژمێر (٤)ی بەیانی خەڵکەکە خرایە ناوی، شەو و ڕۆژی نەبوو، ناوەکەی تاریک لە سەرەوە شوێنی هەواگۆڕکێ بوو، بە ڕێگەیەکی دوور و درێژ تەپ و تۆزی دونیای کردبوو، یەک دوو سەربازیش لە نێو مەنشەئەکە دانیشتبوون، بەڵام خەڵکەکەی ناوی بێهەواڵبوون لە دەرەوە چی ڕوودەدات؟! هەر کەسێک دەنگەدەنگ یان قاڵەقاڵی دروستبکات، لەو مەنشئەوە فڕێ دەدرایە خوارەوە، بۆ کەسێک دەوێرا قسە لە دەمیەوە دەربچێت، بۆ ماوەی (١٦) کاتژمێر مەنشەئەی داخراوەکان بەڕێگاوەبوون، تا گەیشتنە بیابانێکی لم و چۆڵ و هۆڵ، بینایەکی تێدا بوو بەناوی زیندانی نوگرەسەلمان.

**زیندانی نوگرەسەلمان:**

دوای بڕینی ئەو ڕێگە دوور و درێژە، زۆر ماندووبوون لەبری پێشوازی بۆ نێو زیندانی نوگرەسەلمان لەسەر دەروازەی سەرەکی (ویل ــ سقر) نووسرابوو، سێ مەنشئەی داخراوی سەربازی دەچووە ژوورەوە، هەموو خەڵکەکەیان لە قاوشەکانەوە کۆکردەوە، هەرکەس هەوڵیدەدا، ئەوەی خێزانی خۆی لە شوێنێک



دابنێت، حەجاج بەڕێوەبەری زیندانەکە بوو.

**حەجاج بەڕێوەبەری زیندانی نوگرەسەلمان:**

حەجاج پیاوێکی بالابەرز و سپی و جوان بوو و عەگالێکی ناوە سەرییەوە، جووتێک ناعلی لەپێکردبوو، قەمچیەکی بە دەستەوە بوو، لە قاتی دووەمی زیندانەکە دادەنیشت، هەرکاتێک بهاتایەتە خوارەوە بە قەمچیەکەی دەستیەوە فەلاقەیدەکرد، لە بەیانی تا ئێوارە چەندین منداڵ و کچ و ژن لە ژێر لێدانی قەمچیەکانی حەجاج مردن، ژنێک بەناوی (حەنیفە) خەڵکی فەتاح هۆمەر زمانی عەرەبی دەزانی، ئالتون وتی: بلێ حەجاج منداڵەکەم برسیەتی، بەڵکو هەندێک خواردنمان پێبدات، حەنیفە وتی: قسە مەکە، سوێند بەخوا داوای هەرچی لێبکەیت، بە قەمچی دەتکوژێت. ئەو برە پارەی پێیان بوو، لە ڕێگەی حەمەخولە خەڵکی عەزیز قادر و ڕەشید غیدان خەڵکی گوندی گامەخەڵ دوکانیان لە نێو زیندانەکە دانابوو، شت و مەکەکانیان بریتیبوو لە: برنج و گۆشتی قووتوو و ماسی و ...تاد، دوو برای منداڵی ڕەحمە یەکیان بەناوی (سەرباز) چلەدار و ئەویتریان بەناوی (نەبەز) حەوت ساڵ تەمەنی بوو، زۆر برسیان بوو، سەرباز داوای گۆشت و تەماتەی کرد و ڕۆیشتن لە هەڵەبجەییەکیان مێوژ و گوێزیان دەکڕی، دوای شەو

و ڕۆژێک بەهۆی ڕشانەوە و سکچوون زۆر کاریگەری دروستکردبوو، منداڵەکانیش لاوازبوون و بەرگەی نەخۆشییەکەیان نەگرت و هەردووکیان لە زیندان مردن، مامە عەودە لەگەڵ ئالتون ڕۆیشت بۆ ناشتنی کورەکانیان بۆ هەڵکەندنی چاڵ و پاڵی پێوەناوە، بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟ مامە عەودە وتی: گوناحن و باوکیان لێرە نییە. شێخ ساڵەحی سماق پیاوێکی قەڵەوبوو، بە ستونێکەوە لە دواوە هەردوو دەستی بەستەوە و بە قەمچی لێیدا، تا مرد، دوای مردنی بە شەق لە تەرمەکەی دەدا. ئەسمەر حاجی هۆمەر سماق کچێکی مرد و دایک هێرۆی حەمە کچێکی مرد و میمکە نارنج خەڵکی گوندی پەلەوشکە مرد، نوگرەسەلمان دوو دەرگای بوو، یەکیان دەرگای سەرەکی بوو، خەڵک دەهاتە ژوورەوە و ئەویتریان ئەو خەڵکەکە زۆر دەمردن لە دەرگاکەکەی تر دەیانبردە دەرەوە، هەندێ چاڵیان دەکرد و تەرمەکەیان دەشارەوە، دوای ئەوە سەگە ڕەش تەرمەکانی دەرهێنا و لە گۆشتی مرۆڤی کورد مربوو. بڵابوونەوەی نەخۆشی لە نێو زیندانی نوگرەسەلمان بە تەنکەر ئاوی سوێری پیس پڕ لە قژەسەر و پشقل و پووش و پڵاشەوە بوو، وەرگرتنی ئاوەکەیش بە نۆرە بوو، هەر کەسێک لە ڕیزەکە دەربچێت، بە کێبڵ و قەمچی لێدەدرا، دوای وەرگرتنی ئاوە سوێرە ناخۆشەکە پاکیاندەکردەوە، دەخورایەوە، لە ڕێگەی ئەو ئاوەپیسەوە نەخۆشی تەنگی لە خەڵک هەڵچنیبوو، بە هەزاران خەڵک نەخۆشکەوتن و مردن، پێدانی دوو دانە سەمونی ڕەقی تاڵی کۆن بۆ یەک کەس دەکوترا و دەیانکردن ناو ئاودا و بەناچاری دەخورا.

**ئەنفالکردنی هەڵەبجەییەکان:**

دوای هێنانی خەڵکی هەڵەبجە یەک ریز قاوشیان گرتبوو، چەکی کیمیاوی بەریان کەوتبوو، زیاتر لە ( ١٥ ـــ ٢٠) ئۆتۆمبیلی سەربازی خەڵکیان دەهێنا، هەندێکیان کوێربوون، هەندێکیان بە پیریەوە دەکەوتنە سەر زەوی دەمردن، هەندێکیان قەڵەبوون بەرگەیان نەدەگرت و دەمردن و تەرمەکانیان لەسەر شۆستە و شەقامەکان کەوتبوون و بە عەرەبانەی دەستی

فرێدەدرانە دەرەوەی زیندانەکە، بە دزییەوە لە قاوشەکانەوە سەیری هەڵەبجەییەکانیان دەکرد، بەڵام لە ژێر کەواکەی دایکیدا خۆیان دەشاردەوە و نەیاندەوێرا بجولێنەوە.

**زیندانیکردنی زیندانییەکان لە نێو زیندان:**

کۆمەڵێک کچ ژمارەیان پێنج و شەش کەس بوون، خێڵی رەشید فەتی لە گوندی بنەکە و چەند ماڵێکیتر داوای خواردن و ئاویان لە حەجاج کرد، هەموویان برد لە ژوورێک لە تەنیشت ژوورەکەی حەجاج لە نێو زیندانەکەدا زیندانیان کردن، لە ژوورێکی داخراو کەس هەواڵی لێ نەپرسیبوون تا بەیانی، دوای شەو و رۆژێک هەموویان ئازادکردن و گەڕانەوە بۆ نێو قاوشەکان، دوای ئازادبوونیان لە نوگرەسەلمان هەموویان شوویانکرد و خێزانیان پێکەوەنا.

**ئازادکردنیان لە نوگرەسەلمان:**

دوای ناونووسین، خەڵکەکەیان کرد بە قافڵە قافڵە و ئاگاداردەکرانەوە لەو رۆژە ئازاددەکرێن، بەڵام نەیاندەزانی بۆ کوێ دەبرێن؟ خێزانەکەیان کەوتە کۆتا قافڵەوە ( ٨ - ٩) ئۆتۆمبیل بەیەکەوە بە رێدەخران، ئیتر ناگەڕێنەوە بۆ زیندانی نوگرەسەلمان، بۆ ماوەی چوار مانگ و پازدە رۆژ مانەوە، دوای برانەوە بۆ سەماوە و شەو و رۆژێک مانەوە، خزمەتێکی باشیان پێشکەشکردن، خەڵکی کانیماران لە خۆشیدا دەگەڕێنەوە بۆ نێو ماڵ و باوک و برا و کەس و کار و شوێنی خۆیان سەرچۆپیانگرت و



هەڵدەپەڕین، لە سەماوە بەڵگەنامەیەکیان پێدان بەناوی (عدم التعرز)، ناوی خۆی و ژمارەی منداڵەکان تێدا نووسرابوو، ئاڵتون ئەو بەتانییەی لە سەماوە فرێدا، کە لە قۆرەتوو و دوبز و نوگرەسەلمان بردیان بۆ تۆپ زاوا زۆر پیسبووبوو بەهۆی ڕشانەوە و نەخۆشییەوە، سواری ئۆتۆمبیل کران تا گەیشتنە ناوی شاری سلێمانی.

**شاری سلێمانی لە پێشوازی ئەنفالکراوەکانی نوگرەسەلمان:**

خەڵکی شاری سلێمانی هەواڵیان پێگەیشتبوو لە سەماوە ئەنفالکراوەکان بە نێو شاری سلێمانی دێنەوە، لەسەر جادەکان لە پێشوازی گەرمی ئەنفالکراوەکاندا بوون، بە عەلاگە سەمونی گەرمیان بۆ دەهاویشتن بۆ نێو پاسەکان، بۆئەوەی خزمەتی ئەنفالکراوەکان بکەن، ئەو ڕۆژە ڕۆڵێکی جوان و شایستەی پڕ لە کوردایەتی و مرۆڤدۆستی خۆیان پیشاندا، لە کاتێکدا پاسەکان لەسەر ڕۆیشتنی خۆیان بەردەوام بوون، ئەنفالکراوەکان گەیشتنە سنووری سلێمانی، خەڵکەکە چاو و گوێیان کرایەوە، شوێنەکانیان دەناسیەوە، تا گەیشتنە قەزای کەلار، لە قەزای کەلارەوە بۆ ناحیەی سمود لە گۆڕەپانێکی چۆڵ بەرامبەر بارەگای کۆمیتەی ڕێکخستنی ڕزگاری حیزبی شیوعی ئێستا لە نێو تەلبەندێک هەموویان کۆکرانەوە و دوو کەس لەسەر کورسیێک دانیشتبوون، ناویان دەخوێندەوە، ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەیان و خەڵکی سمود لە چوار دەوریان کۆببوونەوە، هەر کەس دەهاتە پیری کەس و کاری خۆیەوە، مامێکی ڕەحمە بەناوی (ئەحمەد) بردیانی بۆ ماڵیان خۆیان، لەگەڵ ئەو دوو کوڕەی شوان بوون و ئەنفال نەکراوبوون، بەیەک شادبوونەوە، هەر سێ ڕۆژ لە ماڵێک میوانداری دەکران و تا هاتنەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆیان، دواتر خانووێکیان بە کرێگرت، لە (١١) کەس تەنیا (٨)یان مانەوە، کە دەستیان بە ژیان کردەوە و لە ئامێزی کەسوکاریان شادبوونەوە.

• چاوپێکەوتن لەگەڵ خاتوو (ڕەحمە یاوەر محەمەد سەرحەد) خەڵکی گوندی کانیماران سەر بە ناوچەی گەرمیان لە ڕێکەوتی (٢٠٢٤/٣/١٥).

تـاوانی ئەنفـال یەکێکە لە تـاوانە کۆمەڵکوژییەکـان کە بەرامبەر گەلی کورد لە سـاڵی ١٩٨٨ ئەنجامدرا، کە بریتیبوو لە وێرانکردنی هەزاران گوندو ڕاگواسـتنی زۆرەملێی خەڵک و لیکجیاکردنەوەی دایک و منداڵ و چەنـدین تـاوانی تر، کە دواجـار بە کوشـتن و زیندەبەچاڵکردنی زیاتر لە (١٨٢٠٠٠) مرۆڤی بێتـاوانی کورد کۆتاییهات.

سـەرەتای دەسـتپێکردنی تاوانی ئەنفال بە دانانی ( علی حسـن مجید) دەستپێدەکات بە بەرپرسی سەربازی لە کوردسـتـان بە بڕیاری ژمـارە (١٦٠) لە بەرواری (١٩٨٧/٣/٢٩)، دوابەدوای ئەوە نـاوبراو بڕیـاری ژمـارە (٤٠٠٨) لە (١٩٨٧/٦/٢٠) دەرکـرد کە دەکـرێ بە بـڕیـاری جینۆسایدی گەلی کورد دابنرێت.

**ئەنفال و جینۆساید:**

دەتـوانـیـن تـاوانـی ئەنـفـال بە جینۆسـایدی کورد ناوببەین، چونکە هەروەک دەزانین جینۆسـایـد لە ڕووی زمـانەوانییەوە بە مـانـای لەنـاوبـردنـی ڕەگەزی گەل و نەتەوەیەک دێت، ئەم مـانـایەش لە تـاوانی ئەنفـالـدا ڕەنگیـداوەتەوە ، پاشـان بەپێی چەندین دەق و بنەمای یاسـایی نیودەوڵەتی ئەنفال تاوانی جینۆسـایدە، لەوانە مادەی (٢ و٣) لە (ڕێـکـەوتـنـامەی قەدەغەکـردنـی جینۆسـایـد ١٩٤٨)، و مادەی (٣) لە (ڕێککەوتنـامەی ژنێـف ١٩٤٩) و مـادەی (٦) لە دەسـتوری (داگـای تاوانکاری نیودەوڵەتی ١٩٩٨).

سـەرەڕای بوونی ئەو بنەمـا یاسـاییانە، بەڵام تا ئێسـتا کۆمەڵگای نـێـودوڵەتـی لە ئـاسـت بەجینۆسـایدناسـاندنی ئەم تاوانەدا بـێـدەنـگ بـووە، ئەمەش مـانـای کەمـتەرخەمـی ڕێـکـخـراوی نەتەوەیەکگرتووەکانە بەرامبەر گەلی کورد لە نـاسـانـدنی ئەنفـال وەک تاوانێکی جینۆسـایـد، هەوەک چۆن لەکـاتی ئەنجـامـدانی ئەم تـاوانەدا بێـدەنـگ و بێهەڵوێـسـت بوون، هـۆکـاری ئەمەش بە پـلەی یەکەم ئەوەیە کە بە شێوازێکی زانستی کار لەسـەر دۆسـیـەی ئەنفال نەکراوە لەسـەر ئاسـتی نێودەوڵەتی، بەڵام جێگەی بـاسـکـردنە، کە هەنـدێـک دەوڵەت لە ئـاسـتی پەرلەمـانـدا لە سـاڵی (٢٠١٣ ) دانیـان نـاوە بە جینۆسایدی گەلی کوردا وەکو سوید و نەرویج و بریتانیا.

لەسەر ئاستی نیوخۆی عیراق ئەنفال بە جینۆساید ناسێنراوە، ئەمەش بەپێی بڕیاری ژمارە (٢٦)ی پەرلەمانی عیراق لە ڕێکەوتی ٢٠٠٨/٤/١٤ دەریکردووە، هەروەها دادگای باڵای تاوانەکان پشتبەست بە یاسای ژمارە (١٠)ی ساڵی ٢٠٠٥ و بە دەرکردنی بڕیاری ژمارە (١)ی ساڵی ٢٠٠٧ دانی ناوە بە تاوانی ئەنفالدا وەک تاوانێکی جینۆساید و هەروەها لەسەر ئاستی کوردستان دیسان تاوانی ئەنفال بە جینۆساید ناسێنراوە بەپێی یاسای ژمارە (٩) ی ساڵی ٢٠٠٧ ی پەرلەمانی کوردستان .

**کەیسی ئەنفال لە دادگا:**

بەپێی یاسای ژمارە (١٠)ی ساڵی ٢٠٠٥ دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراق پیکهات و دەسەڵاتی بینینی ئەو تاوانانەی پێدرا، کە لە نێوان (١٩٦٨/٧/١٧) بۆ (٢٠٠٣/٥/١) ئەنجامدراوبوو، بەم پێیە تاوانی ئەنفال خرایە ژێردەسەڵاتی دادگای ناوبراو.

یەکەمین کەیس کە دادگا کاری لەسەرکرد کەیسی دوجێل بوو، کە تیایدا سەدام حسین دادگای کرا لەسەر کوشتنی (١٤٨) کەس لە خەڵکی دوجێل کە هەموویان شیعەمەزهەب بوون، لە ئەنجامدا دادگای ناوبراو سزای لەسێدارەدانی بۆ ناوبراو دەرکرد و لە ڕۆژی جەژنی قورباندا لە سێدارە درا، بەبێ ئەوەی بیرلەوە بکرێتەوە، کە لەسەر تاوانەکانی گەلی کورد دادگایی بکرێت، لە کاتێکدا بەپێی بنەما یاساییەکان تۆمەتبار لەسەر سەرجەم تۆمەتەکانی دادگایی دەکرێت و دواتر قورسترین سزای بەسەردا جێبەجێدەکرێت، ئەتوانین ئەمە بە خاڵێک دانێین، لەوەی کە کەیسی ئەنفال وەک پێویست تائێستاش کاری لەسەر نەکراوە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی و لەسەر ئاستی عێراقیش لە بابەتی قەرەبوودا کە دواتر باسی دەکەین.

سەبارەت بە کەیسی ئەنفال دادگای باڵای تاوانەکان لە دوای (٦١) دانیشتن لە ئەنجامدا بە بڕیاری ژمارە (١)ی ساڵی (٢٠٠٧) سزای لەسێدارەدانی بۆ چەند تاوانبارێک دەرکرد، لەوانە ( علی حسن مجید، سلطان هاشم و چەند تاوانبارێکی تر)، هەروەها بە بڕیاری ژمارە (١٠) لە ڕێکەوتی (٢٠٠٧/٦/٢٤) بڕیاری دەستگیرکردنی بۆ (٤٢٣) تۆمەتبار

دەرکــرد، کە لەو ژمــارەیە (٢٥٨) کەسیان کورد بوون.

بـڕیـاری دەســــتگیـرکـردنی تۆمەتـبـاران نـێـردرا بۆ هەرێمی کوردســـــتـان بۆ جێبەجێکردن، هەروەهــا ئەنــجـومەنــی دادوەری هەرێمی کوردستان بە بڕیاری ژمارە (٩٤٣) لە (٢٠١١/٥/٥) فەرمــانـــی دەســـــتگیرکردنی بۆ ئەوتۆمەتبارانە دەرکرد، کە لە بڕیاری دادگای باڵای تـاوانەکـاندا نـاویـان هـاتبوو، بەهۆی ئەوەی کە تـــــۆمەتـــبـــــاران دەســــتگیرنەکران، بۆیە جارێکی تر ئەنجـومەنی دادوەری بە بـڕیـاری ژمــارە (٢٧٠) لە (٢٠١٥/٥/٧) بـــۆ جـــــاری دووەم فەرمـــــانـــی دەســـــتگیرکردنی بۆ تۆمەتبـاران دەرکرد، بەڵام مایەی نیگەرانیە کە تا ئیستا داواکراوان دەستگیرنەرکراون، ئەمەش خۆی بۆخۆی کــاریگەری لەسەر بە جینۆسایدناساندنی تاوانی ئەنــفـــال هەیە لە کـــۆمەڵــگـــای نێودەوڵەتیدا ،خۆ ئەگەر پاســـــاوی دەســــتگیرنەکردنیـان ئەوەبیـت، کە پیشــــتر فەرمــانی لێبوردنیــان بۆ دەرکراوە، ئەوە پاســـاوێکی نارەواو نـایـاســــاییە، چونکە لە تـاوانەکـانی جینۆســـــایـدا هیچ جهەتێـک مـافی لێبوردنی گشـــتی نییە لە تۆمەتباران پشــــتبەســــــت بە ڕێکەوتنــامەی قەدەغەکردنی جینۆســـــاید ١٩٤٨ و ڕێــکەوتــنــامەی مــافە مەدەنـــی و سـیاسـییەکان ١٩٦٦ ، واتە دەرکرنی هەرجــۆرە لــێــبــووردنــیــک لەو تۆمەتبارانە لە ڕووی یاساییەوە هیچ هێزێکی یـــاســـــای نییە و پوچەڵە، هەربۆیە پێمانوایە ئەرکی پەرلەمانی کوردســـتانە بەدواداچوونی یاســـایی ورد بۆ ئەم کەیسە بکات.

ســەبارەت بە گەیاندنی کەیســی ئەنـفــال بـۆ دادگــای تــاوانـکــاری نێودەوڵەتی، دەتوانین بڵێین ئەم دادگـایە دەســـــەڵاتی بینینی تـاوانی ئەنفـــالی نییە، ئەمەش لەبەر دوو هۆکــار: یەکەم لەبەرئەوەی عێراق ئەندامی ڕێکەتنامەی دروســــتبوونی دادگا نییە و لە کاتی دروســــتکردنی دادگای ناوبراودا بە نەخێر دەنگی دا، دووەم لەبەرئەوەی دادگـای نـاوبراو دەســــەڵاتی بینینی ئەو تــاوانـانەی هەیە، کە لە ٢٠٠٢/٧/١ بەدواوە ئەنجامدراون .

**قەرەبووی قوربانیانی ئەنفال:**

بە شــــێوەیەکی گشـــتی هەموو تاوانێک دەرئەنجامێکی زیانبەخشــــی لێدەکەویتەوە، و کەســـی زەرەرمەند

مـــافـــی بەرزکـــردنەوەی داوای قەرەبووی هەیە لەسەر ئەو کەسەی تـاوانەکەی ئەنجـامـداوە، بەمەرجێ پایەکانی بەرپرســیارێتی بێتەدی، کە بــریــتــیــیە لە ( هەڵە و زەرەر و پەیوەندیی هۆکاری نێوانیان).

لە بنەرەتـدا دوو جۆر قەرەبوو هەیە، کە بریتین لە قەرەبووی مادی بۆ زیــانە مـــادییەکـان، قەرەبووی ئەدەبی بۆ ئازارو زیانە ئەدەبییەکان، لیرەدا مەبەســـتمـانە بڵێین تـاوانی ئەنفال زیانی مادی و ئەدەبی زۆری لێکەوتوەتەوە، ئەویش بە ســوتاندنی مـاڵ وموڵـک و گوند و بەروبوومی کشـــتوکاڵی و مەڕوماڵات و گۆڕینی دیمۆگرافی ناچەکان، پاشان کوشتنی زیاتر لە ٢٠٠ هەزار خەڵکی بێتاوان، دەکرێ بڵێین قەرەبووی ئەو زیانانە بە ملیارەها دۆلار مەزەندە دەکرێت.

لە تـاوانە نێودوڵەتیەکـانـدا وەکو تـــاوانـــی ئـەنـــفـــال دووجـــۆر بەرپرســـیاریتی درووســـتدەبێت، ئەویش بەرپرســـیارێتی تاوانکاری نێودەوڵەتی و بەرپرسیارێتی مەدەنی نێودەوڵەتییە، یەکەمیـان دەکەوێتە ئەســـتۆی کەســـی تاوانکار وەکو ســـەدام وهاوکارەکانی، دووەمیان ئەکەوێتە ئەستۆی ئەو دەوڵەتەی کە تاوانەکە لە ســایەیدا ئەنجامدراوە، کە دەوڵەتی میراتگرە پشـــتبەســـت بە بنەمای (مبدأ التوارث الدولة)، کە لە تـاوانی ئەنفالـدا دەوڵەتی ئێســـتـای عێراق دەگریتەوە بەپێی مادەی (٢٦) لە پرۆژەی بەرپرســیارێتی دەوڵەتان بەرامبەر کـارە نـارەواکـانیـان، بەڵام تائێسـتا دەوڵەتی عێراق بەم ئەرک و پابەندییەی خۆی هەڵنەســـتاوە، ئەمە سەرەرای ئەوەی کە مادەی (١٣٢)ی دەســـتووری عێراق هاتووە ئاماژەیە بۆ بەرپرسـبوونی دەوڵەتی عێراق بە قەرەبووکردنەوەی سەرجەم زەرەرو زیانەکانی قوربانیانی ئەنفال.

جـێـگـەی ئــامــاژەبـۆکـردنە، کە دادگای باڵای تاوانەکان دەبووایە لە بڕیاری ژمارە (١)ی ســاڵی ٢٠٠٧ دا لە خـەزیـنـەی گـشـــتـیـی عـێـراق قەرەبووی کەســـوکاری قوربانیانی ئەنفالی جێگیربکردایە، بەڵام لە بری ئەمە، مافی داوە بە زیانلێکەوتووان، کە بگەڕێنەوە بۆ دادگای تایبەتمەند بۆ داوای قەرەبوو، ئەمەش لە تاوانە ئاســـایی و نێوخۆییەکاندا دروســـتە بەپـــێـــچەوانەی تـــــاوانە نێودەوڵەتییەکـانەوە، واتە دادگـای بـاڵای تـاوان لە بـابەتی بڕیـاردان لە قەرەبووی کەیســـی ئەنفالـدا وەک

پێویســـــت نەبووە و دادپەروەری بەدی نەهێناوە، سەرەڕای ئەوەی کە سکالاکاران لە بەردەم دادگادا داوای قەرەبوویـان کردووە و وەکو لە وتەی یەکێکیاندا هاتووە، کە ئەڵێ ((هەموو ســـامانی دونیا قەرەبووی پەنجەیەکی باوکم ناکاتەوە، بەلام بە مافی یاســـایی خۆمی دەزانم، کە داوای قەرەبـوو بـکەم))، ئەمەش پێشێلکردنی مافی یاسایی کەسوکار و زیـانلێکەتووانی تـاوانی ئەنفالە لەلایەن دەوڵەتـی عـێـراقەوە و پێشلکردنی مادەکانی (٢١٩ و ٢٠٢ و ٢٠٣ و ٢٠٤ و ٢٠٥) لە یـاســـای شـارستانی عێراقی، ئەمە جگەلەوەی کە لە خەزێنەی گشـــتیی عێراق قەرەبووی زیانەکانی کەیسی دوجێل کـرایەوە، ئەمەش خـۆی بـۆخـۆی جیاکارییەکی نایاسایی و نادەستوورییە لە نێوان هاولاتیانی عێراقدا.

ئەوەی کە پەیوەنـدی بە حکومەتی هەرێمەوە هەیە لەم کەیسەدا، ئەوەیە کە دەتوانین بلێین وەک پێویســـت و بە شـێوەیەکی زانستی کاری لەسەر کەیســـی ئەنفال نەکردووە، هەرچەند کۆمەڵێک هەوڵدراوە، لەو بـارەیەوە بـۆ نـمونە لە ســـاڵی ٢٠١٣ وە وەزارەتی شـەهیدان و ئەنفالکراوانی هەرێم کاری لەسەر پرۆژەیاساییەک کرد تایبەت بە ناچارکردنی حکومەتی عـێـراق بە پـێـدانـی قەرەبـووی تاوانەکانی ئەنفال، بەلام ئێمە پێمان وایە بـابەتی قەرەبووی قوربـانیـانی ئەنفال پێویستی بە یاسای نوێ نییە و ئەو دەق و بنەما یـاســـاییانەی بـاســـکـرا، بەڵگەی تەواون لەو بـارەیەوە، خۆ ئەگەر بـاســـی ئەو پـاداشـــتە مـانگـانەیەی بکەین، کە حکومەتی هەرێم بەپێی یاسا دەیدات بە کەســـوکـاری ســـەربەرزی ئەنـفـالـکـراوان، ئەوا دەڵـێـین ئەو پاداشتە بە قەرەبوو دانانرێت، چونکە قەرەبوو لەسەر ئەو لایەنەیە کە هەڵە و تاوانەکی ئەنجامداوە، کە دەوڵەتی عێراقە.

لە دۆخیکی وادا، کە دەوڵەت بە ئەرکی یاســـایی خۆی هەڵناســـێت بەرامبەر بە قـوربـانـیـان، ئەرکی ئەنجومەنی ئاسـایشـی نێودەوڵەتییە بە بڕیارێکی تایبەت پابەندی دەوڵەتی عێراق بکـات لە پێدانی قەرەبووی شـــایســـتەی زیانلێکەوتووان، وەکو چۆن بە بڕیاری ژمارە (٩٨٦/ ١٩٩٢) عێراقی پـابەنـدکرد بە قەرەبووی زیانەکانی داگیرکردنی کوێت، کە تا ئەم ســـالانەی دوایی ســـالانە لە

بودجەی عیراق ڕێژەیەکی بۆ قەرەبووی کوێت تەرخاندەکرا، هەموو ئەو بنەمای اساییانەی کە باسکرا وەک دەرچەیەکی یاسایی بۆ وەرگرتنی قەرەبوو لە خەزێنەی گشتی عێراق دەتوانرێ پشتی پێ ببەسترێت.

قەرەبووی قوربانیانی ئەنفال تەنها قەرەبووی مادی ناگرێتەوە، بەڵکو قەرەبووی ئەدەبیش دەگرێتەوە، قەرەبووی ئەدەبی و معنوی ئەمەیان پارەی ناوێ و پێویستە لەسەر دەوڵەتی عێراق بە فەرمی داوای لێبووردن لە گەلی کورد بەگشتی و کەسوکاری ئەنفالکراوان بەتایبەتی بکات، ئەم جۆرە لە قەرەبوو کاریگەری لەسەر لایەنی دەروونی کەسوکاری ئەنفالکراوان هەیە، جگەلەوەش بۆ بڕیاردان لەسەر قەرەبووی مادی و لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش کاریگەری دەبێت.

ماوەتەوە بڵێین کە ئەو دووجۆرە بەرپرسیارێتیەی لە تاوانی ئەنفالدا دروستبووە، بە تێپەربوونی کات بەسەرناچێت، بە مانا یاساییەکەی تقادم ناکات، هەربۆیە دەکرێ لە دادگای بەرایی داوای قەرەبووی تاوانی ئەنفال بەرزبکرێتەوە و ئەو بەڵگانەش کە بەردەستن و بڕیاری دادگای باڵای تاوانیش پابەندی دادگادەکات بە دەرکردنی حوکمی قەرەبوو و پابەندکردنی حکومەتی ناوەند بە بژاردنی زیانەکان و کەسوکاری قوربانیان لە بودجەی گشتیی عێراق، بەڵام ئەمەش هەیە ڕێگەیەکی ئاسان نییە و پێویستی بە لێکتێگەیشتینی سیاسی هەیە، هەربۆیە پێشنیازدەکەین بۆ سەرکردایەتیی سیاسیی کورد لەکاتی دانوستان لەسەر پێکهێنانی حکومەت نوێ بیرێک لە مافی کەسوکاری ئەنفالکراوان بکەنەوە و لە گفتۆگۆکاندا بەهەند وەری بگرن .





# مافی قەرەبووکردنەوەی هەرێمی کوردستان بەهۆی زیانە ژینگەییەکانی تاوانەکانی ڕژێمی پێشوو

د. هیوا ڕەشید/ دکتۆرا لە یاسا

بەشی یاسا، زانکۆی گەرمیان



لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم (١٩٨٨) ڕژێمی بەعس لە میانەی تاوانی بەناو ئەنفال، هەستا بە کۆمەڵکوژیی گەلی کورد بە ئامانجی قەلاچۆکردنی نەتەوەیەک، کە خاوەن شوناس و زمان و کلتور و خاک و ئاڵای خۆیەتی. ئەگەر چی داتای ورد و دروست بەردەست نییە، بەڵام سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن، لە کۆی تاوانە کۆمەڵکوژییەکان و شاڵاوی ئەنفال نزیکەی (١٨٢) هەزار کوردزمان لەناوبراون، کە بەشی زۆریان ئافرەت و منداڵ بوون. جگە لە زیانە مرۆییەکان کە بووە هۆی لەناوبردنی دەیان هەزار مرۆڤی کورد لە پیر و منداڵ و ئافرەت، تاوانەکانی دژ بە کورد بۆ نموونە لە پرۆسەی پلان بۆ دانراوی ئەنفال یان کیمیابارانی شاری هەڵەبجە، وێرانکارییەکی گەورەی دروستکرد و ئاسەوارەکانی بۆ چەندین دەیە و نەوە هەر دەمێنێتەوە. ئەم ئاسەوارانە فرەجۆرن و ڕەهەندی جیاوازیان هەیە و شایەنی ئەوەن بە بەرنامە و ستراتیژی نیشتمانی کاری لەسەر بکرێت.

ئەوەی لەم وتارە دەمەوێت تیشک بخەمە سەری ئەو زیانانەیە، کە بە زیانی ژینگەیی باسدەکرێت و لە ئەنجامی تاوان و دەستدرێژی و هێرشەکانی ڕژێمی پێشوو بەر سروشت و ژینگەی هەرێمی کوردستان کەوتوون. سەرەتا بە سادەی پێویستی بزانین ژینگە بریتییە لەو ناوەندەی کە مرۆڤ و بوونەوەران تیایدا دەژین و گەشەدەکەن. ژینگە لە دوو ڕەگەز پێکدێت، یەکەمیان بریتییە لە ڕەگەز زیندووەکان، کە لە مرۆڤ و ئاژەڵ و گژوگیا پێکهاتووە، ودووەمیانیش ڕەگەزە نازیندووەکانی ژینگە بریتین لە ئاو و هەوا و خاک. بۆیە بە هەر دوو ڕەگەز ئەو ناوەندە یان ژینگە سروشتییە دروستدەبێت. بەپێی یاسا نێودەوڵەتی و هەرێمی و ناوخۆییەکان هەموو تاکەکەسێک مافی هەیە لە ژینگەیەکی تەندروست و خاوێن بژێت. پێویستە دەوڵەتان ڕێز لەو مافە بگرن و ڕێگەنەدەن بە

پێشـــێلکردنی مـافـه، چونکـه مـافی ژینگەیەکی ســەلامەت پێشــێلبکرێت، کاریگەری لەســــەر مافەکانی تری مرۆڤیش دەبێت. تـەنـانـەت لـە کاتی جەنگدا دەوڵەتان بەرپرس دەبن لە زیانە ژینگەییەکان و لە دەســـتوری ئێستای عێراقیش دانەنراوە، بەم مافە بۆ هـەمـوو تـاکێـک مـادەی (٣٣) و دەوڵەت ئەرکدارکراوە بە پاراســتنی ژینگە و هەمەچەشنی زیندەوەران.

بەپێی ئەو زانیاریانەی بەردەســتن و باسـکراوە، کە نزیکەی چوار هەزارو پێنج سەد گوندی هەرێمی کوردستان خاپورکراون، ڕژێم سیاسەتی زەوی سووتاوی پەیرەوکردووە. واتە ڕژێم نەک تەنها هەوڵی لەناوبردنی مرۆڤی کوردی داوە، بەڵکو هەوڵی لەناوبردن و وێرانکردنی ژینگە و سەرچاوەکانی ژیانی داوە، و بەعس لە شـاڵاوەکانی ئەنفالدا گوندەکانی ڕاگواســـت و خانوەکانی خاپوردەکردن و مەڕ وو مـاڵات و پــەلــەوەری دەبـرد و کانیاوەکان و زێیەکانی پڕدەکردەوە و دارو ڕەزەکانی دەسووتاند.

ئەو زیانانەی کە لە لایەن ڕژێمەکانی پێشـــووی عیراق دژ بـە گـەلی کوردســـتان و خاکەکەی کەوتووە، زیانێکی زۆری بێســـنوری ماددی و مرۆیی و ژینگەیین. بۆ نموونە بەپێی ڕاپۆرتی دەســـتنیشـــانکردن و خەمڵاندنی زیانە مادی و مرۆییەکانی ڕژێمەکانی پێشـوو لە نێوان سـاڵانی (١٩٦٣-٢٠٠٣) کە لە لایەن حکومەتی هـەرێـمـەوە ئـامـادەکراوە،بە نزیکەی( ٣٨٤ ) ملیـار دۆلار مـەزنـدەکراوە، بەپێی ڕاپۆرتەکە زیانە مرۆییەکان بە (٣٠٦) شــەش ملیار و(٨٤٩) ملیۆن و (٩٥٠) هــەزار دۆلاری ئــەمـریـکـی خــەملێنــدراوە. بــەپێی ڕاپۆرتــەکـە ژمـارەی قوربـانیـان لـە تـاوانـەکانی جینۆســــایدی دژ بە گەلی کورد بە (٢٠٠) هەزار قوربانی دیاریکراوە و بڕی خـەملێندراوی مـاددی بۆ هـەر قوربانیەک بە (٣٠٠) هەزار دۆلاری ئـەمریکی خــەملێنـدراوە، بــە کۆی گشـــتی دەکاتە (٦٠) ملیار دۆلاری ئەمریکی .

مەبەست لە زیانە ژینگەییەکان بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی حکومەتی هەرێم، ئەو

زیانانە دەگرێتەوە، کە بەر دارستانە سروشتییەکان، و ڕووبارەکان و زێیەکان، کانیا و کارێزەکان، لەوەڕگە سروشتیەکان، گردۆلکە و تەپۆلکە و بەردەڵان و ناوچە خۆڵیەکان و دەشتاییەکان و بیابانەکان و باو و گەرمی و شێ و فشاری ئاسمانی و باران دەگرێتەوە، ئەم زیانانە بە پارە ناخەملێندرێت، دەبێت ڕێکەوتنیان لە بارەوە بکرێت، وەکو لە ڕاپۆرتەکە باسکراوە، لەگەڵ ئەوەیشدا کۆی زیانە ژینگەییەکان بە بڕی (٥) ملیار دۆلار خەملێندراوە .

بە بۆچوونی ئێمە چوارچێوەی زیان ژینگەیەکان فراوانترە و هەردوو ڕەگەزی زیندوو و نازیندووی ژینگە دەگرێتەوە، کە ئاماژەمان پێکرد، و پرۆسەی دیاریکردن و خەملاندنی زیانە ژینگەیەکان پرۆسەیەکی قورسە و پێویستی بە توانای مرۆیی وەکو پسپۆری و زانستی وتوانای تەکنەلۆجی هەیە، ئەم بابەتەیش پێویستی بە پاڵپشتی دارایی و نادارایی لە لایەن کۆی دەزگا حکومییەکان بەتایبەت زانکۆکان هەیە. بۆ نموونە تاکو ئێستا داتای ورد و توێژینەوە لەم بارەوە بەردەست نییە، نازانین ئایا تا چ ڕادەیەک بەکارهێنانی چەکی قەدەغەکراوی کیمیاوی لە شاری هەڵەبجە بووە هۆی زیان بۆ سروشت و هەمەچەشنی زیندەوەران لەو ناوچەیە؟، تا چ ڕادەیەک بوە هۆی گۆڕینی تایبەتمەندی و سروشتی خاک و ئاو و هەواکەی؟ بۆیە دەکرێت پلانی زانستی دابنرێت بە پاڵپشتی حکومەت بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەی وردی زانستی بکرێت لەسەر بڕی زیانەکان، و جۆری زیانەکان، و کاریگەریی زیانەکان، کە لە ئەنجامی تاوانەکانی ڕژێمی بەعس دروستبوون. بۆ ئەوەی بکرێت بە بەڵگەنامە و دیکیۆمێنت و ناوەندە زانستیەکانی جیهان و توێژەرانی لێ ئاگاداربکرێتەوە، لە لایەکی تر کاری لەسەر بکرێت بۆ ئەوەی دەوڵەتی فیدراڵ قەرەبووی ئەو زیانانە لەئەستۆبگرێت.

بۆیە پێویستە حکومەتی ئێستای عیراق لە ئاستی بەرپرسیارێتی بێت

و قەرەبووی هەرێم بکاتەوە، وەک چۆن قەرەبووی زیانەکانی داگیرکردنی کۆیتی لەئەستۆگرێت، ئەمە قەرەبووەیش مافێکی دەستوورییە بۆ کورد، هەر وەکو لە برگەی یەکەم لە مادەی (١١٢) ی دەستور باس لە تەرخانکردن بەشێک لە داهاتی نەوت و غازکراوە بۆ ئەو ناوچانەی زیانمەندبوون لە تاوانەکانی ڕژێمی پێشوو. هەروەها لە مادەی (١٣٢)ی دەستوریش بەهەمان شێوە باس لە ئەرکی دەوڵەت کراوە لە قەرەبووکردنەوەی کەسوکاری شەهیدان و زیندانیانی سیاسی و زیانلێکەوتووانی ڕژێمی پێشوو، لە بڕگەی دووەم باس لە قەرەبووی قوربانیانی تیرۆر دەکاتەوە. بۆیە ئەم مافە دەستوریانە و چەندین مافی تر هەن، پێویستە کورد شەڕی بۆ بکات، ئەم شەڕەیش پێویستی بە لێکۆڵینەوە و داتا و ئیرادەی سیاسی نیشتمانی هەیە.







# ڕووماڵی جینۆسایدی فەیلییەکان لە میدیای کوردیدا
## (جۆر و ستراتیژیەتی کارکردن)

پ.ی.د. یادگار عەلی محەمەد          م. دەشتی عەلی ڕەشید
کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەت - زانکۆی گەرمیان



**کورتەیەک:**

یەکێک لەو ڕووداوانەی مێژووی مرۆڤایەتی لە چەندین شـوێن و کاتی جیاواز بەخۆیەوە بینیوە، دیاردەی (ڕاگواستنی زۆرەملێ)یە، کە یاسای نێودەوڵەتی لە چوارچێوەی تاوانەکانی دژ بە مرۆڤایەتی پۆلێنی کردووە. گەلی کوردسـتان لە عێراق بە هۆکـاری جیـاوازی نەتەوەیی و نـاسـنـامە چەنـدینجـار لەلایەن دەسـەڵاتدارە توندڕەو و دەمارگیرەکان ڕووبەڕووی ئەو تاوانە کراوەتەوە و لەسـەر زێدی خۆیان هەڵکەندراون و شـوێنەکانیان بەسـەر خەڵکانی تر دابەشکراوە، یان کراون بە سەربازگە و یاخودیش لەگەڵ زەوی تەختکراون.

لە کۆتایی شەستەکان و لەگەڵ هاتنی بەعسییەکان بۆ سەر کورسی دەسەڵات لە عێراق شاڵاوی ڕاگواستنی زۆرەملێ دەرحەق بە بەشێکی گرنگ لە پێکهاتەی گەلی کوردسـتان، کە کوردانی فەیلین دەسـتیپێکرد. دەیان هەزاریان لە پاش لێسەندنەوەی ناسنامە، بە زەبری هێز و بە پاساوی ئەوەی عێراقی نین، بەرەو وڵاتی ئێران ڕاگوێزران و دەربەدەرکران. ئەوە لە کاتێکدا دەهات فەیلییەکان، لە بنەڕەتدا؛ بەشێکی سەرەکی و ڕەسەن بوون لە پێکهاتەی دانیشتووانی عێراق.

لە سـەرەتای سـاڵانی هەشـتاکانی سـەدەی ڕابردووش، حکومەتی عێراق شـاڵاوێکی دیکەی بەرفراوانی گرتن و زیندانیکردنی گەنجانی فەیلی دەسـتپێکرد و تەنها لە ماوەی ئەو سـاڵەدا؛ سـەدان هەزار کوردی فەیلی ناچار بە کۆچی زۆرەملێ کرانەوە و هەزارانیشیان بێسەروشوێن کران.

ئەم باسـە لە جۆر و شـێوازی ڕوومالّی میدیای کوردی دەربارەی کەیسـی جینۆسـایدی فەیلییەکان لە عێراق دەکۆڵێتەوە لەگەڵ دەسـتنیشـانکردنی سـتراتیژێکی نیشـتیمانی بۆ کاری میدیایی لەسـەر ئەو پرسـە نەتەوەییە. بۆ ئەو مەبەسـتەش تێڕوانینی (٥٨) چالاکوانی بواری جینۆسـایدی بە جیاوازی ڕەگەز، تەمەن و ئاستی خوێندەواری لەبارەی باسەکەوە بە نموونە وەرگرتووە.

**تیۆرینامە: (فەیلییەکان و پەیوەندی پرسەکەیان بە میدیاوە)**

- **کورتەیەک لەبارەی فەیلییەکان:**

فەیلییەکان بەشێکی دانەبڕاوی نەتەوەی کوردن، زۆرینەیان نیشتەجێی کێوەکانی پێشـکۆ و پشـتکۆی زنجیرە چیـای زاگرۆس بوون، لە چەند نـاوچەیەکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و باشووری کوردستان و شارەکانی: (بەغداد، مەندەلی، خانەقین، بەدرە، جەسان، کووت، عەممارە، بەسرە، لوڕستان، ئیلام و کرماشان) نیشتەجێن. کوردانی فەیلی هەزاران ساڵە لەو ناوچانەی، کە تائێستا نیشتەجێین و دەژین جێگیرن، هەرچەندە تائێسـتا بەڕەسـمی هیچ ئامارێکی متمانەپێکراو بۆ ژمارەی فەیلییەکان نەکراوە، بەڵام بە گشـتی بۆ زیاتر لە سـێ ملیۆن کەس مەزەندەدەکرێن، بەشـێک لە کتێبە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن، کە کوردانی فەیلی لە ساڵی (٧٦٢)ـی زاینیی بەشدارییان لە درووستکردنی شاری بەغدادا

کردووە، هەروەک لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقیشـــەوە فەیلییەکان لە دامەزراندنی ئابووری لە ڕووی خاوەنداریێتی تایبەتدا بەشـــدارییان کردووە. (سامان: ٢٠٢٢).

ســـەرەتای نەهامەتییەکانی کوردانی فەیلی لە عێراقدا لە ســـاڵی (١٩٢٤)ــــــەوە دەســـتپێدەکات، کاتێک لەو ســـاڵەدا یاســـای ڕەگەزنامەی عێراقی جەختی لەســـەر دابەشکردنی گەلی عێراق بۆ سێ بەش کردەوە لەسەر بنەمای (ئایین و نەتەوە)، کوردی فەیلی لەبەرئەوەی لە پەیڕەوکەرانی مەزهەبی شیعەی جەعفەری بوون، بۆیە بە ڕەچەڵەکی ئێرانی نـاونووســـکران، بەوەش کەوتنە بەردەم هێرش و پەلاماری دەســـەڵاتدارە یەک لەدوای یەکەکانی عێراق. لەســـاڵی (١٩٦٨) کاتێک بەعســـییەکان بە کودەتایەک دەســـەڵاتیان گرتەدەســـت، یەکێک لە پلانەکانیان ڕاگواستـن و کۆمەڵکوژکردنی کوردانی فەیلی بوو، لە قۆناغی یەکەمدا؛ لە ساڵی (١٩٧١)، حکومەتی عێراق لە چەنـد قۆنـاغێکـدا بەو بیـانووەی، کە ڕەچەڵەکی فەیلییەکان ئێرانییە، نزیکەی (٤٠) کوردی فەیلی بۆ ئێران ڕاگواســـت. (ماڵپەڕی کوردســـتان، ٢٠١٧، ٢٤). دواتریش لە ســـاڵی (١٩٨٠) حکومەتی بەعس لە عێراق بڕیاری (٦٦٦)ـــی بەمەبەستی لەناوبردنی کوردانی فەیلی دەرکرد، تێیدا هاتبوو: (هەر هـــاوڵاتییەکی عێراقی بەڕەچەڵـــک بێگـــانە بێـــت، ڕەگەزنـــامەی عێراقی لێدەســـەنرێتەوە)، بەهۆیەوە تا کۆتایی ســـاڵی (١٩٩٠)، هەزاران کوردی فەیلی ڕاگوازران و مافی هاوڵاتیبوونیشـیان لێسـەندنەوە و دەست بەسـەر سـامان و موڵک و ماڵەکانیشـــیاندا گیرا، بەوەش ژمارەی ڕاگوێزراوانی کوردانی فەیلی گەیشـــتە (٦٠٠) هەزار کەس، هەروەهـا زیـاتر لە (٢٠) هەزار گەنجی فەیلی بێســـەروشـــوێن کراون و تائێســـتاش چارەنووســـیان نادیارە و نازانرێت بە چ شێوەیەک لەناوبراون(سامان: ٢٠٢٢).

لە ڕاپۆرتی دەستەی پارێزەرانی داکۆکیکار لە دۆسیەی جینۆسایدی فەیلییەکان لە دادگای باڵای تاوانەکان لە عێراق دوای ڕوخانی دەســـەڵاتی بەعس لە ســـاڵی (٢٠٠٣)، ئاماژەی بۆ جۆری ئەو تاوانە کرووە، کە دژی کوردانی فەیلی کراون: (ڕەئوف و محمد ئەمین: ٢٠١٧، ١٢٨).

- یەکەم: سڕینەوەی ناسنامە و ڕاگواستنی کوردانی فەیلی بۆ ئێران.
- دووەم: دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامانی گواستراوە و نەگواستراوە.
- سێیەم: بێسەروشوێنکردن و لەسێدارەدانی گەنجانی فەیلی.
- چوارەم: بێســـەروشـــوێنکردنی (١٥) هەزار گەنج کە تا ئەم ســـاتەوەختەش چارەنووسیان نادیارە.

ڕێکەوتی (٢٠١٠/١١/٢٩) دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق بڕیاریدا ئەو تاوانانەی حکومەتی بەعس دژی کوردانی فەیلی ئەنجامیداون بەجینۆســـاید بناســـێنێت، دواتریش لە ڕێکەوتی (٢٠١٠/١٢/٨) ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق بە بڕیـاری ژمارە (٤٢٦)، ســـەرجەم لێکەوتە خراپەکانی بۆ ســـەر پێکهاتەی کوردانی فەیلی

هەڵوەشـــاندەوە و فەیلییەکانی بە بەشـــێکی گرنگی پێکهاتەکانی گەلی عێراق ناوبرد، دوابەدوای ئەوەش ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق بە بڕیاری ژمارە (١٨)ی ساڵی (٢٠١١) پشتبەست بە بڕیاری دادگای باڵای تاوانەکان، تاوانەکانی دژی کوردانی فەیلی بە تاوانی جینۆســـاید ناســـاند :Pukmedia Arabi) (2016

- **میدیا و کارکردن لەسەر پرسە تاوانکارییەکان:**

ڕۆژنامەنووس، مێژوونووســـی ئانووســـاتە(طیفوري: ٢٠١٩) بەو مانایەی ڕۆژنامەنووس لە ڕێگەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بە شـــێوەیەکی بەردەوام ڕووداوەکان بە جیاوازیی جۆر و سروشتیان لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە تۆماردەکات. ئەوەش گرنگی و بایەخی تایبەتی هەیە و ڕاگەیاندن دەبێتە ئاوێنەی ڕووداوەکانی هەر سەردەمێک. بێگومان بۆ یاداشتکردنی ڕووداوەکان ڕاستگۆیی لە گواستنەوەی زانیارییەکان کاریگەریی زۆری لەسەر تۆمارکردن و گواستنەوەی ڕووداوەکان بۆ داهاتوو هەیە.

مێژووی کورد لە عێراق زۆر نەهامەتی و دەردەســـەری تێدایە. ڕژێمە سیاسییەکانی عێراق چەندین تاوانیان دەرحەق بە پێکهاتەکانی گەلی کوردستان ئەنجامداوە، هەندێک لەو تاوانانە تا ئاســـتی کۆمەڵکوژی ڕۆیشـــتوون. هەر بۆ نموونە پرۆســـەی ڕاگواســـتنی زۆرەملێی کوردە فەیلییەکان لە عێراق، کە بە جینۆسایدی فەیلییەکان ناسێندراوە.

بە بڕوای توێژەران ڕاگەیاندن دەتوانێت بە چەند قۆناغێک کار لەســـەر ئەو پرسـانەی ڕەهەندی تاوانکارییان لەســەر ئاســتی ناوخۆ و نێودەوڵەتیی تێدایە بکات:

قۆناغی یەکەم: تۆمارکردنی ڕووداوەکە لە ڕێگەی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و بەشـــێوەی تێکســـت، تێکســـت و وێنە، وێنەیی، یاخوود وێنەی جوڵاو یاخود بەبەکارهێنانی ژانرە ڕۆژنامەنووسییە جۆربەجۆرەکان.

قۆناغی دووەم: قۆناغی جەختکردنەوە لەســەر بەزیندووهێشـتنەوەی ڕووداو و برینەکان و ناساندنی بە ڕایگشتی لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە.

قۆناغی ســێیەم: بەکارهێنانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بۆ دروســتکردنی فشار لەســـەر حکومەتەکان و کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و دادگاکان بۆ جوڵاندنی دۆســـییەی تاوانەکە تا ناســـاندنی بەشـــێوەی ڕەســـمیی و قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووان.

لەو کارەدا دەزگاکانی ڕاگەیاندن ســـەرباری پێوەرە پیشـــەیی و ئێتیکییەکان، دەبێت دوو پێوەری تری سەرەکیش بۆ کارکردنی ڕاگەیاندن لەسـەر دۆسییە تاوانکارییەکان بەهەند وەربگرن(العیاشي: ٢٠٢١).

- گەڕان بەدوای ڕاستییەکان و ئاشکراکردنی لەپێناو هۆشیارکردنەوەی ڕایگشتی بە دەوروبەرەکەی و کاروبارەکانی دادگا.
- پابەندبوون بە شەفافییەت: هەموو هەڵسوکەوتێکی ڕۆژنامەنووسیی بەرپرسیاریەتییە بەرامبەر بە کۆمەڵگە.

تا سنووری ئاگایی و گەڕان و بەدواداچوونی نووسەرانی ئەم باسە: لە سەرچاوە زانستییەکان تەنانەت سەرچاوە ئەلیکترۆنییەکانیش شتێکی ئەوتۆ لەبارەی بایەخپێدانی میدیای کوردی بە جینۆسایدی فەیلییەکان لە عێراق باس نەکراوە، بەتایبەت لە قۆناغی ڕوودانی تاوانەکەدا، ئەوەش دەکرێت ئەو خوێندنەوەیە هەڵبگرێت، کە کورد لەو کاتەدا خاوەنی کیانێکی سیاسیی سەربەخۆ نەبووە، هەروەک خاوەن ئامرازی ئەوتۆی ڕاگەیاندنیش بۆ تۆمارکردنی ڕووداوەکە نەبووە، بەتایبەتیش کە تاوانەکە لەلایەن ڕژێمی بەعس لە عێراق تۆمارکراوە و تاڕادەیەک بە دوور بووە لە ناوچەکانی شۆڕشی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە عێراق. ئەگەر سەرنجبدەین کورد لە عێراق بۆ تۆمارکردنی ڕووداوە تاونکارییەکانی تری ئەو ڕژێمەش، کە چەندین ساڵ دواتر بەرامبەر بە گەلی کوردستان تۆماریکردوون، ئەرشیفێکی ئەوتۆی لە بواری ڕاگەیاندن نییە و ئەوەشی کە هەیە، بەگشتی میدیا و ڕۆژنامەنووسانی دەرەوە یاداشتیان کردووە.

**پراکتیکنامە: جۆری بایەخپێدانی میدیای کوردی بە جینۆسایدی فەیلییەکان و ستراتیژییەتی کارکردینان**

- **جۆر و شێوازی بایەخپێدانی میدیای کوردی بە جینۆسایدی فەیلییەکان لە عێراق.**

زۆرینەی چالاکوانانی بواری جینۆساید، کە تێڕوانینیان دەربارەی جۆر و شێوازی بایەخپێدانی میدیای کوردی بە جینۆسایدی فەیلییەکان لە عێراق وەرگیراوە، بەمجۆرەیە: بە ڕێژەی (٥١,٧%)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، لەگەڵ ئەوەدانین (میدیای کوردی توانیبێتی ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی لە ناساندنی کۆمەڵکوژی فەیلییەکان بەجێبگەیەنێت)، (٢٤,١%)یانیش لە پلەی دووەم (هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانین)، پلەی سێیەمشیان؛ بە ڕێژەی (١٣,٨%) لەگەڵ ئەو بۆچوونەدان. ئەنجامەکەش ئەوەیە: میدیای کوردی لەئاست ناساندنی کۆمەڵکوژی فەیلییەکان کەمتەرخەم بووە و ئەرکی ڕاستەقینەی خۆی بەجێنەگەیاندووە.

زۆرینەی چالاکوانانی بواری جینۆساید لە هەرێمی کوردستان، کە لە ڕاپێوییەکەدا بەشداربوون، بە ڕێژەیەکی یەکسان (٤١,٤%) کە پلەی یەکەمدا دێت، زۆر لەگەڵ ئەوەدان (میدیای کوردی تەنها لە ساڵڕۆژی تاوانەکە باسی

جینۆســـــایدی فەیلییەکان دەکات)، (٪١٠,٣) لە پلەی دووەم لەگەڵئەوەدا نین، پلەی سـێیەمیشـیان؛ بە ڕێژەی (٪٦,٩) هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانین. ئەمەش ئەوە پیشـــــاندەدات: میدیای کوردی شـــوێن ڕووداوەکان دەکەوێت و ئەو کاتانە بـایەخپێدانی بۆ ڕووداوەکـان هەیە، کە کۆمەڵگە و ڕایگشـــتی دەیوروژێنن، کاتەکانی تر گرنگیان پێنادات، تەنانەت ئەگەر پرسێکی نیشتیمانییش بێت.

زۆرینەی بەشـــداربووانی ڕاپێوییەکە بە ڕێژەیەکی یەکسـان (٪٣٧,٩)، کە لە پلەی یەکەمـدا دێـت، لەگەڵئەوەدانین/ هەرگیز لەگەڵئەوەدانین، کە (میـدیـای کوردی بە شێوەیەکی بەردەوام کاری لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان کردووە ـــــ دەکات و بەڵگەداری کردووە ـــــ دەکات)، (٪١٣,٨) لە پلەی دووەم زۆر لەگەڵئەوەدان، (٪١٠,٣)شـیان لە پلەی سـێیەم لەگەڵ ئەوەدان. دەتوانرێت ئەو ئەنجامەش بەوە لێکبدرێتەوە، کە میدیای کوردی بەشێوەیەکی بەردەوام کاری لەســـەر جینۆســـــایدی فەیلییەکان لە عێراق نەکردووە و نەیتوانیوە لە ڕێگەی میدیاوە ئەو کەیسە بەڵگەدار بکات.

(٪٤١,٤)ـــــی چالاکوانانی بواری جینۆسـاید، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، لەگەڵ ئەوەدانین (میـدیـای کوردی لە ڕێگەی هەموو ژانرە ڕۆژنـامەنووســـییە جیاوازەکان: هەواڵ، ڕاپۆرت، وتار، چاوپێکەوتن، بەدواداچوون، ..هتد کاری لەسەر پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان کردووە – دەکات)، (٪٣١)یش لە پلەی دووەم هەرگیز لەگەڵیـدانین، پلەی ســـێیەمیشـــیـان؛ بە ڕێژەی (٪٢٠,٧) بۆچوونیـان وەهـایە، کە میـدیـای کوردی توانیویەتی ئەو کـارە بکـات. ئەنجـامەکانیش ئەوە ڕووندەکەنەوە: میدیای کوردی نەیتوانیوە لە ئـاســـتی پێویســـت هەموو ژانرە ڕۆژنامەنووســـییەکان بەپێی جۆر و ســـرووشـــتی بابەتەکان بۆ کارکردن لەســـەر پرســـی جینۆســـایدی فەیلییەکان بەکاربهێنێت، ئەوەش هێمایە بۆ کەمتوانایی میدیای کوردی دووبارەیی و کلاسیکی کارەکان لەســـەر پرســـی جینۆســـایدی فەیلییەکان لەلایەن میدیای کوردی و نەبوونی دەستی داهێنان و نوێگەریی لە هونەری کارکردن لەو کەیسەدا.

زۆرینەی چالاکوانانی بواری جینۆســـاید لە هەرێمی کوردســـتان بەڕێژەی (٪٣٤,٥)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، لەگەڵ ئەوەدانین (میدیای کوردی بووبێتە ئەرشـیفێک بۆ پاراسـتنی ڕووداو و بەڵگەنامەکانی پەیوەسـت بە جینۆسـایدی فەیلییەکان)، (٪٣١) لە پلەی دووەم هەرگیز لەگەڵیدانین، پلەی سـێیەمیشـیان؛ بەڕێژەی (٪٢٤,١)، بێلایەنیان هەڵبژاردووە. ئەنجامەکان ئاماژەیەکی ڕوونن، بۆئەوەی میدیای کوردی نەیتوانیوە ببێت بە ئەرشـیفێکی گرنگ بۆ پاراسـتنی ڕووداو و بەڵگەنامەکانی پەیوەست بە جینۆسایدی فەیلییەکان.

پلەی یەکەمی چالاکوانانی بواری جینۆسـاید لە هەرێمی کوردسـتان بەڕێژەی (٪٣٤,٥) لەگەڵ ئەوەدانین (ئەو کارانەی میدیای کوردی لەســەر جینۆســایدی فەیلییەکان کردوویەتی ـــــ دەیکات بووبێتە سەرچاوەیەکی باشی زانیاری بۆ

ڕێکخراو و ناوەند و میدیا نێودەوڵەتییەکان، تاوەکو لە مەزڵوومیەتی کورد تێبگەن)، (٢٧,٦%) لە پلەی دووەم هەرگیز لەگەڵیدانین، پلەی سـێیەمیشـیان؛ بەڕێژەی (١٧,٢%)، گووتویـانە: بێلایەنین. ئەو ئەنجـامە دەرخەری ئەوەیە: ناوەڕۆک و کوالیتی و زمانی کارەکانی میدیای کوردی لەسـەر جینۆسـایدی فەیلییەکان لە ئاستی پێویست نەبووە.

زۆرینەی بەشـداربووانی ڕاپێوینامەکە بەڕێژەی (٤١,٤%)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانین (میدیـای کوردی هەموو یـاخود زۆربەی ئەو چەواشـەکارییانەی ئاشـکراکردبێت و ڕاسـتکردبێتەوە کە میدیای عەرەبی و عێراقی بۆ جینۆسـایدی فەیلی و شـاردنەوەی ڕاسـتییەکانیان کردوویانە ـ دەیکەن)، (٣٧,٩%) لە پلەی دووەم لەگەڵ ئەوەدانین، پلەی سـێیەمیشـیان؛ بەڕێژەی (١٠,٣%)، بەشێوەی یەکسان بێلایەنم/ لەگەڵیدام ـیان هەڵبژاردووە. بەپێی ئەو ئەنجامانە: هێشـتا زۆر چەواشـەکاریی میدیای عەرەبی و عێراقی لەبارەی جینۆسایدی فەیلییەکان ماوە، کە میدیای کوردی نەیتوانیوە ئاشکرایان بکات و ڕاستیان بکاتەوە.

(٤٨,٣%)ـی چالاکوانانی بواری جینۆساید لە هەرێمی کوردستان، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانین (میدیـای کوردی هێندە شـرۆڤە و گرنگی بە جینۆسـایدی فەیلییەکان دابێت، هەموو تاکێکی کورد زانیاریی و ئاشـنایەتی لەبارەی کەیسـەکەوە هەبێت)، پلەی دووەمیان؛ بەڕێژەی (٢٧,٦%) لەگەڵیدانین، پلەی سێیەمیشیان؛ بەڕێژەی (١٠,٣) بەڕێژەیەکی یەکسان بێلایەن و لەگەڵیدام ـیان هەڵبژاردووە. ئەوەش دەکرێت ئەو مانایە بگەیەنێت: میدیای کوردی لە شرۆڤە و گرنگیپێدانەکانی بۆ جینۆسایدی فەیلییەکان، تایبەتمەندییە دیمۆگرافییەکانی کۆمەڵگەی کوردستانی لەبەرچاو نەگرتووە.

زۆرینەی چالاکوانانی بواری جینۆسـاید بەڕێژەی (٤١,٤%)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، بەڕێژەیەکی یەکسـان هەرگیز لەگەڵئەوەدا نین/ لەگەڵیدانین (میدیای کوردی کاری پرۆفیشناڵانەی لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان کردبێت و بووبێتە هۆکارێک بۆئەوەی زانیاریی پێویسـت لەبارەی تاوانەکە لەبەردەسـت بێت)، پلەی دووەمیشـیان؛ بەڕێژەی (١٧,٢%) لەگەڵئەوەدان، میدیای کوردی کاری باشی بەو بوارە کردووە. ئەو ئەنجامەش بەگشتی ئەوە پیشاندەدات: کارەکانی میدیای کوردی لەبارەی جینۆسایدی فەیلییەکان زیاتر لەیەک یاخود چەند ڕەهەندێکی دیاریکراوی تاوانەکە بووە و بەقووڵی و چڕی کاری لەسەر هەموو ڕەهەندەکانی تاوانەکە نەکردووە.

پلەی یەکەمی چالاکوانانی بواری جینۆسـاید لە هەرێمی کوردسـتان بەڕێژەی (٣٧,٩%) هەرگیز لەگەڵئەوەدانین (میدیای کوردی بەدەر لە زمانی کوردی بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و زمانە زیندووەکانی جیهان کاری ڕۆژنامەوانی لەسـەر جینۆسـایدی فەیلییەکان پێشـکەشـکردبێت)، (٢٧,٦%) لە پلەی دووەم

بەشێوەی یەکسان لەگەڵیدانیم/ بێلایەنم ـیان هەڵبژاردووە، پلەی سێیەمیشیان؛ بەرێژەی (٦,٩%)، لەگەڵیدان. بەوپێیەش میدیای کوردی زیاتر بە زمانی کوردی کاری لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان کردووە و پەیامەکانی بۆ ناوخۆی کۆمەڵگەی کوردستان بووە و نەیتوانیوە بە زمانە زیندووەکانی جیهان کار لەسەر ئەو پرسە بکات.

زۆرینەی چالاکوانانی بواری جینۆساید بەرێژەی (٤٤,٨%)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، لەگەڵ ئەوەدانین (میدیای کوردی زەمینەی ئەوەی سازاندبێت، کە پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان بەردەوام بابەتێکی کراوە و نیشتیمانی و جێگە گفتوگۆ بێت لە کۆمەڵگەدا)، پلەی دووەمیان بەرێژەی (٣٧,٩%)، هەرگیز لەگەڵیدانین، پلەی سێیەمیشیان؛ بەرێژەی (١٠,٣%) بێلایەن ـیان هەڵبژاردووە. ئەو ئەنجامە جەختکردنەوەیە لەوەی، کە میدیای کوردی تەنها لە ماوەیەکی دیاریکراو باس لەو پرسە دەکات و پاشان فۆکەسی لەسەر نامێنێت و لە کۆمەڵگە نابێتە جێگەی گفتوگۆ و باس و خواس.

پلەی یەکەمی چالاکوانانی بواری جینۆساید لە هەرێمی کوردستان بەرێژەی (٤٤,٨%) لەگەڵ ئەوەدانین (میدیای کوردی ڕۆڵی گرنگی لە تۆمارکردن و چەسپاندنی ژمارەی قوربانیانی جینۆسایدی فەیلییەکان بە وردەکاری دیمۆگرافییان هەبێت)، (٢٧,٦%) لە پلەی دووەم هەرگیز لەگەڵیدانین، پلەی سێیەمیشیان؛ بەرێژەی (١٧,٢%)، بێلایەنن. ئەو ئەنجامەش دەرخەری ئەو ڕاستییە میدیای کوردی ڕۆڵی گرنگی لە تۆمارکردن و چەسپاندنی ژمارەی قوربانیانی جینۆسایدی فەیلییەکان بە وردەکاری دیمۆگرافییان نەبووە.

زۆرینەی بەشداربووان لە چالاکوانانی بواری جینۆساید لە هەرێمی کوردستان بەرێژەی (٣٤,٥%)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، لەگەڵ ئەوەدانین (ڕاپۆرتەکانی میدیای کوردی هەڵەی زەق و زانیاریی هەڵە و بێئاگایی لە وردەکارییەکانی دەربارەی جینۆسایدی فەیلییەکان تێدابێت)، (٢٧,٦%)یان لە پلەی دووەم هەرگیز لەگەڵیدانین، پلەی سێیەمیشیان؛ بەرێژەی (٢٤,١%)، بێلایەنیان هەڵبژاردووە. ئەو ئەنجامانەش ئاماژەن بۆئەوەی ڕاپۆرتەکانی میدیای کوردی لەبارەی جینۆسایدی فەیلییەکان تاڕادەیەکی زۆر وردی و ڕاستگۆییان تێدایە. بڕوانە خشتەی (١).

## خشتەی (١)

## بۆچوونی چالاکوانانی بواری جینۆساید لەبارەی جۆر و شێوازی بایەخپێدانی میدیای کوردی بە جینۆسایدی فەیلییەکان لە عێراق پیشاندەدات.

| برگەکان | ئەگەرەکان | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | زۆر لەگەڵیدام | | لەگەڵیدام | | بێلایەنم | | لەگەڵیدانیم | | هەرگیز لەگەڵیدانیم | |
| | د | % | د | % | د | % | د | % | د | % |
| میدیای کوردی ئەرکی ناساندنی کۆمەڵکوژییەکەی بەجێگەیاندووە. | ٢ | ٣,٤ | ٨ | ١٣,٨ | ٤ | ٦,٩ | ٣٠ | ٥١,٧ | ١٤ | ٢٤,١ |
| میدیای کوردی تەنها لە ساڵرۆژی تاوانەکە باسی جینۆسایدی فەیلییەکان دەکات. | ٢٤ | ٤١,٤ | ٢٤ | ٤١,٤ | ٠ | ٠ | ٦ | ١٠,٣ | ٤ | ٦,٩ |
| بەشێوەیەکی بەردەوام کار لەسەر ئەو تاوانە (کردووە- دەکات) و بەڵگەداری دەکات. | ٨ | ١٣,٨ | ٦ | ١٠,٣ | ٠ | ٠ | ٢٢ | ٣٧,٩ | ٢٢ | ٣٧,٩ |
| لەڕێگەی هەموو ژانرە ڕۆژنامەنووسییە جیاوازەکان: (هەواڵ، ڕاپۆرت، وتار، چاوپێکەوتن، بەدواداچوون، ..هتد) کاری لەسەر پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان (کردووە - دەکات). | ٢ | ٣,٤ | ١٢ | ٢٠,٧ | ٢ | ٣,٤ | ٢٤ | ٤١,٤ | ١٨ | ٣١ |
| بووەتە ئەرشیفێك بۆ پاراستنی ڕووداو و بەڵگەنامەکانی پەیوەست بە جینۆسایدی فەیلییەکان. | ٤ | ٦,٩ | ٢ | ٣,٤ | ١٤ | ٢٤,١ | ٢٠ | ٣٤,٥ | ١٨ | ٣١ |
| ئەو کارانەی میدیای کوردی لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان (کردوویەتی- دەیکات) بووەتە سەرچاوەیەکی باشی زانیاری بۆ ڕێکخراو و ناوەند و میدیا نێودەوڵەتییەکان تا لە مەزلومیەتی کورد تێبگەن. | ٤ | ٦,٩ | ٨ | ١٣,٨ | ١٠ | ١٧,٢ | ٢٠ | ٣٤,٥ | ١٦ | ٢٧,٦ |
| هەموو یاخود زۆربەی ئەو چەواشەکاریانەی ئاشکرا کردووە و ڕاستکردووەتەوە، کە میدیای عەرەبی و عێراقی بۆ جینۆسایدی فەیلی و شاردنەوەی ڕاستییەکانیان (کردووە- دەیکەن). | ٠ | ٠ | ٦ | ١٠,٣ | ٦ | ١٠,٣ | ٢٢ | ٣٧,٩ | ٢٤ | ٤١,٤ |
| هێندە شرۆڤە و گرنگی بە جینۆسایدی فەیلییەکان داوە، هەموو تاکێکی کورد زانیاری و ئاشنایەتی لەبارەیەوە هەیە. | ٢ | ٣,٤ | ٦ | ١٠,٣ | ٦ | ١٠,٣ | ١٦ | ٢٧,٦ | ٢٨ | ٤٨,٣ |
| میدیای کوردی کاری پرۆفیشناڵانەی لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان کردووە و بووەتەهۆی ئەوەی زانیاریی پێویست لەبارەی تاوانەکە لەبەردەست بێت. | ٠ | ٠ | ١٠ | ١٧,٢ | ٠ | ٠ | ٢٤ | ٤١,٤ | ٢٤ | ٤١,٤ |
| میدیای کوردی بەدەر لە زمانی کوردی بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزیی و زمانە زیندووەکانی جیهان کاری ڕۆژنامەوانیی لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان پێشکەشکردووە. | ٤ | ٦,٩ | ٠ | ٠ | ١٦ | ٢٧,٦ | ١٦ | ٢٧,٦ | ٢٢ | ٣٧,٩ |
| میدیای کوردی زەمینەی ئەوەی سازاندووە، کە پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان بەردەوام بابەتێکی کراوە و جێگە گفتوگۆ بێت. | ٢ | ٣,٤ | ٢ | ٣,٤ | ٦ | ١٠,٣ | ٢٦ | ٤٤,٨ | ٢٢ | ٣٧,٩ |
| ڕۆڵی گرنگی لە تۆمارکردن و چەسپاندنی ژمارەی قوربانیانی جینۆسایدی فەیلییەکان بەوردەکاری دیمۆگرافییان هەبووە. | ٦ | ١٠,٣ | ٠ | ٠ | ١٠ | ١٧,٢ | ٢٦ | ٤٤,٨ | ١٦ | ٢٧,٦ |
| ڕاپۆرتەکانی میدیای کوردی هەڵەی زەق و زانیاریی هەڵە و بێئاگایی لە وردەکارییەکانی دەربارەی جینۆسایدی فەیلییەکان تێدایە. | ٠ | ٠ | ٨ | ١٣,٨ | ١٤ | ٢٤,١ | ٢٠ | ٣٤,٥ | ١٦ | ٢٧,٦ |

- **ستراتیژی کارکردنی میدیای کوردی لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان**

پلەی یەکەمی چالاکوانانی بواری جینۆسـایدـ لە هەرێمی کوردسـتان بەڕێژەی (٣٧,٩%) زۆر لەگەڵ ئەوەدان (ئاراستەیەکی یەکگرتووی نیشتیمانیی خزمەتگوزار بە کارکردن لەسـەر دۆسـیەی جینۆسـایدی فەیلییەکان لە عێراق و شـێوازی کارکردن لەسـەر لایەنە جیـاوازەکـانی تـاوانەکە پێکبهێنرێـت)، (٢٠,٧%) لە پلەی دووەم لەگەڵیدانین، پلەی سـێیەمیشـیان؛ بەڕێژەی (١٧,٢%)، لەگەڵ ئەو بۆچوونەدان. لە ئەنجامەکانەوە ڕووندەبێتەوە: تائێستا ئاراستەیەکی یەکگرتووی نیشتیمانی لە بواری میدیا بۆ کارکردن لەسـەر پرسـی جینۆسـایدی فەیلییەکان لە هەرێمی کوردسـتان نەخەملێوە، تاوەکو بەشێوەیەکی دیراسەکراو کار لەسەر لایەنە جیاوازەکانی تاوانەکە بکرێت.

زۆرینەی بەشـداربووانی ڕاپێوییەکە بەڕێژەی (٣٤,٥%)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، زۆر لەگەڵ (هێنانەکایەی دنیابینییەکی ڕوون، پرۆژەی هاوبەشی میدیایی و کارکردنی پێکەوەیی بۆ بەدیهێنان و دوورکەوتنەوە لە کاری هەڕەمەکیانەن لەسـەر دۆسـیەی جینۆسـایدی فەیلییەکان لە میدیا)، پلەی دووەم بەشـێوەیەکی یەکسـان لەگەڵیدام/ لەگەڵیدانیم بەڕێژەی (٢٠,٧%)، پلەی سـێیەمیشـیان؛ بەڕێژەی (١٣,٨%)، هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانین. ئەو ئەنجامەش پیشـانی دەدات، میدیای کوردی دنیابینی و پرۆژەی هاوبەشی بۆ کارکردن لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان نییە.

وەک پلەی یەکەم، بەشـی زۆری چالاکوانانی بواری جینۆسـایدـ لە هەرێمی کوردسـتان بەڕێژەی (٥١,٧%) زۆر لەگەڵ (کارکردنی نیشـتیمانیانەن لەسـەر پرسـی جینۆسـایدی فەیلییەکان و تێکەڵنەکردنی بە ئەجێندای سـیاسـیی و حیزبی)، (١٧,٢%) لەپلەی دووەم لەگەڵیدانین، (١٣,٨%)یشـیان لەپلەی سـێیەم هەرگیز لەگەڵئەوەدانین. ئەو ئەنجامە هێمایە بۆ گرنگی و پێویستی کارکردنی نیشـتیمانیانەی میدیایی بەدوور لە ئەجێندای حیزبی و سـیاسـی لە پرسـی جینۆسـایدی فەیلییەکان لە عێراقدا. هەروەکچۆن ئاماژەیە بۆئەوەی تائێسـتاش میدیای کوردی بە ئەجێندای حیزبی و سـیاسـی کاری لەسـەر تاوانەکە کردووە و ئەوەش دەخوێنرێتەوە، میدیای حیزبیش لەڕووی چەندێتییەوە بایەخپێدانی بۆ پرسەکە هەبووە.

زۆرینەی چالاکوانانی بواری جینۆساید لە هەرێمی کوردستان بەڕێژەی (٥١,٧%)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، زۆر لەگەڵ ئەوەدان (بوودجەی پێویسـت بۆ بەرهەمهێنانی

چەندین فیلیمی سینەمایی و دیکۆمێنتاریی بە زمانە زیندووەکان و بەبەشدارییپێکردنی دەرهێنەر و هونەرمەندە بەناوبانگە جیهانییەکان لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان تەرخانبکرێت)، (%١٧,٢) لە پلەی دووەم هەرگیز لەگەڵ ئەوەدانین، پلەی سێیەمیشیان؛ بەشێوەی یەکسان لەگەڵیدام/ بێلایەنم/ لەگەڵیدانیم بەرێژەی (%١٠,٣) هاتووە. بەپێی ئەو ئەنجامە: تائێستا لە میدیای کوردی بوودجەی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی فیلمی سینەمایی و دیکۆمێنتاریی بە زمانە زیندووەکان، بەبەشدارییپێکردنی دەرهێنەر و هونەرمەندە بەناوبانگە جیهانییەکان لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان تەرخان نەکراوە.

زۆرینەی چالاکوانەکانی بواری جینۆساید بەرێژەی (%٣٧,٩)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، زۆر لەگەڵ ئەوەدان (هەڵمەتێکی نیشتیمانیی میدیایی بۆ ئاشناکردن و ناساندنی جینۆسایدی فەیلییەکان بە گەنجان لە ڕێگەی ناوەندەکانی خوێندن و ڕێکخراوەکان) بەڕێوەببرێت، (%٣١) لەپلەی دووەم لەگەڵئەوەدان، پلەی سێیەمیشیان؛ بەرێژەی (%١٧,٢)، هەرگیز لەگەڵئەوەدانین. ئەنجامەکان هێمان بۆ پێویستی ئەنجامدانی هەڵمەتی نیشتیمانیی میدیایی بۆ ئاشناکردن و ناساندنی جینۆسایدی فەیلییەکان بە گەنجانی هەرێمی کوردستان لە ڕێگەی ناوەندەکانی خوێندن و ڕێکخراوەکان. هەروەکچۆن دەشێت ئەوەشی لێ بخوێنرێتەوە، کە تائێستا بۆشاییەک لەو ڕووەوە هەیە.

بەشی زۆری چالاکوانان بەرێژەی (%٤٨,٣)، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، زۆر لەگەڵ (سوودوەرگرتن و گواستنەوەی ئەزموونی کارکردنی میدیایی ئەو وڵاتانەن، کە جینۆساید و تاوانی هاوشێوەیان بەسەرداهاتووە بۆ میدیای هەرێمی کوردستان)، (%٢٠,٧) لە پلەی دووەم لەگەڵ ئەوەدان، پلەی سێیەمیشیان؛ بەرێژەی (%١٣,٨)، بەشێوەیەکی یەکسان لەگەڵیدانیم/ هەرگیز لەگەڵیدانم هاتوون. ئەنجامەکان ئاماژەن بۆ گرنگی سوودوەرگرتن لە ئەزموونی کارکردنی میدیایی وڵاتان لەبواری جینۆساید. هەروەها گوزارشت لە هەبوونی بۆشایی لەوجۆرە لە کارکردنی میدیای کوردی دەکات.

(٤٨,٣٪) چالاکوانانی بواری جینۆساید لە هەرێمی کوردستان، کە لە پلەی یەکەمدا دێت، زۆر لەگەڵ (بەخشینی ئازادی و دەستکراوەیی زیاترن بە میدیا و ڕۆژنامەوانیی کورد بۆ کارکردن لەسەر پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان)، (%٢٠,٧) لە پلەی دووەم لەگەڵئەوەدان، پلەی سێیەمیشیان؛ بەرێژەی (%١٧,٢)، بێلایەن ـــیان

هەڵبژاردووە. بەپێی ئەنجامەکان: گرنگە ئازادی و دەســـــتکراوەیی زیاتر بۆ میدیا و ڕۆژنامەوانیی کورد بەمەبەستی کارکردن لەســەر پرســی جینۆســایدی فەیلییەکان فەراهەمبکرێت.

بڕوانە خشتەی (٢).

**خشتەی (٢):** بۆچوونی چالاکوانانی بواری جینۆساید لەبارەی دانانی ستراتیژێك بۆ کارکردنی میدیای کوردی لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان پیشاندەدات.

| برگەکان | ئەگەرەکان | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | زۆر لەگەڵیدام | | لەگەڵیدام | | بێلایەنم | | لەگەڵیدانیم | | هەرگیز لەگەڵیدانیم | |
| | د | % | د | % | د | % | د | % | د | % |
| دیاریکردنی ئاراستەیەکی یەکگرتووی نیشتیمانی خزمەتگوزار بە دۆسیەکە و شێوازی کارکردن لەسەر لایەنە جیاوازەکانی تاوانەکە. | ٢٢ | ٣٧,٩ | ١٠ | ١٧,٢ | ٨ | ١٣,٨ | ١٢ | ٢٠,٧ | ٦ | ١٠,٣ |
| هێنانەکایەی دنیابینییەکی ڕوون و پرۆژەی هاوبەشی میدیایی و کارکردنی پێکەوەیی بۆ بەدیهێنان و دوورکەوتنەوە لەکاری هەرەمەکیانە. | ٢٠ | ٣٤,٥ | ١٢ | ٢٠,٧ | ٦ | ١٠,٣ | ١٢ | ٢٠,٧ | ٨ | ١٣,٨ |
| کارکردنی نیشتیمانیانە لەسەر پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان تێکەڵ نەکردنی بە ئەجێندای سیاسی و حیزبی. | ٣٠ | ٥١,٧ | ٦ | ١٠,٣ | ٤ | ٦,٩ | ١٠ | ١٧,٢ | ٨ | ١٣,٨ |
| تەرخانکردنی بوودجەی پێویســـت بۆ بەرهەمهێنانی چەندین فلیمێکی سینەمایی و دیکۆمێنتاریی بە زمانە زیندووەکان و بە بەشـــــداریپێکردنی دەرهێنەر و هونەرمەنــدە بەنــاوبــانگە جیهانییەکان. | ٣٠ | ٥١,٧ | ٦ | ١٠,٣ | ٦ | ١٠,٣ | ٦ | ١٠,٣ | ١٠ | ١٧,٢ |
| بەڕێوەبردنی هەڵمەتێکی نیشتیمانیی میدیایی بۆ ئاشناکردن و ناســـاندنی جینۆســـایدی فەیلییەکان بە گەنجان لە ڕێگەی خوێندنگە، زانکۆ و ڕێکخراوەکان. | ٢٢ | ٣٧,٩ | ١٨ | ٣١ | ٢ | ٣,٤ | ٦ | ١٠,٣ | ١٠ | ١٧,٢ |
| ســوودوەرگرتن و گواســـتنەوەی ئەزموونی کارکردنی میدیایی ئەو وڵاتانەی جینۆساید و تاوانی هاوشێوەی تێدا ئەنجامدراوە. | ٢٨ | ٤٨,٣ | ١٢ | ٢٠,٧ | ٢ | ٣,٤ | ٨ | ١٣,٨ | ٨ | ١٣,٨ |
| بەخشـــینی ئازادی و دەســـتکراوەییەکی زیاتر بە میدیا و ڕۆژنامەوانیی کورد بۆ کارکردن لەســەر پرســی جینۆســایدی فەیلییەکان. | ٢٨ | ٤٨,٣ | ١٢ | ٢٠,٧ | ١٠ | ١٧,٢ | ٤ | ٦,٩ | ٤ | ٦,٩ |

**ئەنجام:**

١. میدیای کوردی تەنها لە ساڵرۆژی تاوانەکە و لە ڕێگەی بەکارهێنانی چەند ژانرێکی دیاریکراوی ڕۆژنامەنووسیی کاری لەسەر پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان کردووە و تواناى بەڵگەدارکردنی ئەو تاوانەی نەبووە و نەشبووەتە ئەرشیفێک بۆ پاراستنی ڕووداو و بەڵگەنامەکانی پەیوەست بەو ڕووداوە تاوانکارییە.

٢. ئەو کارانەی میدیای کوردی لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان (کردوویەتی– دەیکات) نەبووەتە سەرچاوەی پێویستی زانیاری بۆ ڕێکخراو و ناوەند و میدیا نێودەوڵەتییەکان، وەکچۆن لەئاستی ئاشکراکردن و ڕاستکردنەوەی ئەو چەواشەکارییانەش نەبووە، کە میدیای عەرەبی و عێراقی بۆ جینۆسایدی فەیلییەکان و شاردنەوەی ڕاستییەکانیان (کردووە– دەیکەن).

٣. میدیای کوردی ڕۆڵێکی لاوازی لە سازاندنی ئەو زەمینەیە هەبووە، کە پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان بەردەوام بابەتێکی کراوە و نیشتیمانی و جێگە گفتوگۆ بێت.

٤. ڕاپۆرتەکانی میدیای کوردی لەبارەی جینۆسایدی فەیلییەکان تاڕادەیەکی زۆر وردی و ڕاستگۆییان تێدایە.

٥. پێویستی پێکهێنانی ئاراستەیەکی یەکگرتووی نیشتیمانیی خزمەتگوزار تایبەت بە کارکردن لەسەر دۆسییەی جینۆسایدی فەیلییەکان لە عێراق و شێوازی کارکردن لەسەر ڕەهەندە جیاوازەکانی تاوانەکە و دوورکەوتنەوە لە کاری هەڕەمەکیانە.

٦. گرنگی کارکردنی نیشتیمانیانە لەسەر پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان و تێکەڵنەکردنی بە ئەجێندای سیاسی و حیزبی.

٧. تەرخانکردنی بوودجەی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی چەندین فیلمی سینەمایی و دیکۆمێنتاریی بە زمانە زیندووەکان و بە بەشداریپێکردنی دەرهێنەر، ئەکتەر و هونەرمەندە بەناوبانگە جیهانییەکان لەسەر جینۆسایدی فەیلییەکان.

٨. ئەنجامدانی هەڵمەتێکی نیشتیمانیی میدیایی بۆ ئاشناکردن و ناساندنی جینۆسایدی فەیلییەکان بە گەنجان لە ڕێگەی ناوەندە جیاجیاکان.

٩. سوودوەرگرتن و گواستنەوەی ئەزموونی کارکردنی میدیایی ئەو وڵاتانەی جینۆساید و تاوانی هاوشێوەی تێدا ئەنجامدراوە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ تاوانەکە.

١٠. زیادکردنی پانتایی زیاتری ئازادی و دەستکراوەیی بۆ میدیا و ڕۆژنامەوانیی کورد بەمەبەستی کارکردن لەسەر پرسی جینۆسایدی فەیلییەکان.

**پێشنیاز و ڕاسپاردە:**

١. دیاریکردنی ستراتیژێکی نیشتیمانیی یەکگرتوو و بەهێز و فرەلایەن لەنێویشیان میدیایی، تایبەت بە کارکردنی ئامانجدار لەسەر تەواوی ڕەهەندە جیاجیاکانی پەیوەست بە جینۆسایدی فەیلییەکان.

٢. نووسین و بەرهەمهێنانی کتێب و سیناریۆی فیلم و دراما و دیکۆمێنتاریی مێژوویی لە ڕووی هونەریی و تەکنیکی و بە بەشداریی ئەکتەران و فلیمسازان لەبارەی جینۆسایدی فەیلییەکان و بڵاوکردنەوەی بە زمانە زیندووەکانی جیهان.
٣. بەرهەمهێنانی بەرنامە و چاوپێکەوتن لەگەڵ قوربانیانی جینۆسایدی فەیلی و کەسوکاریان و مێژوونووسان و پسپۆران لە میدیا و وەرگێڕانی بۆ زمانی عەرەبی و ئینگلیزی.
٤. کردنەوەی ماڵپەڕێکی نێودەوڵەتی بە زمانە زیندووەکانی جیهان پەیوەست بە جینۆسایدی گەلی کوردستان و لەنێویشیان جینۆسایدی فەیلییەکان.

## سەرچاوەکان:


١. ڕەئوف، ئاریان و حمە سەعید، پشتیوان، (٢٠١٧): دەستێوەردانی مرۆیی لە پرۆسەکانی جینۆساید جینۆسایدی گەلی کورد بەنمونە، گۆڤاری زانکۆی گەرمیان، ژمارەی تایبەت بە کۆنفرانسی جینۆساید، کەلار.
٢. سامان، فەرەیدون (٢٠٢٢): پرسی فەیلییەکان، زمان ناسنامە کولتوور، ماڵپەڕی گۆڤاری ئەنفالستان، ڕۆژی وەرگرتن (٢٠٢٣/١/١٧).

http://www.anfalistan.com/2022/02/27/%d9%be%d

٣. فیلمی دۆکیۆمێنتاریی، (٢٠١٧): ماڵپەڕی کەناڵی ئاسمانی کوردستان (٢٤)، جینۆسایدی کوردی فەیلی، ڕۆژی وەرگرتن: (٢٠٢٣/١/٢٠).

https://www.kurdistan24.net/ckb/production_episode/9696

٤. موقع (pukmedia Arabi)، (٢٠١٦): إبادة الفيليين..جينوسايد دون رحمة، تأريخ الدخول: (٢٠٢٣/١/٢١).

https://www.pukmedia.com/AR/details/?Jimare=89300

٥. طيفوري، محمد، (٢٠١٩): مؤرخ اللحضة، موقع الإقتصادية– جريدة العرب الإقتصادية الدولية، تأريخ الدخول: (٢٠٢٣/١/٢٧).

https://www.aleqt.com/2019/02/13/article_1541976.html

٦. العياشي، يونس، (٢٠٢١): أي دور للإعلام في عدالة المحاكمة الجنائية؟، موقع مغرب القانون، تأريخ الدخول: (٢٠٢٣/١/٢٩).

https://www.maroclaw.com/%D8%A3%D9%8A-%D8%AF%D9



# ڕوانگەیەك لە ئەرکی میدیایی
# بۆ پرسی جینۆساید و ئەنفال

فتاح محمود رۆستم (فەتاح تەنیا)
توێژەری بواری ئەنفال و جینۆساید



دوای (٣٦) ساڵ بەسەر جینۆساید و ئەنفالدا تێپەڕی لە ساڵی (١٩٨٨)دا، لەگەڵ بەردەستبوونی زانیاریی زیاتر لەسەر جینۆساید و ئەنفال و لەگەڵ بەردەوامبوونی گێڕانەوەی ئەو ڕووداوانە، هێشتا زۆر شت ماوەکە توێژینەوەی لەسەر بکرێت، ئەبێت ئەوە لە کەیسی ئەنفالدا فێربین سەبارەت بە خستنەڕووی ڕۆڵی میدیا لە دڕندەیی ڕژێمی بەعس و نیشاندانی چەندین گۆڕی بەکۆمەڵ. لە سەردەمی ئازادبوونی عێراقی دوای دیکتاتۆر، بۆیە لە سەردەمی تێربوونی سۆشیال میدیا و نزیکبوونەوە لە هاتنەناوەوەی ئامێرە مۆبایلەکان و گۆڕانکارییە دراماتیکییەکان لە میدیای هەواڵی تەقلیدیدا، لە هەموو کاتێک گرنگترە، کە لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان میدیا و دڕندەیی دەسەلاتی بەعس بکرێت. پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری و پەیوەندییەکان دیمەنی میدیای لە قاڵب داوە و دڕندەیی ڕژێمی بەعس دۆزینەوەی گۆڕی بەکۆمەڵ لە ناوچە جیاجیاکانی عێراقدا، ئەمەش پرۆسەی گەڕانەوەی ڕووفاتەکانی بۆ کوردستان قورستر کردووە، دوای (٢١)ساڵ هێشتا چەندین ڕووفاتی ئازیزەکانمان لە نێو گۆڕەبەکۆمەڵەکاندا ماون و نەگەڕێنراونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا میدیا کارێکی بۆ ئەوە نەکردووە، کە ئەم هەموو گۆڕەبەکۆمەڵ و دڕندەیەی ڕژێمی بەعس پیشانی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بدەن، هەر بۆیە دەتوانرێت ئامرازەکانی سۆشیال میدیا بۆ خستنەڕوو و نیشاندان و بەشداریکردن لە ئاست ناساندنی زیاتری پرۆسەی جینۆساید و ئەنفالدا بەکاربهێنرێت.

میدیای کوردی لەو ماوە زۆردا کە ٣٦ ساڵە، یەک جۆر کارکردن و یەک جۆر بەرنامە و دیدار و گفتوگۆی لەسەر تاوانی ئەنفال هەبووە، دەتوانین بڵێین ئەم جۆرە کارکردنەش تەقلیدی بووە و ئەوەندەی ماندووکردن و ئازاردانی ڕۆحی بەجێماوەکانی ئەنفال و میللەتی کورد بووە، هێندە

خزمەتکردن نەبووە بە ناسـاندنی تاوانەکە خۆی و گەلی کورد بەگشتی.

بۆیە لەم ڕوانگەیەوە دەتوانرێـت میدیا ئەو گەیەنەرە بەهێزەبێت بۆ نیشاندان و کۆکردنەوەی ئەو هەموو بەڵگە ڕاسـتەقینە توندڕەوییەی بەرامـبەر بە مـرۆڤـی کـورد بەکـارهـێنراون، لە ئەنجـامی ئەو پێشـکەوتن و تـاڕادەیەک هەرزانی تەکنـەلـۆژیـای پەیـوەنـدیـیەکـان، هاوڵاتیانی ئاسـایی لە سـەرانسـەری کـوردسـتـان دەتـوانـن گـرتەی ڕاستەوخۆی شایەتحاڵەکانی ئەنفال بگرن، کە پێشـێلکارییە بەرامبەر بە مـافـی مـرۆڤ، لەم ڕوانـگەیەوە سـۆشـیال میدیا بووە بە ئەکتەرێکی جیهانی، ئەمەش کاریگەری لەسـەر ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکـان دەبێـت، سـەرەڕای ئەو گەیشـتنە درێژەی کە پێشـکەوتنە تەکنەلۆژییەکان میدیای هەواڵی تەقلیدی و سـۆشـیال میدیای بەدەسـتهێناوە، کاریگەرییەکانی میدیا لە ڕووداوەکان و نیشاندانی دڕندەیی ڕژێمی بەعس سـەبارەت بە گۆڕی بەکۆمەڵ هێشـتا بابەتێکی ئاڵۆزە. بە تایبەتی ئێمە لەگەڵ چەندین پرسیاری پڕ لە کێشەدا ماوینەتەوە، سەرەڕای تێپەڕبوونی کات لە ئەنفالدا تا ئێستا چارەسـەرنەکراون. میدیا چ ڕۆڵێک دەگـێـڕێـت لە ئـاگـادارکـردنەوەی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە دڕنـدەیی بەعس، بۆیە چۆن کـاریگەرییەکـانی ڕاپۆرتکردنی میـدیـای لە جەنجـاڵی ئەوەی بەسـەرمـان هـاتـووە لە پرۆسـەی ئەنفال و جینۆسـاید بیخەینەڕوو؟ ڕۆڵی میـدیـا چییە لە هەوڵدان بۆ هاندانی باشـترکردنی ململانێ یـان ئـاشـتەوایی دوای ململانێ؟ ئێسـتـا لە سـەردەمی پەیوەنـدییەکـان کە بە شـێوەیەکی دراماتیک لە ژێر کاریگەریی سۆشیال میـدیـادایە، میـدیـا بۆ دڕنـدەیی جەماوەری نیشـاندانی ڕژێمی بەعس و لێکەوتەکانی بخرێتەکار.

پەیـامە میـدیـاییەکـان کـاریگەرییە گرنگەکان دەگەیەنن:

میدیای گشـتی و جۆرەکانی تری تەکنەلۆژیـای پەیوەنـدیکردن نوێ کـاریگەرییەکی گەورەیـان هەیە لە

یارمەتیدانی بۆ ئاراستەی جوڵاندنی ڕای گشتی و هەستی بنەڕەتی. ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ڕادیۆ هەموویان سەرچاوەی گرنگی زانیاریی سەرەتایین سەبارەت بە کەسانی دیکە و شوێنەکانی تر و ئەمەش خۆی دەتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ دروستکردنی لێکتێگەیشتن، ئەگەر بە شێوەیەکی دادپەروەرانە و یەکسان و بێ هەوکردن پێشکەشبکرێت.

هەروەها میدیا میکانیزمێکی گرنگە بۆ لێپرسینەوە: پرسە گرنگەکان دەوروژێنێت، بۆ نموونە تاوانەکان، کە ئەگەرنا ڕەنگە هەرگیز بە ئاشکرا مشتومڕیان لەسەر نەکرێت یان قسەیان لەسەر نەکرێت. هەروەها میدیا ڕۆڵێکی گرنگی هەیە بۆ ڕێگەگرتن لە حکومەتەکان بۆ هەنگاونان لەسەر سیاسەتی پاکتاوکردن، ئەم جۆرە لە میدیا زۆر جار تووشی سزایی لێپرسینەوە یان داخستن و کوشتن بوونەتەوە.

بەڵام میدیا دەتوانێت لە هەندێک حاڵەتدا ببێتە ئامرازێک بۆ بڵاوکردنەوەی پەیام و بەهای درۆین و ئیلهامبەخشەکان، تاوانەکان بە سەرکەوتن ئەژماردەکەن بۆ دەسەڵاتەکەیان و لە پێش چاوی جەماوەر کە ڕێزگرتن یان گفتوگۆی باش بەرەوپێش نادەن. پەیامە نەرێنییەکان دەتوانن کۆمەڵگاکان دابەشبکەن و دەتوانن یارمەتیدەربن لە بەردەوامکردنی ئەو چەشنە چەقبەستووانەی کە توندوتیژی پەروەردە دەکەن.

وێناکردنی میدیایی هەندێکجار دەتوانێت خزمەت بە خراپترکردنی گێڕانەوەی هێزە ئۆپۆزسیۆنەکان بکات. زۆرجار میدیاکان پێیان باشە لەسەر ململانێ کاربکەن، لەم ڕوانگەیەوە میدیای نوێ خزمەت بە دارشتنی تێڕوانینەکان دەکات بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆتر ئینتەرنێت شێوازی پەیوەندیکردنی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا بە شێوەیەکی ڕیشەیی گۆڕیوە، وەک ئامرازێکی کارلێکی کۆمەڵایەتی، وێب خەڵک کۆدەکاتەوە، کە بەرژەوەندی یان ئامانجیان هاوبەشە و ئەمەش دەتوانێت هەستکردن بە سەربەخۆیی زیاتر بکات.

ئەرکی میدیا ئاراستەکردنی تاکە کە گرنگی بدات بە پرسی نەتەوەکەی بە

ڕێگەی میدیای هاوڵاتیبوون، کە لە ئێستادا جیهانی تەنیوە و کاریگەرییەکی زۆری هەیە، کە لە خستنەڕووی ئەو نەهامەتییانەی بەر نەتەوەکەماندا هاتوون، هەر لە کیمیابارانکردنی شاری هەڵەبجە و جینۆساید و ئەنفالکردنی خەڵکی کوردستان، چونکە لە جیهانی ئەمڕۆماندا دەروازەکان کراوەترن بۆ پیشاندانی تەواو ئەو چیرۆکانەی کە هێشتا کۆمەڵگە نەیبیستوون، ئەرکی ڕاستەقینە میدیا شێوازی کردنە لە سەر ئەو تراژیدیا گەورەیە، کە لە مێژووی نەتەوەکەماندا ڕوویدا، کە جینۆساید و ئەنفالە.

ئەرکی میدیا یان دامەزراوەی میدیایی ئەوەیە خۆی بە بەرپرس بزانێت لە ئاست تاوانەکانی ڕژێمی بەعسدا و کاریان لەسەر بکات، بۆ ئەوەی هەموو جیهان ئاشنابکرێت بە و ڕووداوانەی لە مێژووی گەلەکەماندا ڕوویانداوە وەک تاوانی جینۆساید و ئەنفال.

ئەرکێکی تری میدیا ئەوەیە کە ڕووداوەکان وەک خۆی بگوێزێتەوە بۆ وەرگر، چونکە گواستنەوەی ڕووداوەکان وەک خۆی متمانەی وەرگر بە و میدیایە زیاتر دەکات لە ڕووی ئێتیکی میدیاییەوە.

ئەرکی میدیا ئەوەیە کە نەهامەتییەکانی گەلەکەی لە پێش هەموو شتێکەوە بێت، بەردەم بێت لە خستنەڕووی بۆ بەرچاوی وەرگر، هەروەها یەکێک لە ئەرکەکانی میدیا و میدیاکار ئەوەیە ئالۆزییەکان هێوربکاتەوە، نەک ڕووداوەکان لە قەبارەی خۆی گەورەتر بکات.






پ.ی.د. ئازاد محەمەد سەعید

زانکۆی کۆیە، فاکەڵتی پەروەردە، بەشی کوردی


# ڕۆڵی کارمەندانی تەندروستی لەکاتی کیمیاباران و ئەنفالدا







**پێشەکی:**

ئەنفال یەکێک بوو لە تاوانە گەورەکانی ڕژێمی لەناوچوو، کە بەهەشت قۆناغ ئەنجامدرا و بە دڕندەترین شێوە پەلاماری خەڵکی باشووری کوردستانی دا، دیارە ئەنفالی سێ و چوار زێی بچوک ودەشتی کۆیە و گۆپتەپە و کلێسە و شێخ بزێنی و شوان و چەمچەماڵ و گەرمیان و ..هتد گرتەوە. لە بەشێک لەم گوندانە ڕژێمی لەناوچوو چەکی کیمیایی تیادا بەکارهێنا، هەروەها زیاتر لە هەزاران قوربانی لە ژن ومنداڵ و خەڵکی سڤیل و بێ پشتوپەنا ئەنفالی لێکەوتەوە، پێکهاتەی ڕشتەی سەربازی هەر تیپێک کارمەندێکی تەندروستی هەبوو، کارمەندانی تەندروستی ڕۆڵی کاریگەریان لە بەرزکردنەوەی ورە و وزەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بەتایبەتی لە ناوچە ئازادکراوەکاندا هەبوو، لێرەدا باس لە ڕشتە و پێکهاتەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و ئەرکی دکتۆر و کارمەندانی تەندروستی لە کاتی ئەنفالەکان و چەند ڕووداوێکی واقیعی شۆڕش لە سەردەمی شاخدا دەکەین.

**زاراوە و چەمک و پێناسەی پێناسەی پێشمەرگە و کارمەندی تەندروستی:**

دیارە لە سەردەمی کۆماری مهابادا، پێشەوا قازی موحەمەد لە ساڵی ١٩٤٦دا لەگەڵ وەزیر و ڕاوێژکارەکانیدا لە وتوێژدا بوو دەربارەی ناوێکی شیاو و شایستە بۆ جەنگاوەری کورد، هەر لەو کاتەدا چاپچی پێشەوا دێتە پێشەوە و دەڵێت: "بۆ هێندە خۆتان ماندوودەکەن، مەگەر نەتان بیستووە لە ڕابردوودا لە نێو کوردەواری بە پیاوی لەخۆبووردویان دەگوت (پێشمەرگە)". دیارە ئەو ناو نیشانە پڕ بە پێستی جەنگاوەری کوردە و پێشەوا قازی موحەمەد یەکسەر پەسەندی کرد و لەو ڕۆژەوە ناوی پارێزەر و خۆبەخشی کوردستان ناونراوە پێشمەرگە. لە پێناسەیەکی کورت و پڕواتای سەرکردەی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد جەلال تاڵەبانیدا بۆ پێشمەرگە

دەڵێت: پێشمەرگە تێکۆشەرێکی سیاسی چەکدارە، دەست و دەم و داوێن پاکە، گیانی لەخۆبردوویی هەیە. ئەم پێناسە پڕ واتاو گشتگیرە بۆ مرۆڤی لەخۆبردوو و گیان لەسەردەست، هەروەها بۆ کەمئەندام و پەککەوتەی شەڕی ڕەوای بەرگریکردن لە خاکی پیرۆزی کوردستان و شەهیدی زیندووی داناوە.

هێزی پێشمەرگەی کوردستان، پارێزەری کوردستان بەگشتی و بارەگای سەرکردایەتی و مەڵبەندەکان و تیپەکان و ناوچە ئازادکراوەکان و جەماوەری ژێر فەرمانڕەوایی خۆی و کێشەی ڕەوای نەتەوایەتییە. پێکهاتەکەی بریتیبوو لە فەرماندەیی هێزی پێشمەرگەی کوردستان و جێگرەکانی، بەشی مەکتەبی عەسکەری بەرپرس بوو لە ڕێکخستنەوەی یەکە سەربازییەکان، کە بریتیبوو لە چوار بارەگای مەڵبەند، مەڵبەندی یەک کە بارەگای لە سنووری قەرەداغ و دەوروبەری بوو، مەڵبەندی دوو کە بارەگای لە بەرگەڵو بوو، بارەگای مەڵبەندی سێ لە بالیسان بوو لە سنووری دۆڵی خۆشناوەتی، مەڵبەندی چوار لە سنووری دۆڵی سماقولی بوو، دواتر لە ساڵی ١٩٨٧ چوون بۆ سنووری بادینان. لێپرسراوی مەڵبەند کە بەرپرسی یەکەکانی پێشمەرگەی سنووری مەڵبەندەکەی خۆی کە لە چەند تیپێک پێکهاتبوو، تیپی تایبەتی مەڵبەند کە بریتیبوو لە هێزی پشتیوان و دەستەی هەندەسە کە بەرپرسبوون لە دانان و پوچەڵکردنەوەی مین، هەروەها بەرپرسبوون لە ڕۆکێتەکانی تۆڵە و ژمارەیەک هاوەن و دۆشکای یەک لولە و دوو لولە و چوار لولە، کە تەنها لە بەرگەڵو هەبوو. جێگرەکانی مەڵبەند و بەشی ڕێکخستن یان سیاسی، بەشی دارایی مەڵبەند و دادگای شۆڕش و کەرتی سجن و نەخۆشخانە یان بنکەی تەندروستیی شۆڕش و ناوەندی کۆمەڵایەتی و بەشی ڕاگەیاندن کە تەنها لە مەڵبەندی دوو بوونیان هەبوو، لە

ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان و هەردوو ڕۆژنامەکانی شۆڕش بەرپرسبوون: ڕێبازی نوێ کە بە زمانی شیرینی کوردی و شەرارە کە بە زمانی عەرەبی دەردەچوون، یەکێتیی زانایانی ئایینی، مەلاو پێشنوێژ خوێنەکان، بەرگری میللی، ئەنجومەنی گوندەکان، تەتەر.

تیپەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان کە بریتیبوون لە تیپی تایبەتی هەر چوار مەڵبەندەکان: تیپی ١٢ی سۆران، تیپی ١٧ی زمناکۆ، تیپی ١٩ی کۆڕەک، تیپی ٢١ی کەرکوک، تیپی ٢٣ی سورداش، تیپی ٢٥ی خاڵخاڵان، تیپی ٣١ی سلێمانی، تیپی ٣٧ شارباژێڕ، تیپی ٤٤ سادرو چەکوچ، تیپی ٤٧ی پیرەمەگرون، تیپی ٥١ی گەرمیان، تیپی ٥٣ی شێروانە، تیپی ٥٥ی قەرەداغ، تیپی ٥٧ شێروانە، تیپی ٥٩ی سەگرمە، تیپی ٦٣ جوتیاران، تیپی ٧٨ی کارۆخ، تیپی ٨٣ی هەورێ، تیپی ٨٥ی بەڕانەتی، تیپی ٨٦ دەشتی هەولێر، تیپی ٨٧ی قەرەچوخ، تیپی ٨٨ی شەمامک، تیپی ٩٠ باواجی، تیپی ٩١ی سەفین، تیپی ٩٣ی کۆیە، تیپی ٩٩ی بتوێن وتیپی پەڵفەت و کوڕەکاژاو. هەر تیپێک فەرماندی تیپ و جێگر فەرماندەی تیپی هەبوو، کە فەرماندەیی ٣٠٠-٦٠٠ پێشمەرگەی دەکرد، هەروەها ڕابەرسیاسی تیپ و هەندەک جار کەرتیش ڕابەرسیاسی هەبوو، زانیاریی تیپ، دکتۆری شۆڕش کە دەرچووی پەیمانگای تەندروستی یان ئامادەی برینپێچی بوون، لێپرسراوی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان و شۆڕشگێڕان و هێڵی گشتی هەبوو، ئیدارەی تیپ. هەر تیپێک لە چوار یان پێنج یان شەش کەرت پێکهاتبوون، کەرتەکان فەرماندەی کەرت و جێگر فەرماندەی کەرت کە فەرماندەیی ٦٠-٧٠ پێشمەرگەی دەکرد و فەرماندەی مەفرەزە کە فەرماندەیی ٥-٧ پێشمەرگەی دەکرد.

**ئەرکەکانی دکتۆر و کارمەندانی تەندروستی:**

تەنانەت بۆ پێشمەرگەی دکتۆر وکارمەندی تەندروستی، هەمان

بۆچوون و بگرە زیاتریش لە ناوی پیرۆزی پێشمەرگە وەسفیان بۆ کراوە، وێڕای کارە پیشەیی و مرۆڤانەکەی کە گرنگیدانە بە تەندروستی خەڵک بەگشتی و پێشمەرگە بەتایبەتی، بەرگریکردن لە خاکی پیرۆزی کوردستان شانبەشانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە بەرەکانی شەڕدا وەکو پێشمەرگە شەهید و بریندار کراوە، دەیان ناوی دکتۆر و کارمەندی تەندروستی شەهید لە داستان و شەرە چارەنووسسازەکاندا تۆمارکراوە وەکو (شەهید د. چیا، شەهید د. هیوا، شەهید د.هادی، شەهید د. فازیل، شەهید د.کاوە، شەهید د. هەژار...هتد. دیارە پێکهاتەی یەکەی پێشمەرگە لەکاتی ئەنفالەکاندا بریتیبوو لە چوار مەڵبەند، مەڵبەندی یەک لە قەرەداغ بوو، مەڵبەندی دوو لە بەرگەڵو بوو لە دۆڵی جافایەتی گەورەترین نەخۆشخانەی تیادا بونیادنرابوو لەگەڵ بنکەیەکی تەندروستی لێبوو، دوو تا چوار دکتۆری تیادا بوو، سەرەتا د. خدر مەعسوم لە سەرەتای شۆڕش دەستبەکاربوو، د.هەڵۆ نەشتەرگەری دەکرد و دکتۆر شوان و دکتۆر جەلال و دکتۆر فائق گوڵپی، هەروەها سێ بنکەی تەندروستی لە سماقوڵی و مەلەکان و خەتێ هەبوو، دکتۆر حسێن و کارمەندانی تەندروستی د.خەسرۆ، د.نەبەز و د.عوسمان لە تیپی ١٩ی کۆڕەک بوو، دکتۆر زریان لە بنکەی تەندروستی خەتێ بوون لەگەڵ کارمەندانی تەندروستی د.کارۆخ و د.فەرهاد، هەروەها دکتۆر هەڤاڵ لە بنکەی تەندروستی مەلەکان بوو لەگەڵ کارمەندانی تەندروستی د.کامەران و د.ئامانج ..هتد، ئەو بنکە تەندروستییە زیاتر وەکو کۆگای دەرمانی دژی چەکی کیمیایی لێبوو، بنکەی تەندروستی کانی کوردە لە دەشتی کۆیە، لە دوای کشانەوە بۆ سنوور لە قاسمەڕەش بنکەیەکی تەندروستی هەبوو د. ئارام و چەند کارمەندێک کاریان تیادا دەکرد.

کارمەندانی تەندروست نموونەی کەسی خوێندەوار و ڕۆشنبیر بوون،

خەڵکی ناوچە ئازادکراوەکان زۆر متمانەیان بە کارمەندەکان هەبوو، لە گشت ڕوویەکەوە.

ئەرکی پێشمەرگە و دکتۆری شۆڕش خۆی لە برینپێچی و دوورینەوەی جەستەی بریندار و چارەسەرە سەرەتاییەکان لە ڕێگای داو دەرمان و پێدانی ڕێنمایی خۆپاراستن و دەرزلیێدان و گرتنەوەی ئێسقانە شکاوەکان و ژینگەپارێزی بوو.

کارمەندەکان بەگشتی دەرچووی پەیمانگای تەندروستی و ئامادەیی برینپێچی بوون، بەشێکیان دەرچووی کۆلیژی ڤێتێرنەری بوون، لەوانە کۆچکردوو بە نەخۆشی کۆرۆنا د. ڕەفعەت هیدایەت، دکتۆر ئاتیلا برینپێچ د. جەردیس و د. عومەر و ..هتد، بەشێکیشیان تەنها زانیاریان هەبوو لە لێدانی دەرزی و کاری تەندروستی. سەرەتای شۆڕش پێشمەرگە و دکتۆر و کارمەندی تەندروستی هیچ مووچەیەکیان نەبوو، هەموویان بە خۆبەخش لە بنکەی تەندروستی و نەخۆشخانە و تیمە تەندروستییەکان کە لە تیپەکان بوون دەستبەکاربوون، بەڵام دواتر کە شۆڕش لە ڕووی ئابوورییەوە گەشەی کرد، بڕێک پارەی پێدەدرا، دکتۆر و کارمەندە تەندروستییەکان بە کۆڵەپشتی دەرمانەوە ئەرکی بەرزکردنەوەی ورەی فەرماندە و پێشمەرگەکانیان دەبینی، چونکە پێ بەپێی لەگەڵ برا پێشمەرگەکانیان بوون لە شەڕ و جەولەکاندا، لە ڕووی دەروونییەوە پاڵپشتێکی باشبوون بۆ جەماوەری ناوچە ئازادکراوەکان و هێزی پێشمەرگەی کوردستان.

**چەند ڕووداوێکی واقیعی شۆڕش لە سەردەمی شاخدا:**

لە ئێوارەی ڕۆژی ١٩٨٨/٧/٣١ فڕۆکەکانی ڕژێم هەستان بە بۆردومانکردنی دۆڵی هیران و نازەنین و دۆڵی بالیسان و خەتێ بە چەکی کیمیایی جۆری خنکێنەر و خەردەل، لە گوندی خەتێی دۆڵی بالیسان چوار هاوڵاتی شەهیدبوون، یەکیان پێشمەرگە بوو سیانەکەی دیکە هاوڵاتی بوون، برینداربوونی زیاتر لە پانزدە پێشمەرگە و هاوڵاتی،

شــــەهید دەرســـــیم عبدالله حەبیب پێشـــــەرگەی یەکێتیی نیشـــــتمانیی کوردســـتان بوو، ئەوکاتە لە تەمەنی نۆزدە ساڵی بوو لەگەڵ شەهیدبوونی ســـێ هاوڵاتی دیکەی دانیشـــتووی گوندی خەتێی خۆشـناوەتی، شـەهید دەرسیم بەر لە بەرکەوتنی بە چەکی کیمیایی کارمەندانی تەندروســـــتی هەڵدەستان بە چارەسـەرکردنی، ئەو کاتە ســـییەکانی توشـــی نەخۆشـــی "رەبۆ" بوو، ئەو پێشـــــەرگەیەی کە بەر چەکی کیمیایی کەوتبوو نـاوی ئازاد قەســـاب بوو، خەڵکی رواندوز بوو، بەشێک لە چارەسەرکردنەکانی بۆ کرا، لەگەڵ بەرکەوتنەکە توشـــی تەنـگەنەفەســـــی بـووبـوو و بە بەردەوامـــی دەبـــوایە یەکـــێـک باوەشـــینەی بۆ بکات، چونکە بەرەو وەرزی هـاوین دەچوو، زۆر گەرما بوو، باری دەروونی زۆر ئاڵۆز بوو، هەناسەی بۆ نەدەدرا، دوای شکاندنی دەرزی کۆرامین ئەمپول و پرژاندنی لە ژێـر گـوێـچـکە و دەوروبەری دەمولوتی، بۆ ئەوەی هەنـاســـــەی رەوان بێـت. دواتر لێـدانی دەرزی سـۆدیۆم ثایۆسـولفەیت کە نزیکەی دە سـانتیمەتر سـێجا بوو، هەروەها پێـدانی ئەنتی بـایۆتیـک، هەروەهـا دوای بیدینی خولی کیمیـایی لە یاخسەمەر لەسەر راسپاردەی بەڕێز مام جەلال، کارمەندانی تەندروسـتی چەنـدیـن گـردبـوونەوەیـان لە گوندەکانی خەتێ و وەرێ و بالیسان و شێخ وەسانان توتمە و کانی بەرد و ئەشـــــکەفتە و زۆربەی گونـدە ئازادکراوەکان ئەنجامدا، کە بریتیبوو لە پێشـکەشکردنی رێنمایی پێویسـت و تـایبەت بە چەکی کیمیـایی لە خۆپاراســـتن و چارەســـەرکردن لە دژی ئەم چەکە کۆکوژە و کوشندەیە، هەروەها لە رێگای لە دۆڵی جافایەتی لە گوندەکانی شـێخ باخ و سـێکانی و قەمـچـوغە خەڵـکـی گـونـدەکـان کۆدەکرانەوە و رێنمایی پێویســـتان ئاراستەدەکرا، هەروەها لە گوندەکانی سرد و عەسکەر و سوورقاوشان و بۆڵقـامیش و گۆپتەپە و کـانیبی و داوداوای دەشـتی کۆیە و نازەنین و کـۆلـکەرەش و کـامـوســـەک و کونەفلوســـە و هیران و دۆرێ و

ئاقوبان و بەرەکە و کەوەرتیان و گشت پێشمەرگەکانی تیپی ٩١ ی سەفین و بەشێک لە پێشمەرگەکانی تیپی ٨٥ ی بەرانەتی.

لە سەرەتای مانگی ئازاری ساڵی ١٩٨٨ سەدو پەنجا پێشمەرگە لە گوندەکانی دۆڵی هیران و نازەینەوە بەرەو سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە دۆڵی جافایەتی دەرۆیشتن، لە گوندی عەسکەر نزیکەی بیست و پێنج چەکداری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی عەرەبی شیعە لە نزیک سەنگاو ئەغجەلەر بەر بۆردومانی کیمیایی کەوتبوون، تیمی بنکەی تەندروستیی تیپی ٩١ی سەفین لە مزگەوتی گوندی عەسکەر هەستان بە ساریژکردنی برینی چەکدارەکان کە بەر چەکی کیمیایی جۆری خەردەل کەوتبوون، هەندێکیان پێڵوی چاوەکانیان هەوی کردبوو و ئەستوربووبوو بەر چاوی خۆیان نەدەبینی، هەندێکی دیکەیان بن هەنگڵیان تلۆقی کردبوو، هەندێکی دیکەیان ناو رانیان یان ئەندامی پیاوەتیان تلۆقیان کردبوو، تیمەکە کە پێکهاتبوون لە کارمەندان د. ئازاد محەمەد و د.هەژار هەستان بە چارەسەرکردنیان، بە لێدانی دەرزی و بەکارهێنانی پاککەرەوە و تەقاندنی تلۆقەکان و لابردنی پێستە تلۆقکراوەکە و کاری برینپێچیان بۆ کرا بۆ چاوەکانیان، بەشێکیان دەستی یەکتریان گرتبوو و بە هیچ شێوەیەک چاویان نەدەکرایەوە، کێم و خوێن لەسەر پێڵوی چاوەکانیان بەدیدەکرا، بەهۆی ئاوی سۆدیۆم بایکاربۆنێت و قەترەی سولفا، توانرا چارەسەرێکی سەرەتاییان بۆ بکرێت، ئەو کاتە ئەو چەکدارە عەرەبانە زۆر خۆشحاڵبوون، کەوا لەژێر دەستی دکتۆری هێزی پێشمەرگەی کوردستان چارەسەریان بۆ دەکرێت.

لە دوای مانگێک شەڕ لەگەڵ هێزەکانی لیوای گاردی کۆماری و هێزە تایبەتەکان و جاش و سوپای عێراق هەموو تواناکانیان بەکارهێنا بۆ داگیرکردنی دۆڵی جافایەتی کە سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی لێبوو بە دەزگای

ناوەندی ڕاگەیاندن و ئیسـگە و چەند شەوێک لەسەر شاخی دووبرا



ڕۆژنامەی ڕێبازی نوێ و شەرارە و نەخۆشخانەی گشتی و بەندیخانەی گشتی، بۆ بەرگریکردن پێشمەرگەکانی بەشێک لە تیپەکان دووجار لە شەڕەکانی ئەنفالی یەکەم بەشداربوون لە ٢/٢٠ تا ١٩٨٨/٢/٢٥ دواتر سەرکردایەتی فەرمانی بە هێزەکە کرد، کەوا بگەڕێنەوە سنووری مەڵبەندی سێی هەولێر لە دۆڵی خۆشناوەتی، کە هێزەکانی ڕژێم وەکو شەڕی دەروونی لە دوو میحوەر هێرشبکەن، تەنها بۆ جموجۆڵ و سەرقاڵکردنی هێزەکان بوو لە دوو میحوەردا، جاری دووەم لە ٣/١٣ تا ١٩٨٨/٣/١٩ لە سەر شاخی دووبرا، پێش ئەو کاتە تیپی ٢١ی کەرکوک لەوێ بوون، ماوەی هێزەکە چەندین جار توشی پەلامار و هێرش بوونەوە، جارێکیان دوو پێشمەرگە بە هۆی بۆردومانەکانی ڕژێم توشی ڕشانەوە هاتن بەهۆی بۆنی بۆردومانەکەوە، تیمی تەندروستی پشکنینیان بۆ کردن، دەرکەوت کە بۆمبەکان کیمیایی بوون. دوای کشانەوەی هێزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ئێوارەی ٣/١٩ کاتژمێر چواری ئێوارە، بەرەو سنور ڕۆیشتن شەو لە سیرە مێرگ کاتژمێر دوو نیوی شەو هێزەکانی گاردی کۆماری توانیان بچنە ناو گوندەکانی سەرگەڵو و بەرگەڵو کە بارەگای هەردوو ناوەندی کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان و نەخۆشخانەی گشتی

و چاپخانە و تیپی شـــەهید کارزانی مۆسیقا و سرودی نیشتمانی لێبوو، لە دوای "دە ســـەعــات و نیو" لە کشانەوەی پێشمەرگە، لە سیرەمێرگ بۆ گوندی شــاناخسێ لە دوای سێ رۆژ مــانەوە بەرەو گونــدی بنێو خەڵەف رۆیشتین، دیار بوو رژێم لە رێگای ســـیخورەکانییەوە زانیبووی نزیکەی چوار سەدوپەنجا پێشمەرگە لە گوندی شــاناخسێ دابەزیون، لە ١٩٨٨/٣/٢٠ لە دوای دەرچــوونــی پــێشـــــمەرگە لە گونــدەکە، رژێم فرۆکەکانی ئاسمانی شـاناخسێ یان بە بۆنی خەردەل و فۆزیجین شێواند بەهۆی بۆردوومانەکەوە نزیکەی چل کەس لە هاوڵاتیانی گوندەکە بەهۆی چەکی کیمیایی شەهیدبوون.

لە بەرواری ١٩٨٨/٦/١ بـــۆ بەرگریکردن لە سنوری خۆشناوەتی و بنـاری چیـای کۆرەک لە کــاتی ئەنجامدانی پرۆسەی ئەنفالی پێنجەم و شــەشـــەمدا، لە دۆڵی هیرانەوە بۆ شاخەکانی رشکی لەسەر وکێل کێل و دواتــر لەســـەری جــوانەگـا پێشـــمەرگەکانی تیپی ٩١ ی ســەفین هەر پێنج کەرتەکەی و دوو کەرتی تـیـپی ٨٥ ی بەرانەتـی و دوانـزدە پێشـمەرگەی شـەهید سـەعیدی حەمە زیادی فەرماندەی تیپی ١٩ی کۆرەک لەســـەری جوانەگا بۆ ماوەی یەک مانگ شـەر بەردەوام بوو، لە ماوەی شـــەرەکەدا یــانزدە پێشــــمەرگە شـەهیدبوون، نزیکەی بیست و دوو پـێشـــــمەرگە بـریـنـداربـوون بە فەرمـــانـدەی تــیـپەوە، بەپــێـــی بەڵگەنامەکانی میدڵ ئیسـت وۆچ رژێم بەرامبەر بە پێشـمەرگە شـکسـتهێنا (هۆی ســـەرەکی بریـاری راگرتنی پەلامارەکە بە شێوەی کاتی، بەرگری ســـەختی پێشــــمەرگەکانی یەکێتیی نیشـــتمـانیی کوردســـتـان بوو لە چیـاکـانی کۆرەک و دەوروبەری ) جینۆســـایـد لە عێراقدا، پەلامـاری ئەنفـال بۆ ســـەر کورد، یەکێک لە پێشمەرگەکان بەهۆی نزیکی لە بۆنی بۆمبێکەوە توشـــی رشـــانەوە و بوورانەوە هـات، لەدوای پشـــکنینی دەرکەوت، کە بیلبیلەی چـاوی زۆر بـچـوک بـووبـووەوە و مەترسـیـــی ئەوەی لێـدەکرا، بۆمبی کیمیـایی

بووبێت، دواتر چارەسەری خێرای بۆکراو لەلایەن تیمی کارمەندانی تەندروستی هێزی پێشمەرگەی کوردستان رەوانەی " بنکەی تەندروستی خەتێ" کرا، وێرای ئەوەی پێشمەرگە لە بەرگری بەردەوامدا بوو لە دژی پرچەکترین هێزی ناوچەکە، زۆر جار دووچاری پێوەدانی دوپشکە دەبوون، یان پێوەدانی مێشوولەی ئەنۆفێلس دەبوون، کارمەندانی تەندروستی چارەسەری ئەم جۆرە حاڵەتانە و چەندین دۆخی دیکەی ناوازە دەکرد، زۆرجار لە سەرووی توانای زانستی ئەواندا بوو، بەڵام زۆربەی زۆری یەکەکانی خۆیان، دەربارەی نەخۆشی مەلاریا خۆش بەختانە لە رێگای رێکخستنەکانی شارەوە دەرمانی تایبەت بە نەخۆشییەکە و بە نووسراوی وەزارەتی تەندروستی هەولێر و سلێمانی و بە رێنمایی و چۆنیەتی پێدان و چارەسەرەوە بەدەست کارمەندانی تەندروستی دەگەیشت، ئەم دەزگا تەندروستییە لە خزمەتی پێشمەرگە و گشت حیزبە کوردییەکان و هاوڵاتیانی سنووری ناوچە ئازادکراوەکان، تەنانەت هێزە عێراقییە ئازادیخوازە عەرەبەکانیش سوودمەند دەبوون.



نەخۆش و برینندارەکان لەدوای پێدانی چارەسەری خێرا، دەگەڕانەوە



# DNA Profiling:
# Shedding Light on the ANFAL and Kurds Genocide

**Dr. Ayad Mohammed Ali**
PhD Molecular Genetics
University of Garmian, College of Science



Introduction:

The genocide of Kurds in Iraq refers to the systematic persecution and killing of Kurdish people by the Iraqi government, particularly under the regime of Saddam Hussein. The Iraqi government used various tactics to suppress Kurdish populations, including mass killings, forced displacement, and the use of chemical weapons. One of the most notorious examples of this genocide was the Anfal campaign, which was carried out by the Iraqi government in the late 1980s. During this campaign, Iraqi forces attacked Kurdish villages and towns, killing thousands of civilians and using chemical weapons against the population. The government also destroyed infrastructure and crops, forcing Kurdish people to flee their homes.

The genocide of Kurds in Iraq has been recognized by international organizations and human rights groups. The Iraqi High Tribunal ruled in 2007 that the Anfal campaign constituted a crime against humanity, and the United Nations has recognized the atrocities committed against the Kurdish people as an act of genocide. The legacy of the genocide of Kurds in Iraq continues to be felt today. While the Kurdish people have gained some degree of autonomy in the post-Saddam Hussein era, they continue to face challenges in their quest for self-determination and security.

The Anfal genocide was a series of attacks against the Kurdish population in northern Iraq carried out by the Iraqi government between 1986 and 1989. The campaign was directed by the government of Saddam Hussein and aimed to crush Kurdish resistance to the Iraqi regime. During the Anfal campaign, the Iraqi military attacked Kurdish villages and towns, killing civilians, burning homes, and destroying infrastructure. The campaign also included the use of chemical weapons against Kurdish civilians, resulting in widespread death and injury.

One of the most infamous aspects of the Anfal campaign was the use of mass graves to dispose of the bodies of Kurdish victims. Following the attacks, the bodies of Kurdish civilians were often buried in mass graves, making it difficult for families to locate and identify their loved ones. Estimates of the number of Kurds killed during the Anfal campaign vary widely. Hence, some sources suggest that more then 180,000 people have been killed. The campaign is widely regarded as

## DNA Profiling:

DNA fingerprinting, also known as DNA profiling or genetic fingerprinting, has been used to help identify victims of the Anfal genocide in Iraq. After the genocide, many of the victims were buried in mass graves, making it difficult for families to identify their loved ones. DNA fingerprinting can help identify victims by comparing their DNA to that of their living relatives. DNA samples can be collected from the remains of the victims, and from the surviving family members. By comparing the DNA profiles of the remains to those of the family members, forensic scientists can determine the identities of the victims.

DNA fingerprinting is important for identification of victims of the Anfal genocide. The International Commission on Missing Persons (ICMP) has been working with the Iraqi authorities to collect DNA samples from surviving family members and to analyze the remains of the victims. The ICMP has also been involved in training Iraqi forensic scientists in the use of DNA fingerprinting. Many of the victims of the Anfal campaign have been returned to the Kurdistan Regional Government (KRG) and laid to rest in mass graves. Tragically, in the an act of genocide against the Kurdish people, and in 2007, the Iraqi High Tribunal ruled that it constituted a crime against humanity.

The legacy of the Anfal campaign and the broader Kurdish struggle for autonomy and human rights in Iraq continue to be felt today. While the Kurdish people have gained some degree of autonomy in the post-Saddam Hussein era, they continue to face challenges in their quest for self-determination and security.

Hence, Identifying victims of the Anfal genocide through DNA profiling is challenging due to the vast number of victims and the conditions in which they were buried. Organizations like the International Commission on Missing Persons (ICMP) are dedicated to this task, working tirelessly to provide closure to families by identifying victims and returning their remains. Collaboration between the Iraqi Government and the Kurdistan Regional Government (KRG) is crucial in supporting these efforts. Together, they can ensure that families find closure and honor the memory of their loved ones, contributing to the healing process and fostering peace and reconciliation in the region.

within the bone matrix. Hair samples, on the other hand, contain nuclear DNA within the hair shaft and mitochondrial DNA in the hair root, providing valuable genetic information for analysis.

Once collected, these samples undergo a series of processing steps in the laboratory to extract DNA. In the case of bone samples, forensic scientists carefully remove a portion of the bone, taking care to avoid contamination and preserve the integrity of the specimen. The bone is then subjected to various chemical and enzymatic treatments to break down the mineral matrix and release the DNA trapped within the bone tissue.

For hair samples, DNA extraction typically involves cutting a small portion of the hair shaft or plucking hairs directly from the scalp. The extracted DNA is purified using specialized techniques to remove proteins, lipids, and other contaminants, ensuring the accuracy of subsequent analyses.

Preservation of DNA samples is critical to maintain their integrity and prevent degradation over time. Forensic laboratories employ stringent protocols for sample storage, including temperature-controlled environments and specialized containers to minimize exposure to light, moisture, and absence of proper identification procedures, no bone or hair samples have been taken for future identification efforts. This lack of proper documentation compounds the immense tragedy of their loss, leaving families without closure and hindering efforts towards justice and remembrance. DNA fingerprinting has been a powerful tool in the search for justice and closure for the families of the victims of this tragic even.

DNA profiling, a cornerstone of forensic science, is a sophisticated process that enables the identification of individuals based on their unique genetic signatures. This method has revolutionized criminal investigations, disaster victim identification, and historical genealogy studies. The procedure involves several intricate steps, from sample collection to data analysis, all of which require precision and meticulous attention to detail.

The first crucial step in DNA profiling is sample collection. Forensic experts gather biological material such as hair or bone fragments from crime scenes, accident sites, or mass graves. When dealing with skeletal remains, bone samples are often the primary source of DNA due to the preservation of genetic material

criminal investigations or victim identification cases.

Data analysis plays a critical role in interpreting DNA profiles and generating forensic reports. Advanced bioinformatics tools and statistical algorithms are used to analyze complex DNA profiles, calculate likelihood ratios, and determine the significance of matches between samples. Forensic experts must adhere to strict guidelines and quality assurance measures to ensure the reliability and validity of DNA evidence presented in court.

Overall, DNA profiling represents a powerful tool in forensic science for identifying individuals, elucidating genetic relationships, and providing critical evidence in criminal investigations and victim identification efforts. From sample collection to data analysis, each step in the DNA profiling process requires meticulous attention to detail and adherence to rigorous quality control standards. By harnessing the capabilities of modern biotechnology and forensic techniques, DNA profiling continues to advance the field of forensic science, contributing to the pursuit of justice and truth in society. Reuniting Anfal genocide victims with their surviving families can be challenging. However, with environmental pollutants. Additionally, DNA samples may be preserved in a variety of mediums such as ethanol, silica gel, or frozen storage to prolong their stability and viability for future analysis.

Once extracted and purified, the DNA undergoes amplification through polymerase chain reaction (PCR), a technique that produces millions of copies of specific DNA regions. This step is crucial for generating sufficient DNA material for analysis, especially when dealing with limited or degraded samples. PCR amplification is followed by DNA quantification to determine the concentration and quality of the DNA template, ensuring the accuracy of downstream analyses.

The next stage in DNA profiling involves genotyping, where specific regions of the DNA, known as genetic markers, are analyzed for variations or polymorphisms. These markers, which include short tandem repeats (STRs) and single nucleotide polymorphisms (SNPs), exhibit unique patterns of inheritance that are highly individualized. By comparing the genotype of an unknown sample to a reference database or known individuals, forensic scientists can establish a match or exclusion, providing valuable evidence in

removed from their homes and land during the Anfal genocide, and the trauma of displacement can also have a profound impact on mental health. It is important to provide support and resources to the families of Anfal victims to help them cope with the trauma they have experienced. This may include providing counseling and mental health services, as well as practical support to help families rebuild their lives and communities.

Efforts to identify and return the remains of Anfal victims to their families can also play an important role in supporting the psychological well-being of families. By providing closure and the opportunity to properly bury their loved ones, families may be able to find some measure of peace and healing.

Overall, the psychological state of the families of Anfal victims is likely to be deeply affected by the trauma and loss they have experienced. However, with the right support and resources, it is possible for families to rebuild their lives and find hope for the future.

## International recognition of the Anfal mass graves: The Court decision

The Anfal genocide and the mass graves associated with it have support from the Iraqi Government and assistance from DNA testing, forensic science, and community organizations, it's possible to return victims to their regions and bury them in their own graves within national mass graves.

## The psychological state of the families of Anfal victims

The psychological state of the families of Anfal victims is likely to be deeply affected by the trauma and loss they have experienced. The Anfal genocide was a horrific event that resulted in the deaths of tens of thousands of Kurdish people, leaving many families without their loved ones and causing widespread suffering and trauma. The families of Anfal victims may experience a range of psychological symptoms, including grief, anxiety, depression, and post-traumatic stress disorder (PTSD). The trauma of losing a loved one in such a violent and traumatic way can be overwhelming and may have long-term effects on mental health and well-being.

In addition to the loss of their loved ones, the families of Anfal victims may also have to deal with ongoing challenges related to displacement, poverty, and discrimination. Many Kurdish people were forcibly

included forensic investigations and DNA analysis to identify the victims and return their remains to their families. The International Commission on Missing Persons (ICMP) has been involved in this effort, working with Iraqi authorities to locate and identify the remains of victims buried in the mass graves.

Overall, the international recognition of the Anfal mass graves and the efforts to hold those responsible accountable have been an important step in acknowledging the atrocities committed during the Anfal campaign and providing closure and justice for the victims and their families

The ICTI was supported by the United Nations and was based in Baghdad, Iraq. It was established to investigate and prosecute individuals responsible for crimes against humanity, war crimes, and genocide committed in Iraq between 1968 and 2003, including the Anfal genocide.

During its operation, the ICTI indicted several high-ranking officials of the Saddam Hussein regime for their role in the Anfal campaign, including Ali Hassan al-Majid, who was known as "Chemical Ali." In 2007, al-Majid was found guilty by the ICTI of genocide, crimes against humanity, received international recognition and attention over the years. The international community has condemned the atrocities committed during the Anfal campaign and has called for accountability for those responsible.

One of the most significant international efforts to recognize the Anfal mass graves was the establishment of the International Criminal Tribunal for Iraq (ICTI). The ICTI was established by the Iraqi government in 2005 to prosecute those responsible for crimes committed during the Saddam Hussein regime, including the Anfal genocide. The tribunal was supported by the United Nations and received international attention and recognition. In addition to the ICTI, there have been several other international efforts to recognize and investigate the Anfal mass graves. The United Nations has documented the mass graves and called for accountability for those responsible for the atrocities committed during the Anfal campaign. Human rights organizations and advocacy groups have also called for recognition and justice for the victims of the Anfal genocide.

The efforts to recognize the Anfal mass graves and hold those responsible accountable have also

involved mass killings, disappearances, and the destruction of Kurdish villages and cultural heritage sites.

However, it is worth noting that the Anfal operations had a profound impact on the Kurdish identity and culture. The campaign targeted Kurdish civilians, including women, children, and the elderly, and forced thousands of Kurds to flee their homes and seek refuge in other parts of Iraq or in neighboring countries. The Anfal operations also led to the loss of many Kurdish cultural heritage sites, including historical landmarks, villages, and traditional Kurdish dress, music, and literature. Despite these challenges, the Kurdish people have continued to maintain and celebrate their cultural identity, language, and traditions. Today, the Kurdish language is recognized as an official language in Iraq, and efforts are underway to preserve and promote Kurdish culture and heritage. There are also ongoing efforts to seek justice and accountability for the victims of the Anfal operations and to ensure that their stories are remembered and shared with future generations.

and war crimes and was sentenced to death. Several other individuals were also convicted and sentenced for their role in the Anfal genocide. However, the ICTI was dissolved in 2006 after the Iraqi government decided not to renew its mandate. The remaining cases were transferred to the Iraqi High Tribunal, which continued to prosecute crimes committed during the Saddam Hussein regime.

While there is no specific Hague Court for the Anfal genocide, the international community has called for accountability for those responsible for the atrocities committed during the Anfal campaign. This has included efforts to investigate and prosecute individuals responsible for the genocide, as well as efforts to provide support and resources to the victims and their families.

## Anfal operations as part of the Kurdish identity and language survey

It is difficult to directly link the Anfal operations to a survey on Kurdish identity and language, as the Anfal campaign was a systematic attempt by the Iraqi government to eliminate the Kurdish population in Iraq, and it

## References:

[1] Kelly, Michael J. *Ghosts of halabja: Saddam Hussein and the Kurdish genocide: Saddam Hussein and the Kurdish genocide*. ABC-CLIO, 2008.

[2] O'Leary, Carole A. "The Kurds of Iraq: recent history, future prospects." *Middle East Review of International Affairs* 6, no. 4 (2002): 17-29.

[3] Van Bruinessen, Martin. "Genocide of the Kurds." In *The Widening Circle of Genocide*, pp. 165-191. Routledge, 2018.

[4] Leezenberg, Michiel. "The anfal operations in Iraqi kurdistan." In *Centuries of Genocide*, pp. 409-434. Routledge, 2012.

[5] Rapley, Ralph, and David Whitehouse, eds. *Molecular biology and biotechnology*. Royal Society of Chemistry, 2015.

[6] Rapley, Ralph, and David Whitehouse, eds. *Molecular forensics*. John Wiley & Sons, 2007.

[7] Staub, Ervin. *The roots of evil: The origins of genocide and other group violence*. Cambridge University Press, 1989.





# ناساندنی کۆمەڵکوژییەکانی کورد،
# پرۆژەیەکی سەخت و نائومێدکراو..!

د. عەدالەت عەبدوڵڵا



**پێشەکی:**

ناســـاندنی تاوانەکانی کۆمەڵکوژی Genocide بە ڕای گشـتیی وڵاتان و گـەلانی جیهـان، بۆ هـەر گـەل و نـەتـەوەیـەکی سـتـەمـدیـدە و جینۆسـایدکراو، خەون و ئامانجێکی ڕەوایـە، لـە هـەمـانکـاتـدا ئـەرک و بـەرپرسـیـاریێتییـەکی ئـاکـار-یش Moral.

ئەم دۆسـییەیە ئەوە هەڵدەگرێت، کە بەدواداچوونی بەردەوامی بۆ بکرێت، پرسـیـاری ئـەوەی لـەبـارەوە بوروژێنرێـت، کـە ئـاخۆ مـەرج و بنەماکانی ناساندنی جینۆساید چین؟ ئـایـا لـە ئـەزمـوونـی گـەلانـی جینۆسـایدکراودا چی گوزەراوە؟ ئایا توانراوە بـەبێ هـەوڵ و پرۆژەی نیشـتمانی، تاوانەکانی کۆمەڵکوژی بناسـرێن و دانیان پێدابنرێت؟ ئایا نموونەی جیاجیای ئەو میللەتانەی کـە ڕرووبـەڕووی تـاوانـەکـانی کۆمـەڵکوژی بوونـەتـەوە، چیمان پێ دەڵێن؟

پاشان ئاخۆ ئێمە لە بنەڕەتدا، بۆچی دەبێ ئەم دۆسـییەیە بجوڵێنینەوە؟ چی وایکردووە، پێویسـتیمـان بـە بیرخسـتنـەوەو بـەراوردکردنی مێژووی تاریکی دیکتاتۆری و دوای دیکتـاتۆری لـە عێراقـدا هـەبێت؟ چ دیاردە و هەلومەرج و هەڵوێسـتێک لەم وڵاتەدا لە ئارادایە، کە ترس و دڵـەڕاوکـێ بـۆ گـەلی کـورد وەک گەلێکی جینۆسایدکراو دروستبکات؟

**مەرجەکانی ناساندن:**

هیچ گومـانێـک لـەوەدا نییـە، کـە مەرجی سەرەکی بۆ خەملینی هەر تێڕوانین و ئەندێشـەیەکی جیهانی Global، کـە تـرس و سـڵـەمینـەوەیـەکی وجودی و سـایکۆلۆژیی لە ئاسـت تاوانی کۆمەڵکوژیی لا دروسـت ببێت و ڕەتی بکاتەوە، زیاتر لەو پرۆسـە ئـاڵۆزو سـەختـانـەدا خۆی دەبینێتـەوە، کـە پێیـان دەوترێـت ناساندنی تاوانەکانی جینۆساید.

پرۆسـەکان لەم ڕووەوە تەواو پەیوەسـتن، بەوەی کە پرۆژەی کراوەو بەردەوام بن، فرەڕەهەندو هەمەلایەن بن. لەوەش زیاتر، لە هـەر وڵاتێکی خـاوەن قـەوارەدا دامەزراوەی گەورەی دەوڵەتی و هێزی سـیاسـی و کۆمەڵایەتیی چالاکیان لە پشـتەوە بێت، دەنا ئـەسـتـەمـە ئـەو وەرچـەرخـانـە ڕوو بدات، کە چاوەڕوانی دەکەین،

ئاسان نییە، ناساندنی تاوانەکان لە خەونەوە و ببێتە واقع، لە پرۆسەوە ببێتە پرۆژە تا دواتر هەموو جوڵەو هەنگاوێکیش بە ئاراستەی ناساندنی تاوانەکانی جینۆساید، جڵەو و ئاراستە بکات.
ئێمە بە ئەزموونی جیاجیای گەلانی جینۆسایدکراوی مێژووی نوێی مرۆڤایەتی، ئەوەمان بۆ ساغدەبێتەوە، کە سەختە بتوانرێت دۆسییەکانی جینۆساید لە ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیشدا بناسرێن بەبێ کۆمەڵێک مەرج، لەوانە:

- بوونی پەرۆشییەکی سیاسی و یاسایی و میدیایی و کولتوری و میللی.
- بە دامەزراوەییکردنی پرۆسەی ناساندنی تاوانەکان لە دامەزراوەی دەوڵەتیی پەیوەندیداردا.
- چاندنی هۆشیارییەکی جەماوەریی کە ببێتە هۆی فشار لەسەر دامەزراوەکان و هاندانیان بۆ گرەنتیکردنی دووبارەنەبوونەوەی تاوانی هاوشێوە لە پاشەرۆژدا.

**ئەزموونی گەلانی جینۆسایدکراو:**

ئەزموونی گەلانی جینۆسایدکراوی زۆر هەن، کە دەیسەلمێنن بەبێ ئەو مەرجانە، بەبێ هەوڵ و هەڵای سیاسی، دیبلۆماسی، میدیایی، هونەری و مەدەنی، بەبێ فشارو پرۆژەو جوڵەی گەورەی ناساندن، زەحمەت بووە، کە کرانەوە بە ڕووی کێشەی گەلانی جینۆسایدکراوداڕوویدات، دۆزەکانیان لەبەرچاو بگیرێن و ڕەوایەتیی وەربگرن و پاڵپشتی و کۆدەنگیی نێودەوڵەتییان بۆ دروست ببێت، یان لە هەندێ ئەزموونیدا، کاربگاتە لێپرسینەوە لە تاوانبارانی کۆمەڵکوژی و دادگاییکردنیان لە دادگا نەشناڵ و نێودەوڵەتییەکاندا.

ئەمڕۆ چۆن ئەو ئەزموونانە بپشکنیت، هیچ نموونەیەکی پێچەوانەی ئەو مەرجانە نادۆزیتەوە، مەگەر تەنها لەو تاوانە کۆمەڵکوژییە زەق و



گەورانەدا کە بە بەرچاوی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی و ماسمیدیای جیهانەوە Mass Media ڕوویان دابێت، یان ئەو مەرگەساتە ئاشکرایانەی کە پێویستییان بە کەمپین و هەڵمەتی گەورەی نیشتمانی نەبووبێت بۆ ناساندن و دانپێدان، وەک تاوانی جینۆسایدکردنی ئێزدییەکان لە (٢٠١٤ز)دا کە هەموو دەزانین ڕووداوێکی هاوچەرخی تراژیدی ناخهەژێن بوو، دەنگدانەوەیەکی گلۆبالّی بەدوای خۆیدا هێنا، دەنا لە دەرەوەی ئەم جۆرە نموونانە، کارلێک لەگەڵ دۆسییەکانی جینۆسایددا و مامەڵەکردنی سیاسی و یاسایی وڵاتانی جیهان لەگەڵیاندا، کارێکی ئاسان نییەو نەبووە، بەڵکو پرۆژەیەکی نیشتمانیی زۆر سەخت و پڕوکێنەر بووە، پلان و کۆششی ناوخۆیی و دەرەکیی بەردەوام و دوورمەودای ویستووە.

**نموونەکانی کۆمەڵکوژیی لە جیهاندا:**

ڕەنگە لەم بوارەدا زۆر ئەزموون هەبن، کە وەک نموونەگەلێک ببنە شایەتی بۆ ئەم هاوکێشە ئالۆزە. لەوانە، جینۆسایدی ئەرمەنەکان لەسەر دەستی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی Ottoman Empire لە (١٩١٥ز)، یان جینۆسایدکردنی جولەکەکان، کە لە فەرهەنگی سیاسیدا بە

هۆلۆکۆست The Holocaust (١٩٣٣-١٩٤٥ز) ناودەبریت و لەسەردەستی ئەڵمانیای هیتلەرو لە سایەی ئایدیۆلۆژیای نازیزمدا Nazism روویدا، یان جینۆسایدی تۆتسی و هۆتۆ میانڕەوەکان لەسەر دەستی گرووپە توندڕەوە هۆتییەکانی لە بابەت ئینتراهامۆی و ئیبوزامۆگابی The Interahamwe and The Impuzamugambi لە رواندا (١٩٩٤ز)، یان جینۆسایدی موسڵمانە بۆسنییەکان لە (١٩٩٢-١٩٩٥ز) لەسەر دەستی سربەکان و بەدیاریکراویش سوپای کۆماریی سربسکا Army of Republika Srpska، یان نموونەی جینۆسایدی کەمبۆدییەکان (١٩٧٥-١٩٧٩ز) لەسەر دەستی کۆمۆنیزمە ماویستە پەڕگیرەکان و سەردەمی فەرمانڕەوایی پۆل پۆت (١٩٦٣-١٩٧٩ز) لە کۆمبۆدیا، یان جینۆسایدی دارفۆرییەکان لە (٢٠٠٣-٢٠٠٨ز)دا لەسەر دەستی حکومەتی بەشیر و گرووپە ملیشیاییەکانی جەنجەوید، ئەوانەو زۆر نموونەی تریش کە بێگومان هەر هەموویان، بەئاشکرا ئەوە دووپاتدەکەنەوە، کە ناساندنی تاوانەکانی کۆمەڵکوژی هەوڵ و کارو بەدواداچوونی زۆریان ویستووە، دەزگاو دامەزراوەی جیاجیایان بۆ خراوەتەگەڕ، پێویستییان بە سەوداکردن هەبووە لەگەڵ ململانێ و بۆربۆڕینە ناوخۆیی و هەرێمایەتی و جیهانییەکاندا، کۆکردنەوەی دیکۆمێنتەکان و نووسراوە رەسمییەکانیان ویستووە، تێپەڕینیان بەناو کۆمەڵێک کۆسپ و ئاستەنگدا خواستووە، کە بەرژەوەندیی جیاجیای وڵاتان، یان هاوپەیمانێتی و جەمسەرگیرییە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان، لە رێی پرۆژەی ناساندنی تاوانەکانی جینۆسایدی ئەو گەلانەدا، دروستیان کردبوو.

بە مانایەکی روونتر، هیچ گەلێکی جینۆسایدکراو بە ئاسانی ناتوانێت ئەو تاوانانەی

کۆمەڵکوژی بە جیهان بناسێنێت ئەگەر خۆی، پێش هەر لایەکی تر، وەک پرۆژەیەکی نیشتمانی و ستراتیژی مامەڵەی لەگەڵدا نەکات، ئەگەر توانای سیاسی، دیبلۆماسی، یاسایی، میدیایی، کولتوری و هونەریی خۆی بۆ چڕنەکاتەوە، مەرج و کەرەستەو پێویستییەکانی، ڕەچاو و دابین نەکات.

**دیاردە ترسناکەکە:**

ئەم پرسانەمان بیرخستەوە، بۆ ئەوەی ئەمڕۆ یەکێک لە ترسناکترین دیاردەکانی ناو واقعی سیاسیی هەرێمی کوردستان و عێراق بووروژێنینەوە، کە دیاردەی کاڵبوونەوەی پلە بە پلەی بایەخدانە بە مێژووی تاوانەکانی کۆمەڵکوژی، دیاردەی پاشەکشەی یادەوەریی هاوبەشی نەتەوەیی کورد خۆی و هاوسۆزی و هاوخەمیی گەلانی عێراقیشە لە ئاست کۆمەڵکوژییەکاندا، ئەو تاوانانەی کە بێگومان، یادگاری و یادەکانیان، ساڵانە، وەک برینێکی زیندوو و سارێژنەبوو، سەرلەنوێ و بە تاسەوە، چاومان دەخەوە سەر چۆنیەتی مامەڵەی دەوڵەت و کۆمەڵگەی عێراقی لەگەڵ مێژووی سیاسیی ڕژێمە فەرمانڕەواکانی عێراق و ئەندازەی پەروەردەیان لەئاستی یادەکاندا، لە ئاست ئەو تاوانانەدا کە لە ڕۆژژمێری سیاسیی وڵاتدا ڕۆژگەلێکی سیمبولین، تەنها مشتێکن لە خەرواری ئەو دەورانە مێژووییە تاریکەی کە توێژەری دیاری عێراق و چالاکوانی بواری دیکۆمێنتکردنی کۆمەڵکوژییەکانی عێراق، **کەنعان مەکیە**، لە کتێبە بەناوبانگەکانی خۆیدا، ناوی دەنێت: کۆماری ترس Republic Of Fear، یان دڵڕەقی و بێدەنگی Cruelty and Silence.

بەتایبەتیتریش مێژووی فەرمانڕەوایی کۆمەڵکوژیی بەعس (١٩٦٨-٢٠٠٣ز) کە هەموو دەزانین و بینیومانە و چەشتومانە، کە نەک هەر مێژووی جینۆسایدکردنی گەلی کورد بووە، بەڵکو دەورانێکی گشتگیربووە لە

ســــتەمی دادپەروەرانەی بەعس بەرامبەر بە تەواوی عێراقییەکان، هــەر لــە زینـدانیکردن، تیرۆر، ڕەشـــــەکوژی، لەســـێدارەدان و تێکڕای تاوانەکانی تری ســـالانی جەنگە خوێناوییەکان کە زۆربەی گەلانی عێراقیان کردبووە ئامانج، بگرە هیچ هـاوولاتییـەکی خـاوەن هەڵوێست و بەرهەڵستکارێکی ئەو دەســـەڵاتەیان نەدەبوارد، کەچی بەداخەوە، بەوەشـــــەوە، دەبینین لەمڕۆدا ئەو مێژووە هاوبەشـــــە، ئـەو یـادەوەرییە تراژیدییـانـە کـە هاوچەرنووســـیان کردبووین و لەیەکیان کۆکردبووینەوە، ساڵ بۆ ســـاڵ، فەرامۆشــدەکرێن، قۆناغ بە قۆناغ لەژێر کاریگەریی ململانێی تــائـیـفـی و مــەزهــەبـی و نـەتـەوەییـەکـانی عێراقی دوای دیکتـاتۆریدا کـاڵدەبنـەوە، هێواش هێواش، کۆمــەڵگــەو دەوڵــەتیش، لەســـــەرخۆ دەبنەوە میراتگرێکی ناڕاســـتەوخۆی کابووســـی ئەو کولتورە سـیاسـییە لە جیاکاری و دووبـەرەکـی، کـە بـەعـس و ڕژێمەکانی پێشـــووتر، بە بەرنامە، لــە هرزو ڕەفتـاریی کۆمــەڵگــەی عێراقیدا چاندبوویان و هــەموو مـــــاف و داخــــوازی و تایبەتمەندێتییەکی ســـیاســـی و نەتەوەیی و ئاینی و مەزهەبیان، بە زەبری هێزو داپڵۆســـین، یان دەزگـای پـڕوپـاگـەنـدەیـی و ســــاختـەکـاری، یـان یـاســـاو بـــڕیـــارەکـــانـــی دەوڵـــەت و دامەزراوەکانی دەمکوت کردبوو.

**مەترسی و دڵەڕاوکێ:**

ئەم دیاردەیە، پێی زانرابێت یان نـا، بـە ڕۆژی ڕوون، پێش هـەر پێکهـاتـەیـەکی تر، مـەترســـی و دڵەڕاوکێ دەخاتە دڵ و دەروونی گەلێکی جینۆســـایدکراوی وەک کوردەوە. لـەم پرســـەکـە هـەر بەتەنها ئەو هەنگاوە نیشـتمانی و ڕەســـمی و مـەدەنییـانـە لـە کوردســـتان و عێراقیشـــدا خاو نـابنـەوە، کـە دەچنـە چوارچێوەی ئیشـــکردن لەســـەر تاوانەکانی جینۆساید، هەر ئەوە نییە، زیان لە یادەوەریی هاوبەشـــمان بدات و پـاڵـنـەرەکـانی کـارکـردن بـۆ پرۆژەیەکی چارەنووســـــازی

وەها سست و بێبەها بکات، بەڵکو ئامانجی باڵاتریش لە پرۆژەکەدا لەبارەدەبات، کە بریتییە لە شوێنکەوتنی یاسایی دۆسییە جیاجیاکانی کۆمەڵکوژی لە عێراق و لێپرسینەوە لە تاوانبارانی جەنگ، لەوەش باڵاتر زەمینەسازی و ئارگیۆمێنتی بابەتی و ڕەوا بۆ گەیشتن بە مافی چارەنووس.

کاتێک تۆ لە وڵاتێکدا بژی، تەنانەت یادەوەریی تاوانەکانی کۆمەڵکوژی تێدا نەبووبێتە یادەوەرییەکی نیشتمانی، کاتێک هاوڵاتییەک لە بەسرە، بابل، واست، بەغدا، دیالە، موسڵ، وەک هاونیشتمانییەک لە هەڵەبجە، دهۆک، سلێمانی، هەولێر، گەرمیان، دوای (٢٠) لە ئازادی، فێر نەبووبێ و ڕانەهاتبێت، کە چەند خولەکێک بۆ ڕەوانی پاکی پێنج هەزار هاوڵاتیی کوردی عێراقی، لە شەقام و شوێن و فەرمانگە دەوڵەتییەکاندا بوەستێت، لەو ساڵیادانەدا هاوبەشیی خەم و ئازاری یادەوەریی پێکهاتەیەکی سەرەکیی خەڵکی وڵاتەکەی خۆی









بێت، چۆن ئیتر باوەڕت بەوەش

هەبێت، کە پرۆژە نیشتمانییەکانی ناساندنی تاوانەکانی جینۆسایدیکردنی گەلانی عێراق دەچنە پێشەوە؟ چۆن بێ خەم دەبیت، لەوەی کە ئەگەری دووبارەبوونەوەی ئەو تاوانانە، نەماوەو کۆتایی هاتووە؟.

کاتێک تەواوی کەناڵە ئاسمانییەکانی عێراق کە بە سەدان، هەزاران ڕادیۆی ناوخۆیی وڵاتەکە، سەدان ڕۆژنامەو گۆڤارو ماڵپەڕی ئەلکترۆنی عێراقی، دەیان دەزگای ڕۆشنبیری و فکری، کەمترین ڕووماڵیان بۆ ئەو بەربەرییەتە هاوچەرخە نەبێت، کە لە تاوانی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە و شاڵاوەکانی ئەنفالدا ڕوویانداوە، کاتێک لەوەش خراپتر سەکۆکانی زۆرێک لە بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەم وڵاتەدا پڕکرابێتن لە وێنەو ڤیدیۆی دیکتاتۆری پێشوو و پیاهەڵدان بە دەورانی بەعسدا، چۆن دەتوانیت ئیتر دڵنیابیت، کە تۆ لە وڵاتێکدایت وڵاتی پۆست ستەمکاری؟

کاتێک کە هۆشیاریی میللیی کۆمەڵانی خەڵکی عێراق لە هەر فۆرمێکی هاودەردی و ڕێزگرتن لە یادەوەرییە تراژیدییەکان خاڵی بێت، هاووڵاتیانی وڵات سەردانی مەزارگەو مۆنۆمێنتەکانی کۆمەڵکوژی وڵاتەکە نەکەن، هیچ سیمایەکی ماتەمینی لە یادەکانیشدا نەنوێنن، چۆن و بە چ بەڵگەیەک دەیسەلمێنیت، کە تاوانەکانی جینۆساید تەنانەت لەسەر ئاستی نیشتمانی National levelناسێنراون چ جای نێودەوڵەتی!؟ بەچی دەتوانیت بێگومان بیت، کە بوونەتە بەشێک لە پەرۆشیی گشتی، تا سبەی ڕۆژ لەوەش بێخەم بیت، کە هەوڵ و پرۆژەی ناساندنی تاوانەکانی جینۆساید لەسەر ئاستی جیهان-یش Global level جێدەگرن و دەرەنجامێکیان دەبێت؟

**ئەنجامگیریی:**

بە کورتی، ئەم خەممانە، لەمڕۆدا، خەمی ڕەوا و بابەتی و شۆکهێنەرییشن، بەتایبەتی کە لە

دوو دەهەی ڕابردوودا، بۆمان دەرکەوتووە کە:

- دەمامکەکان لە عێراقی دوای دیکتاتۆری، یەک یەک، دەکەون، بە ئەزموون ڕوون بۆتەوە کە ئەم وڵاتە، بە دەوڵەت و کۆمەڵگەشەوە، لەوەدا شکستی هێناوە، کە دەوڵەت و کۆمەڵگەی تێپەڕاندنی تاوانە کۆمەڵکوژییەکان بێت.
- پاکتاوە تائیفییەکانی نێوان شیعەو سوونەکان لە دوای پرۆسەی ئازادی (٢٠٠٣ز) و هەڵمەتەکانی بەعەرەبکردن لە ناوچە کوردستانییەکان بەسن، بۆ ئەوەی لەمرۆدا لەم قەلەقییە وجودییەدا بژین!.
- ئەمرۆ ئەگەر تارمایی سڕینەوەی یەکترو دووبارەبوونەوەی هەڵبجەو تاوانەکانی ئەنفالیش لە گۆڕێدا نەبن، ئەوا هیچ مەناعەیەکی فکری و ئەخلاقی و سیاسی و میدیایی لە دامەزراوەکانی دەوڵەتی عێراقی و لە ناو خودی کۆمەڵگەی عێراقیشدا نەچێنراوە، کە مەترسی و ئەگەری کۆمەڵکوژی نوێ لە عێراقدا دووربخەنەوە.
- ئێمە لە سیستمی بیرکردنەوەو ڕەفتاری عێراقییەکان و گروپە سیاسییە جیاجیاکانیاندا ئەو ئومێدە نابینین، کە لەیەکتر دڵنیابین و پێکەوە بژین، پێکەوەش خاوەنی پرۆژەیەکی نیشتمانی بین بۆ ناساندنی تاوانەکانی کۆمەڵکوژی لە عێراقدا و قەرەبووکردنەوەی زیانلێکەوتووانی ئەو تاوانانە.
- پاساوی ئەوەی دەوڵەتی نوێی عێراق میراتگری سیاسی ڕژێمی پێشووی وڵات نییە، پاساوێکی یەکجار مەترسیدارە، هەڵهاتنێکی تەواو ئاشکرایە لە بەرپرسیارێتیەکانی کاری دەوڵەتداری لە ئاست قوربانییانی تاوانەکانی کۆمەڵکوژیی ئەم وڵاتەدا.

- توێژەر لە ناوەندی ئەکادیمیی توێژینەوەی نیشتمانی ACNS و مامۆستا لە پەیمانگای KTI.



# ڕۆڵی ئێمە لە ناساندنی تاوانی ئەنفال

م.ی. کۆڕەک عەلی ئەحمەد
مامۆستا لە زانکۆی گەرمیان



ئەنفال پرۆسەیەکی بەرفراوانی سیاسی و سەربازی نەگریس بوو، کە حکومەتی بەعس بەسەر میللەتی کورد هێنای لە سالانی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا و بەتایبەتی لە دوای شەڕی هەشت ساڵەی لەگەڵ ولاتی ئێران بە بیانووی هەبوونی دەسەلاتی سیاسی بزوتنەوە چەکدارییە کوردییەکان و هاوکاری و دالدەدانیان لەلایەن ئەو خێزانانەی کە لە گوندەکانی سنوورەکەدا دەژیان و بە ژیانی سادەو ساکاری خۆیانەوە خەریکبوون، لە دوای راپێچکردنیان و پۆل پۆل جیاکردنەوەی پیر و لاو و منداڵ لە کۆشی دایکیدا دەستی رەشیان داوەتە زیندەبەچاڵکردنیان لە بیابانەکانی خوارووی عێراق دوور لە هەموو بنەمایەکی دینی و کۆمەڵایەتی و کلتووری و نێودەوڵەتی زۆرێک لە کیژۆڵەکانیان بۆ ولاتانی تر گواستەوە، خەمێکی نەبڕاوە بۆ میللەتی کورد هاتەکایەوە، کە لە دڵ و دەروونی هەر تاکێکی کوردا بۆ ئەبەد نەڕەوێتەوە و نەوە لەدوای نەوە بمێنێتەوە.

دەکرێ ئەوە بۆ هەر تاکێکی ژێر سەقفی ئەم نەتەوە روونبکرێتەوە و بەگرنگ سەیربکرێت، کە بزانن ئەنفال چییەو چۆن کراوە، بەتایبەتی بۆ نەوەی داهاتوو تا بە کەم سەیرنەکرێت و وەک خۆی بمێنێتەوە و بە شێوازێکی تر پێیان نەوترێتەوە و بگۆڕدرێ، تا لە بەهای ئەو تاوانە دڵتەزێنە کەم ببێتەوەو ساردببنەوە لە پێشاندانی زیندە بەچاڵکردنی (١٨٢) هەزار رۆحی بێتاوان بە رووی جیهاندا، لەکاتێکدا لەناوبردن و سەرکوتکردنەکانی میللەتی ئێمەش هیچی لە لەناوبردنی ئەرمەنەکان و جولەکەکان کەمتر نییە، ئەگەریش زیاتر نەبێت. ئەم ئەرکەش زیاتر دەکەوێتە سەر هەر توێژێک کە لە لای خۆیەوە هەوڵی مانەوەو ناساندنی بدات بە رووی جیهانی دەرەوە، هەروەک دەبینین نووسەرانی بوارە جیاجیاکان کەم تا زۆر ئەم هەوڵەیان داوە و خۆیان بە

بەشێک لەم بەرپرسیاریەتیە زانیوە بۆ ناساندن و گەیاندنی هاواری (١٨٢) هەزار گیانی زیندەبەچاڵکراو بە جیهان.

ئەگەر چی نووسەر و خاوەن قەڵەمەکان لە بوارە جیاجیاکاندا دەستەوەستان نەبوون لە مامەڵەکردنیان لە گەڵ ئەم پرسە، بەڵام هەوڵەکان هەر لەو ئاستە نین کە قورسی و گەورەی تاوانەکە بە تەواوی بە جیهان بناسێنن، لەوانە نووسەرانی بواری ئەدەبیات لە رێگەی هۆنراوە و چیرۆک و رۆمانەوە چونەتە نێو باسەکە و هەوڵی زۆریان داوە بۆ نیشاندانی دۆخەکە. بە نموونە شێرکۆ بێکەس جگە لەو شیعرانەی کە وشەی (ئەنفال)ی تیادا بەکارهێناون، هەندێ شیعری هەیە، کە ناوی (ئەنفال) نەهاتووە، بەڵام بۆ ئەنفال نووسراون و وەک وشە و دەستەواژەی پەیوەست بە (ئەنفال) دەبینرێت، لەوانە وشە و دەستەواژەکانی: (عەرعەر، بێوەژنانی گەرمیان، چاڵ، گۆڕی بە کۆمەڵ، ئیڤا و تراکتۆر و شۆفلەکان، گۆڕستانی چراکان و...هتد). تەنانەت لە کۆکردنەوەی سەرجەم بەرهەمەکانیدا شێرکۆ لەبەر (ئەنفال) حسابی بۆ رەنگی بەرگی دیوانەکانیشی کردووە، بەرگی شەشەم کە رۆمانە شیعری (گۆڕستانی چراکان)ی تێدایە، رەنگی بەرگەکەی رەشە، وەک ئاماژەیەک بۆ بوونی ئەو رۆمانە شیعرەی کە تایبەتە بە (ئەنفال) لەو بەرگەدا.
هەروەها دراما یەکێترە لەو هونەرانەی کە جێی بایەخە و دەتوانێ باشتر لە ئەدەب پەیامەکە بگەیەنێت، هەر بۆیە ئەو پەیامەی بە رۆمانێک یان چیرۆکێک بەتەواوی ناگاتە جێی خۆی، ئەوا لە رێگەی دراما و شانۆوە بە ئاسانی دەگات و کاردانەوەی خۆی دەبێت، وادەکات کە تاڕادەیەکی باش سەرنجی بینەران ڕابکێشێت و بیان بهێنێتە نێو چیرۆک و دراماکەوە، کە خۆی بۆخۆی ئامانجە سەرەکیەکەی فیلمەکە دێتە دی، کە بۆ درککردنی بینەرانە بۆ ئەو ئازارەی کە هەیە. فۆتۆگرافەرییش وەک هونەرێک توانای گەیاندنی




پەیامەکەی خۆی زۆر بەجوانی هەیە و دەکرێ فۆتۆگرافەر لە ڕێگەی هونەرەکەیەوە کە وێنەگرتنە پەیامەکەی بگەیەنێت، باشتر وایە، ئاماژە بەو فۆتۆگرافەرە ئێرانییە بکەم، کە لە دوای کیمیاوی بارانی هەڵەبجە وێنەکانی گرتووە و لەنێویاندا وێنەی عومەری خاوەر کە بووە بە ڕەمزی کیمیاوی بارانەکەی هەڵەبجە، ئەگەر ئەو نەبووایە لەوانەیە هیچ وێنەیەکمان دەست نەکەوتایە، کە بەو شێوە گوزارشت لەو ئازارە بکات، کە کۆرپەیەکی شیرەخۆرە لە باوەشی باوکیدا لەسەر زەوی کەوتوون، کە گوزارشت لە زۆر شت دەکات، لەوانە ستەمێک کە حاشاهەڵنەگر بێت و بیانوبڕ بێت بۆ حکومەتی بەعس چوون منداڵێکی شیرەخۆرە هیچ تاوانێکی نییە، هەروەها سۆزی باوکێک نیشاندەدات، کە سەرەڕای ئازاری ڕۆح کێشان دەستی هەڵنەگرتووە لە سۆزی منداڵەکەی و لە باوەشی دەری نەکردووە، تا دواهەناسەی ئەمانە و زۆر شتی تر. لەم بارەوە بەختیار عەلی دەڵێ: (میدیا دەتوانێت مردنی پشیلەیەکت زۆر لا گەورەتر و بەنرختر بکات لە مردنی هەزاران مرۆڤ) کەواتە میدیاکاری گەری گەورەی هەیە لە

دونیای ئەمڕۆدا و سۆشیال میدیاش وەک بەشێک لە میدیا لە ناساندنی کەیسی ئەنفال بە دونیای دەرەوە و پێشاندانی ئەو تاوانانە بە دونیای دەرەوە و ڕاکێشانی سەرەنجی دەرەوە بۆ تاوانانە .

لە کۆتایدا دەڵێین میللەتان زۆرن، کە قەتڵوعام کراون، بەڵام هیچان نەیان توانیوە، وەک جوولەکە ئازایانە هەوڵبدەن بە گەیاندنی دەنگیان بە دونیای دەرەوە و بناسرێن و وا لە وڵات و دەسەڵاتە ستمکارەکە بکەن، کە هەموو شت بکات لەپێناو قەرەبووکردنەوەی تاوانەکە، جولەکەکان توانیان وا لە ئەڵمانیا بکەن، کە لەناو پەرلەمانی ئیسرایلدا داوای لێبوردن بکات و تاوانی هۆلۆکۆست بە جینۆساید بناسرێت.

ڕەنگە جیاوازی نەتەوەی کورد و جوولەکە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ستەمدا لەم پارگرافە بچووکەی سەرەتای ڕۆمانی (ئانا کارنینا)ی (لیۆ تۆلستۆی)دا دەربکەوێت: "هەموو خێزانە دەوڵەمەندەکان لەیەکدەچن، بەڵام خێزانە هەژارەکان هەریەکەو بەجۆری جیاواز و تایبەت بە خۆیان هەژارن." مەبەستم لەوەیە، کە ڕژێمە ستەمکارەکان هاوشێوەی یەک بیر دەکەنەوە و هەموو دەیانەوێ بۆ گەیشتن بە مەرامەکانیان میللەتانی تر ئازاربدەن و لەسەر دنیا بیانسڕنەوە، بەڵام میللەتە ستەملێکراوەکان وەک خێزانە هەژارەکان هەر یەکەیان بە جۆری جیاواز ڕووبەڕووی ئەو ستەمە دەبنەوە، گەلی جوولەکە بە هونەرمەندان و نووسەرەکانیانەوە دەیان فیلم و سەدان بەرهەم لە شیعر و چیرۆک و ڕۆمانیان نووسی و توانیان بە ئەو ئامانجە بگەن، کە مەبەستیان بوو، هەر بۆیە دەکرێ بڵێین ئێمە تا ئێستا چیمان کردووە و دەبێ چیبکەین، بۆ ئەوەی کە تاونانی ئەنفال بەڕەسمی وەک جینۆساید بناسرێت.



# موقف بعض الدول الأوروبية

# تجاه المذبحة الجماعية للكورد في العراق

إعداد: م. سامان شكر سمين

جامعة گرميان / قسم القانون



تعد الإبادة الجماعية للشعب الكوردي في العراق في ثمانينيات القرن الماضي واحدة من أهم الأحداث المأساوية والوحشية في التاريخ الحديث. نتجت هذه الإبادة الجماعية عن سياسات نظام صدام حسين التي استخدم فيها كافة أشكال العنف. وكانت هذه الأحداث نتيجة مباشرة للسياسات القمعية التي اتخذها النظام البعثي في العراق بحق الكورد في تلك الوقت. وكانت تشمل تكتيكات النظام البعثي ضد الشعب الكوردي عمليات إعدام جماعية وتهجير قسري واستخدام الأسلحة الكيميائية، مثل غاز الخردل وغاز الأعصاب، ضد المدنيين. وكان الهدف من هذه الحملة القمعية هو قمع طموحات الشعب الكوردي نحو الحكم الذاتي والاعتراف بثقافتهم الخاصة. تمثل هذه الأحداث حالة صارخة لانتهاكات حقوق الإنسان وجرائم ضد الإنسانية، وقد أدت إلى مقتل الآلاف من المدنيين وتركت آثاراً مدمرة على المجتمع الكوردي.

وعلى الرغم من حجم الفظائع المرتكبة، فإن استجابة المجتمع الدولي، وخاصة أوروبا، كانت بطيئة ومجزأة. وفي مواجهة تلك الفظائع، كان من المتوقع من المجتمع الدولي أن يتخذ موقفا حيال ذلك وأن يدعم الضحايا. ومع ذلك، فإن استجابة الدول الأوروبية لهذه الأزمة كانت مختلطة.

كانت المذبحة الجماعية للكورد بمثابة أزمة كبرى في مجال حقوق الإنسان تطلبت استجابة دولية قوية. ولعبت الدول الأوروبية دورا مهما في هذه الاستجابة، سواء من خلال الجهود الدبلوماسية أو تقديم المساعدات الإنسانية. ومع ذلك، كانت استجابة الدول الأوروبية متباينة، حيث اتخذ بعضها موقفا أقوى من البعض الآخر. وكان أحد الجهود الدبلوماسية الرئيسية للدول الأوروبية هو إدانة الفظائع المرتكبة ضد الشعب الكوردي في العراق. وأصدرت بعض الدول الأوروبية بيانات تدين أعمال العنف وتدعو إلى إنهاء الصراع.

تأثر رد فعل الدول الأوروبية على المذبحة الجماعية للشعب الكردي بعدة عوامل. وكان من أهم هذه العوامل العلاقات الاقتصادية والسياسية، إذ كان للعديد من الدول الأوروبية علاقات اقتصادية وسياسية وثيقة مع العراق

وقتذاك. وهذا ما جعل من الصعب عليهم اتخاذ موقف قوي ضد العراق، لأن ذلك قد يعرض هذه العلاقات للخطر. ومن العوامل الأخرى التي أثرت على موقف الدول الأوروبية هو الخوف من زعزعة استقرار المنطقة، وأعربت العديد من الدول الأوروبية عن قلقها من أن اتخاذ موقف قوي ضد العراق قد يؤدي إلى مزيد من العنف وعدم الاستقرار في المنطقة.

وأخيرا، كان تأثير السياسة الداخلية على قرارات السياسة الخارجية أحد العوامل أيضا، في بعض الحالات، كانت الدول الأوروبية مترددة في اتخاذ موقف قوي بشأن المذبحة الجماعية للكورد، بسبب الضغوط من مجموعات المصالح المحلية أو الأحزاب السياسية.

وكان لرد الدول الأوروبية على المذبحة الجماعية للأكراد عدد من الآثار المهمة. وكان من أهم هذه التأثيرات تأثيرها على العلاقات بين الدول الأوروبية والعراق. وأدت إدانة بعض الدول الأوروبية للتصرفات العراقية إلى تدهور العلاقات بين هذه الدول والعراق، من ضمنهم: السويد وفرنسا والمانيا. فقد تفاعلت السويد وفرنسا والمانيا بشكل ملحوظ مع مأساة المذبحة الجماعية للشعب الكوردي في العراق خلال الثمانينيات، وكان لهذا التفاعل تأثير كبير على الأحداث والمسار الذي اتخذتها القضية في الساحة الدولية.

إذ اتخذت السويد موقفا حازما تجاه مأساة المذبحة الجماعية للكورد في العراق، حيث أدانت بشدة الانتهاكات الخطيرة لحقوق الإنسان التي ارتكبت في العراق ضد المدنيين الكورد في العقد الثامن من القرن العشرين. وقامت بالمطالبة بالتحقيق في الجرائم ومحاسبة المسؤولين عنها، وشددت على ضرورة احترام المعايير الدولية لحقوق الإنسان. كما اعترف البرلمان السويدي في ٢٠١٢ بجرائم الابادة الجماعية التي ارتكبيت بحق الكورد في العراق، ويعود السبب في ذلك الى قوة الدور الذي مارستها الجالية الكوردية في السويد ودور القيادات والأحزاب الكوردية في جمع قواهم وتحريضهم على دعم هذا الملف. نظرا لان الجالية الكوردية أصبحت جزء من المجتمع السياسي السويدي وبمقدورهم التأثير على القرار السياسي.

أما بالنسبة لموقف فرنسا، وهي كانت من أوائل الدول في تقديمها للمساعدات الإنسانية والمالية للفارين والناجين من عمليات الابادة الجماعية التي مارستها الحكومة العراقية في حينها. والأهم من ذلك موقف الراحلة السيدة ( دانيال ميتيران ) والتي يطلق عليها أسم (أم الكورد) من خلال زيارتها التأريخية لمخيمات اللاجئين وجلبها لمئات منهم لفرنسا كي يتم منحهم بعد ذلك حق اللجوء السياسي. حسب أقوال كندال نزان رئيس المعهد الكوردي في باريس، فأن فرنسا جلبت قضية الأنفال للمسرح الدولي. وكانت فرنسا في مقدمة الدول الاوروبية في اتخاذ موقف، بشأن عملية الانفال، وقامت بإدانة الحكومة العراقية وطالبت بوقف قصف الكيمياوي ضد الكورد، ودعت إلى ضرورة إجراء تحقيق دولي شامل حول الجرائم المرتكبة ومحاسبة المسؤولين عنها، وذلك لضمان تحقيق العدالة. لكن لم يؤدي ذلك الى اعتراف فرنسا بشكل رسمي بالابادة الجماعية التي تعرض لها الكورد، ويعود ذلك الى جملة من الاسباب الاقتصادية والسياسية والقانونية، فضلاً عن ضعف دور الجالية واللوبي الكوردي في فرنسا. كما إن عدم اعتراف فرنسا بالإبادة الجماعية انذاك بالرغم من تعاطفها مع القضية الكوردية تعود الى حكم قوة العلاقة بين فرنسا والعراق وقتذاك، وإن اعتراف فرنسا بالإبادة الجماعية ستجعلها أمام مأزق كبير، لأنها شاركت في بيع الأسلحة للحكومة العراقية التي استخدمت لأبادة الكورد.

وأيضاً ألمانيا كانت من بين الدول التي أدانت بشدة الجرائم ضد الكورد في نهاية الثمانينيات من القرن الماضي حول مذبحة حلبجة وعمليات الانفال التي ارتكبيت على يد نظام صدام حسين في العراق. وقد كانت ردود الفعل الألمانية حيال هذه الأحداث متنوعة. بشكل عام، كانت المانيا تنتقد بشدة الانتهاكات الجسيمة لحقوق الإنسان التي ارتكبتها الحكومة العراقية ضد الكورد وغيرهم من السكان في العراق. قادة ألمانيا ومسؤولين حكوميين كانوا يدينون بشدة الهجمات الكيميائية التي استخدمت في حلبجة والتي أسفرت عن مقتل آلاف الأشخاص بما في ذلك الكثير من النساء والأطفال. بالإضافة إلى ذلك، تبنت المانيا موقفاً

صـــارماً في المنتديات الدولية مثل الأمم المتحدة للضـــغط على الحكومة العراقية للالتزام بمعايير حقوق الإنســـان ووقف الانتهـاكـات ضـــــد الكورد في العراق. إجمـالاً، كـان لـدى المـانيـا موقف قوي ومندد تجاه المذبحة الجماعية للكرد في حلبجـة والانتهـاكات الجســـيمـة لحقوق الإنسان في العراق في تلك الفترة.

بشكل عام، يمكن القول إن تفاعل السويد وفرنسا والمانيا مع مأساة المذبحة الجماعية للشعب الكوردي في العراق خلال الثمانينيات كان يعكس التزامهم بقيم حقوق الإنسان والعدالة الدولية، وتأكيدهم على ضرورة محاسبة المسؤولين عن الجرائم وتقديم الدعم للضحايا. وكان لمواقف تلك الدول آثار على العلاقات الاقتصادية والسياسية مع العراق.

في الختام يمكن القول، أن مواقف الدول الاوروبية كانت متباينة، حيث إن موقف كل دولة كانت تعكس حسب مصالحها في هذه المنطقة، وبالمقابل نرى بأن هناك إغفال مواقف بعض الدول الأوروبية، وعدم اتخاذ أي قرار أو موقف تجاه مذبحة حلبجة وحملات الانفال، قد يأتي هذا الاغفال بسبب عدم إيصال ذلك الى هذه البلدان، والسبب وراء ذلك هو عدم نقل وسائل الاعلام حقيقة عملية الابادة التي تعرض لها الشعب الكوردي، واغفال وسائل الاعلام هذه جاءت بالأساس خوفاً من الحكومة العراقية الذي استخدم كل أساليب التهديد لمنع نقل الحقائق الى الرأي العام في العالم. ثم إن وردود الفعل المتباينة من جانب الدول الأوروبية على المذبحة الجماعية للكورد كانت رسالة إلى الشعب الكوردي مفادها أنهم لا يحظون بدعم المجتمع الدولي قي تلك الوقت.

# ما هكذا يُكرم الشهداء

جهاد الدلوى



اغلب دول العالم يبنون النُصب التذكارية خاصة لمن ضحوا بحياتهم فداءً للوطن ودفاعًا عن المقدسات، يطلقون عليهم نصب (جندي المجهول) ومنهم يصنعون النصب والتمائيل تخليدًا ولمن يُقتلون ظلماً .
تاريخنا الكوردي باقاليمه الاربعة الممزقة والمسلوخة عن الوطن الام (كوردستان الكبرى) تعرضوا وما زالوا يتعرضون لهذه المظالم، فعمليات القتل الجماعي (جينوسايد) المسمات بعمليات الانفال الذي تعرض له الكورد في الكوردستان الجنوبية (كوردستان العراق) والذي كُتب عنه عشرات المقالات والابحاث وانتاج عشرات الافلام الوثائقية . علما ان عمليات الانفال كانت بثمانية مراحل بدأت في (١٨) بشباط حتى (٦) ايلول من عام (١٩٨٨) الذي خلف عنه (١٨٢٠٠٠) الف شهيد وتدمير اكثر من (٤) آلاف قرية وسرقة (٢٠) مليون رئس حيوان .

لتخليد هؤلاء الشهداء تبرع الشيخ محمد الشاكلي نيابة عن عائلة الشاكلي بقطعة ارض تقدر بـ(١٥٠٠) متر مربع في ناحية رزگاري (الصمود) ليشد عليها حديقة عامة ونصب تذكاري سميت (الانفال) وهو أول نصب تذكار يقام في كوردستان العراق استذكارًا لشهداء عمليات الانفال الذين قضوا نحبهم في تلك البقعة اللعينة التي تسمى بـ(نگرة السلمان) في ناحية السلمان التابعة لمحافظة المثنى (السماوة) . هذا النصب هو من تصميم النحات الدكتور (بيان ماني) الذي فاز نصبه من بين مجموعة من النماذج التي قدمت للجنة التقييم والاختيار التي اقيمت في السليمانية، شيد على قاعدة (١٥) متر وبارتفاع (١٠) امتار .
افتتح في نيسان (٢٠٠٤) بحضور رئيس وزراء اقليم كوردستان آنذاك السيد (عمر فتاح) بصحبة عدد من الوزراء والمدراء العامون مدراء الدوائر الحكومية والمنظمات المدنية وعدد غفير من المواطنين .
من المفروض هكذا المواقع الرمزية ان يحافظ على جماليتها وقدسية مكانتها في قلوب ذوي وابناء الشهداء والكورد بشكل عام وذلك بادامتها بشكل مستمر وحمايتها من عبث العابثين سواء بقصد او بغير قصد خاصة والمراهقين الشباب الذين يتخذون من هذة الاماكن والحداق والمتنزهات مكانًا للهو والعبث والتخريب، وذلك بتعيين حارس وبستاني وهذه من مسؤولية ادارة گرميان وناحية رزگاري .
فالاهمال وعدم الادامة يعني تحول هذا المكان الى حديقة خربة هرمة يابسة




الاشــجار ومكان لتواجد الحيوانات (اجلّكم الله) في نفس الوقت يُعد اهانة وانتقاصًــا من رمزية ومكانة هذا العمل الفني من جهة ومن جهة اخرى فهي اهانة للشهداء ولابناء واحفاد الشهداء .

هذا النصــب مع قاعدته بحاجة الى الادامة وصــيانة الانارة كذلك الاهتمام بالاشجار والمساحة الخضراء مع البوابة والســياج وقطع الاشــجار التي تقع في الواجهة الامامية التي تحجب رؤية الناظرين الى التمثال واعداد تصــميم جديدة بشــكل هندسي جميل لاعادة زرع اشجار الظل والزينة .

تحية اجلال واكبار لارواح الشهداء ...



# خوێندنەوەیەك بۆ میكانیزمەكانی بەعس
# بۆ پاكتاوی ڕەگەزی كورد لە كوردستانی باشوور
# (جینۆساید)

م.ی. عەلی گەرمیانی
بەشی مێژوو/ كۆلێژی زمان و زانستە مرۆڤایەتییەكان زانكۆی گەرمیان



هەمیشە دەسەڵاتدارانی عێراق هەریەکەیان لە ڕوانگەی تایبەتی خۆیەوە هەوڵی ئەوەی داوە، کورد لە عێراقدا بەو شێوەیە لەقاڵب بدات، کە لە بەرژەوەندیی خۆیەتی، هەر لە زەمانی ئینگلیزەوە تاوەکوو ئەمڕۆ ئەو تەقەلایە بەردەوامە و دەستی لێ هەڵنەگیراوە، مەبەستی بنەڕەتی هەموو ئەوانەش یەک مەبەستە، ئەویش ئەوەیە کورد لە عێراقدا داببڕن، بەجۆرێک هەستنەکات بەشێکە لە نەتەوەی کورد و کوردستانی گەورە. تەنانەت لە سەردەمی ئینگلیزەکان هەوڵ و تەقالا ڕوو لەوەبوو، کورد ناچاربکرێ خۆی بە بەشێک لە بەریتانیای گەورە بزانێت، هەوڵەکانی ڕژێمە فاشییە یەک لە دوای یەکەکانی عێراقیش ئەوەبوو، کە کورد داببڕن لە هەستی ئینتما بۆ نەتەوەی کورد و ببێت بە بەشێک لە نەتەوەی عەرەب، دیارە ئەم پرسەش مێژوویەکی دووروودرێژی هەیە و پرۆسەیەکی بەردەوامە و لە هەلومەرجە جیاوازەکان بە فۆرمی جۆراوجۆر مامەڵەی لەگەڵ کراوە. ئەم پرۆسەیە ئەوەندە دڕندانە و بەردەوام و دووروودرێژە بە چەندین نووسین و کتێب و باسکردن تەواو نابێت، بەڵام ئێمە لێرەدا ئەنامەوێت تیشکبخەینە سەر دوارژێمی ڕەفتار فاشیی عێراق لە سڕینەوە و پاکتاوی ڕەگەزی و جینۆسایدی گەلی کورد، ئەویش ڕژێمی بەعس بوو، دیارە هەلومەرجی دوای شکستی شۆڕشی ئەیلوولیش لە دوای بەهاری ساڵی (١٩٧٥ز)وە زەمینەیەکی باش و گونجاوی بۆ فاشیستەکانی بەعس خۆشکرد، تا ڕەفتاری فاشییانەی خۆی بە شێوەیەکی دڕندانە لە کوردستان ئەنجامبدات. بە هێزێکی گەورەی مرۆیی دەیان هەزار پیاوانی ڕژێم و بە پارە و پوڵێکی زۆر نەخشە و پلانی تایبەت و ورد و لێبڕاوانە کەوتە هەوڵدان بۆ قەلاچۆکردنی کورد.

جا بۆیە ئەگەر ئێمە باس لە میکانیزمە جۆراوجۆر و ترسناکەکانی ئەو ڕژێمە دیکتاتۆرە بکەین بۆ پاکتاوی ڕەگەزی خەڵکی کوردستان، ئەمیش باس و خواسی زۆر هەڵدەگرێ و لەوانەیە بە چەندین نووسین و توێژینەوە و کتێب تەواونەبن، ئەوەندە زۆر و جۆراوجۆرن، بەڵام لە هەرە ترسناکترینیان سێکوچکەی ڕاگواستن (تەرحیل) و ئاوارەبوون

(تەهجیر) و پاکتاوکردن (تەسفیر) بوو، کە لە دوایی ئاماژە بە میکانیزمەکانی تریش دەکەین.

أ. ڕاگواستن (تەرحیل): هەزاران موچەخۆری کورد لە مامۆستا و فەرمانبەر و ئەفسەر و پۆلیس، بە تایبەت ئەوانەی کە هەستی کوردایەتییان بەهێزبوو، گواسترانەوە بۆ ناوچەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق - ناوچە عەرەب نشینەکانەوە بۆ خرانە ژێر چاودێرییەوە و سڕینەوەی زمان و کەلتووریان.

ب. ئاوارەبوون (تەهجیر): ڕاگواستنی سەدان هەزار گوندنشین لەسەر کار و پیشەی خۆیان لەسەر خاک و وڵاتی خۆیان هەڵکەندران بەرەو خوارووی عێراق و کۆمەڵگا زۆرەملێکان گوازرانەوە.

ت. پاکتاوکردن (تەسفیر): زیادتر لە نیو ملیۆن کوردی فەیلی لەسەر زێدی باوباپیرانیان گواستراونەتەوە بۆ سەر سنوورەکانی ئێران بە بیانوی (التبعیة الایرانیة) و ڕەگەزنانەی عێراقییان لێ سەندنەوە و دەستیان گرت بەسەر هەموو ماڵ و موڵکیان.

سەرەڕای ئەمانەش پرۆسەکانی بەعەرەبکردن (تەعریب) کە تا ئێستاش بەردەوامە، دەربەدەرکردن و ڕاگواستنی هاوڵاتیان لە شوێنەکانیان و نیشتەجێکردنی عەرەب لە شوێنەکانیان بەتایبەتی ناوچە سنوورییەکان. کە ئەوەش تێکدانی قووڵایی ستراتیژی جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی خەڵکی کوردستانە، تا بۆشاییەک لە نێوان کورد و عێراق و کوردی ئێران و تورکیا و سووریادا دروست ببێت، کوردی عێراق نەتوانێت بۆ گەشەکردن و بۆ پێشەوەچوونی جوڵانەوەکەیان لەو سەردەمەدا قووڵاییەکی نەتەوەیان هەبێت، واتە عومقی نەتەوەیی، ئەوەندەش لە تواناادا بێت لە پارچەکانی تری کوردستان دابڕێ و هەستی ئینتمای بۆ نەتەوەی کورد لاوازبکات یان نەیهێڵێ، تا حکومەتی مەرکەزی عێراق بە ئارەزووی خۆی و بەو جۆرەی ئەیەوێت لە عێراقدا کورد لە قاڵب بدات. هاوکات ناچارکردنی کورد بۆ گۆڕینی ناسنامەی نەتەوایەتی لەژێر فشاری هەڕەشە و دەربەدەرکردندا، کە زۆریان بۆ خەڵک دەهێنا، خۆیان بە عەرەب

ناونووس بکەن. پێناسـی کوردیان لێوەرگرنەوە وەک ئێزدییەکـان و شـەبەک و گەلێک لە خێزانەکانی خـانەقین، گەرمیـان و کەرکووک. هاوکات لابردنی خوێندنی کوردی لە خوێندنگاکان و هاندانی کەسـانی نزیک لە خۆیان تا منداڵەکانیان بخەنە بەر خـوێـنـدنـی عەرەبـی. سـەرەڕای ئەمـانەش بەعس بە داخسـتنی دەزگـا زانسـتی و ڕۆشـنبیرییەکـان و سـڕینەوەی کەسـایەتی سـەربەخۆی هەندێکی تریان وەک زانکۆی سـلێمانی و کۆڕی زانیـاریی کورد و یەکێتی نووسـەرانی کورد لەو سـەردەمەدا، کە ڕۆڵی بەرچاویان لە هۆشـیاری نەتەوەییدا هەبوو. هاوکات لە ڕووی کۆمەڵایەتیشـەوە بەعس هاندانی ژن و ژنخوازی لە نێوان کورد و عەرەب و بـێـگـومـان ئەنـجـامەکەی بەعەرەبکردن دەشـکـایەوە، چونکە عەرەب نەتەوەی سـەردەسـتە و بالادەست بوون.

یەکـێـک لە مـیـکـانـیـزمە هەرە ترسـناکەکانی بەعس بۆ پاکتاوی ڕەگەزی، وێرانکـردنی شـار و شـارۆچکە و دێهاتەکانی کوردستان بوون، کە سیاسەتی (زەوی سووتاو) لە لایەن فاشـییەکانەوە پیادەدەکرا، کە نزیکەی ٢٥ هەزار گونـدیـان کـاولـکـرد، بـاخ و کـێـڵـگە و دارسـتـانەکـانیان سـووتاند و سـەرچاوەکانی ئاویان کوێرکردەوە لەگەڵ زەویدا تەختیان کرد. هاوکات زیـادتر لە ٢٠ ملیۆن مینیـان لە کوردستان چاند، سەرەڕای ئەمەش کۆکردنەوەی ئەو خەڵکە زۆرە لە کۆمەڵگا زۆرەملێکاندا، کە دەتوانرا بە ئاسـانی چاودێری بکرێن ناویان نابوون (شـاری هاوچەرخ)، بەلام لە ڕاسـتیدا لە سـەربازگەکانی هیتلەر دەچوون، کە بۆ جینۆسـایـدی جوولەکەکان دروستکرابوون.

لە ڕاستیدا مەترسی ئەم کۆمەڵگایانە لە چەنـد ڕەهەنـدێکەوە دەتوانین ئـامـاژەیـان پێبـدەین، لە لایەنی (سـەربـازییەوە) هیچ کەسـێـک دەرفەتی دەرچوون یـان ڕاکردنی نەبـوو، جـگە لەمەش لە ڕووی (کۆمەڵایەتییەوە) کوردی گوندنشـین هیچ کات ڕانەهاتبوو لە شـوێنی لەو جۆرەدا بژی، بۆیە هەر زوو کێشەی کۆمەڵایەتی ترسـناک لە نێوانیاندا بـڵاوبـووەوە، لە ڕووی تەندروسـتیشـەوە ئەم کۆمەڵگا زۆرەملێیـانە نە ئـاوی هەبوو نە

ئاوەڕۆ، بێ نەخۆشخانە و پزیشک و دەرمان و کوتانی منداڵان، بۆیە هەر زوو نەخۆشـی ترسـناک لە ناویاندا بڵاوبووەوە.

وێڕای هەموو ئەمانەش ماشێنی جەنگی بەعس و میکانیزمەکانی بەبەعسکردن لە خولانەوە و بەردەوامبووندا بوون، بۆیە لە ستراتیژی دوورمەودای ئەو حزبە فاشیەدا وابوو، ئەو کەمینە نەتەوایەتیانەی لە پاڵ عەرەبدا دەژین بیانەوێ و نەیانەوێ لە ڕەگەزدا عەرەبن، یان پێویستە بکرێن بە عەرەب، بۆ ئەم مەبەستەش دەستیان کرد بە وەرگێرانی هەموو ئەو نووسینانەی کە نووسەرانی شۆڤینی عەرەب و بەعس دەریان دەکرد بە خۆڕایی یان زۆر بە هەرزان بەناو خەڵکیدا بڵاویان دەکردەوە. سەرەڕای ئەمانەش لە بواری پەروەردە و فێرکردندا سەرانسەری بەرنامەکانی خوێندنیان گۆڕی بە ڕاوبۆچوونی فاشیانە و شۆڤێژنیانەی خۆیان پڕیان کردەوە، نووسینەوەی مێژوویەکی نوێیان ڕاگەیاند و ناوی کوردستانیان لە هەموو شوێنێکدا کوێر کردەوە و هەموو سەروەرییەکان بە عەرەب بەخشی.

دیارە ستراتیژی دوورمەودایان بەوشێوەیە بوو کە ئەگەر بەم میکانیزمانەی کە لە پێشەوە ئاماژەمان پێدکرد، ئەگەر کورد لەناونەچوو دوا میکانیزم کە ئەنفالی کورد یان قڕکردنی بە کۆمەڵی مرۆڤی کورد (جینۆساید) پیادەبکەن.

بۆ ئەم مەبەستەش شاڵاوەکانی ئەنفال و کیمیابارانی کوردستان دەستی پێکرد. فاشیستەکانی بەعس بێ سڵەمینەوە کەوتە هێرش و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، ئەوە بوو لە ١٩٨٧/٤/١٥ ناوچەی سورداش و قەرەداغی کیمیاباران کرد، دواتر ١٩٨٧/٤/١٦ و ١٩٨٧/٥/٢٧ دۆڵی مەلەکان، شێخ وەسان و بالیسانی کیمیاباران کرد و زیادتر لە ٢٠٠ کەس بوونە قوربانی. لە هاوینی هەمان ساڵدا شاری سەردەشت و چەند ناوچەیەکی سەرپێل زەهاوی لە ڕۆژهەڵات کیمیاباران کرد و بە سەدان کەس بوونە قوربانی. لە ١٩٨٨/٣/١٦ دا بە فڕۆکە شاری هەڵەبجەی کیمیاباران کرد و بە هەزاران کەس بوونە قوربانی، زیاد

لە (١٠،٠٠٠) دە هەزار کەسیش بریندداربوون، لە ١٩٨٨/٣/٢٢یشدا بە کاتیۆشا گوندی سێوسێنانی کیمیاباران کرد کە (٦٨) کەس شەهیدبوون و زیادتر لە (١٠٠) کەسیش برینداربوون. لە بەرەبەیانی ١٩٨٨/٥/٣ هەردوو گوندی گۆپتەپە و عەسکەری کیمیاباران کرد و زیادتر لە (١٥٤) کەسی شەهیدکرد و بە سەدانی دیکە برینداربوون.

لە کاتێکدا هەوڵی نێودەوڵەتی هەبوون بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی عێراق و ئێران، فاشیەکانی بەعس لە حکومەتی عێراق ئەوەی بە دەرفەت زانی و لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨ بەشێکی زۆری هێزەکانی کۆکردەوە بە پشتیوانی (جاش) بڕیاری دا ناوچەکانی کوردستان لە دەستی پێشمەرگە دەربهێنێت. جێگەی ئاماژەپێکردنە لەو کاتەدا زۆربەی گوندەکانی کوردستان لەژێر دەستی پێشمەرگەدا بوون و بە ناوچەی رزگارکراو دەناسران. حکومەتی عێراق ئەم هێرش و شاڵاوە دڕندانەی ناونا ئەنفال، لەم ئۆپەراسیۆنەدا سوپای عێراق باشوری کوردستانی کردە ٨ ناوچە و لە چوارچێوەی هەشت ئۆپەراسیۆندا لە ٢٢/شوباتی/ ١٩٨٨دا لە ناوچەی سورداش دەستی پێکرد و لە ناوچەی بادینان لە ١٩٨٨/٩/٦ کۆتایی بە شاڵاوەکە هێنا، لەم پرۆسەیەدا نزیکەی (٤،٥٠٠) گوندی کوردستان خاپورکران و سووتێنران و بە هەزاران کەس شەهیدکران و (١٨٢،٠٠٠) کەسیش بێسەرو شوێن کراوە، کە ئەوانە بە ئەنفالکراوەکان دەناسرێن.

لە ئۆپەراسیۆنی سێیەمدا کە لە سەرەتای نیسانی ١٩٨٨ لە ناوچەی گەرمیان بەڕێوەچوو، تا ٢٠ی نیسانی ١٩٨٨ بوو، ئەم قۆناغەیان لە سەرجەم قۆناغەکانی تر کارەساتبارتر و بە زیانتر بوو لە ڕووی مادی و مرۆییەوە، چونکە (٧٠ – ٨٠) هەزار مرۆڤی کوردی تێدا بێسەروشوێن کرا و ئەم ناوچانەی گرتەوە (دوزخورماتوو، کفری، کەلار، دەربەندیخان، زنجیرە چیاکانی قەرەداغ، تەکیە، چەمچەماڵ، قەرەهەنجیر، قادرکەرەم، سەنگاو، تیلەکۆ، باوەنوور، ئاخجەلەر). لەم ئۆپەراسیۆنەدا زۆرترین کەس شەهیدبوون و لە ڕۆژی ١٩٨٨/٤/١٤ زۆرترین کەس ئەنفالکران، هەربۆیە لە ئێستادا گەرمیان وەکو سیمبولی ئەنفال دەبینرێت و ڕۆژی



١٩٨٨/٤/١٤یش وەکو ڕۆژی ئەنفال دیاریکراوە. هەتا ئێستا ئێسک و پروسکی چەند هەزار کەسێک دۆزراوەتەوە، بەڵام زۆربەی زۆری ونبووەکان نازانرێت چیان لێکراوە، بەپێی هەندێک بەڵگە، ژمارەیەک کچی گەنج و منداڵی ئەنفال فرۆشراون بە سەرمایەدار و بارەکانی وڵاتانی عەرەب.

شێرکۆی گەورە شاعیری کوردیش دەڵێت:

له خوار کفری
ژنێک هەیە لە چاوانیا لە بینینا
سێ ڕەهەندی تیانەماوە
نە ڕۆژهەڵات نە خۆرئاوا
نە لای باکور
لەو ساکەوە چاوەڕوانە
هەموو ڕۆژێ دێتە دەرێ و
لەبەر دەرگا دائەنیشێ و
چاو ئەبڕێتە
ئاسۆی دووری
تەنها ڕەهەند دەشتی باشور

ئەمە و پێشتریش کۆکوژی بارزانییەکان ڕوویدابوو، دوای شکستی شۆڕشی ئەیلوول ساڵی ١٩٧٥ بەشی زۆری بارزانییەکان لەگەڵ مستەفا بارزانیدا ناچنە ئێران، ئەمەش دوو هۆکاری هەیە:

یەکەم: بەشێکیان ناکۆک دەبن لەگەڵ مستەفا بارزانی وەکو شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد و شێخ خورشیدی خوشکەزای شێخ ئەحمەد (کوڕی مەریەم) کە بە ڕێبەری خورشیدییەکان و جێنشینی

شـــێخ ئەحمەد دەناســـرا، هەروەها عوبەیدوڵڵای کوڕە گەورەی بارزانی و لوقمـان و ســــابیری کوڕی کە بیروبۆچوونی جیـایـان هەبوو لە بـاوکـیـان، دیـارە هەنـدێـک لە بارزانییەکانیش ئیتر دەیانخواست بە ئارامی بژین. بۆ ئەمە لە باشـــوور دەمێننەوە، حکومەتی عێراقیش ڕێگەیان پێنادات، کە بچنەوە زێدی خۆیان، ١٥٨٩ خێزان لە قوشـــتەپە، ٥٦٧ خێزان لە هەریر، ٥٤٦ خێزان لە دیـانـا و ١٤٠ خێزان لە قۆرەتوو جـێـگـیـردەکـات. بەپـێـی وتەی عەبدولمســـەور بارزانی تەنیا (٥٢) خێزانی بارزانی لەگەڵ مەلا مستەفادا چوونەتە ئێران. حکومەتی ڕەفتـار فـاشـــیـی عـێـراق لە ١٩٨٠/٩/٢٦ عـوبەیـدوڵـڵای کـوڕی بـارزانـی دەســـتگیردەکات و دوای هەفتەیەک لوقمانی برای دەســـتگیردەکرێت و بێسەرو شوێن دەکرێن. دوای ئەوەی ئێران بە هاوکاریی پارتی دیموکرات لە تەمموزی ســـاڵی ١٩٨٢ حاجی ئۆمەران دەگرێـت، حکومەتی عێراق لە تـــۆڵەی ئەوەدا لە ٧/٣١ و ١٩٨٣/٨/١دا ئابلۆقەی نشـــینگەکانی بـارزانییەکـان دەدات و دەیـانبـات شـــوێن بزریان دەکات. ئەم ڕووداوە دواتر بە ئەنفـالی بـارزانییەکـان ناسێنرا و بەپێی بەڵگە (٨٠٠٠) کەس بوون، کە بێســەرو شــوێن کراون و لە ناویاندا شـــێخ عوســـمان، شـــێخ خورشـــید و ســـابیری کوڕی مەلا مستەفای تێدا بووە.

ســەرەڕای هەموو ئەم مەرگەسات و قڕکردنـانەی کە بەســـەر کورددا هێنرابوو، بەعســـییەکان هەمووجار دەیـانوت (الكردي الجيد هو الكردي الميـت) زۆرجـار بە مردووییش ڕێزیـان لە کورد نەدەگرت، ئەگەر سەیرێکی ئەو گۆڕستانانەت بکردایە، کە ئیعـدامکراو و خنکێنـدراوەکـانی کوردیان تیا ناشـــتبوو، بەتایبەتی قەسابخانەی موسڵ، خنکێندراوەکانی کورد بەزۆری ئەندام و پێشمەرگەی یەکێتیی نیشـــتمـانی بوون. بەعس بـێـحـورمەتـیـیەکـی زۆری بەو گۆڕستانانە کردبوو، چەند لاشەیەکی لە یەک گۆڕدا شـــاردبۆوە، کێلی قەبرەکان هەمووی شـکاو و کەل و کـۆم، هەرچەنـد کەســـوکـاری قوربانییەکان لەسەر هەندێکیان ناوی کـوڕەکـانـیـان نـووســـیـبـوو، گۆڕســـتانەکان پەرژین نەکرابوون، ســـەگ و ئـاژەڵ و وڵاخ ئەچوونە ناوی، ئەمە و ســەرەڕای هەموو ئەو



بێحورمەتیانەی کە لە نوگرەسەلمان بەرانبەر ژن و منداڵ و بەساڵاچوو و سەقیلی کورد دەکران، کە جێگەی شەرمەزاری مرۆڤایەتی و مافی مرۆڤ بوون. زۆرجاریش لەسێدارەدراوان و خنکێندراوانی کورد شوێن بزردەکران و گۆڕەکانیان کەس نەیدەزانی لە کوێن و کەسوکار و خانەوادە و بنەماڵەکانیان بە حەسرەتی دوامەنزڵگای ڕۆڵەکانیان سەریان دەنایەوە و بەدوایدا دەگەڕان.

بۆ نوسینی ئەم بابەت سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١- دیار غەریب، خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ مێژووی کوردستان، چاپخانەی شڤان، چاپی یەکەم، پایزی (٢٠١٦).
٢- سەلاح ڕەشید، دیداری تەمەن لە لاوێتیەوە بۆ کۆشکی کۆماری، مام جەلال، گفتوگۆیەکی فراوانی هەمەلایەن.
٣- نەوشیروان مستەفا ئەمین، خولانەوە لەناو بازنەدا، دیوی ناوەوەی ڕووداوەکانی کوردستانی عێراق (١٩٨٤-١٩٨٨)، چاپ و بڵاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانی کوردستان، چاپی دووەم، (١٩٩٩).

ئەوەی دەمەوێ لێرەدا بیکەمە جێی قسە و شرۆڤەکاری بۆ ئەم باسە، قسە لە سەرکردنە لە سەر دوو رووداوی تاوانی گەورەی نێو رووداوەکانی جیهانی سەدەی بیستەمە، دوو ستەم و جینۆسایدی دوو گەل و نەتەوەی جیاوازە، کە ئەوانیش هۆلۆکۆستی جولەکەیە بە دەستی سەردەمی دەسەلاتی نازییەکانی ئەڵمانیا و ئەوەی تریش کوردی باشووری کوردستانە لە ساڵی ١٩٨٨ بە دەستی دەسەلاتی رەشی حزبی بەعسی لەناوچووە؟ ئەم دوو تاوان و کۆمەڵکوژییە کە مەبەست لێی جینۆسایدکردنی دوو گەل بووە بە مانای سڕینەوە لەسەر زەوی. جوولەکەنشینی وڵاتی ئەڵمانیا بەتایبەتی کە دەکەونە چوارچێوەی بڕیاری لەناوبردنیان بەدەستی نازییەکانی ئەو کاتی ئەڵمانیا هێندە بێ بەزەییانەو دڵڕەقانە دەگیرێن و کۆدەکرێنەوە و لە نێوبراون، مرۆڤ نازانێ چۆن بتوانێ گوزارشتی لێبکات، ئەو چەند قۆناغەی کە پرۆسەکەی پێ ئەنجامدراوە، هێندە کارەساتاوییە، مرۆڤ سەری دەسوڕمێ، گرتن کۆکردنەوە و کۆمەڵکوژ بە شێوەی سوتاندیان لە کورەی زۆر پلە گەرمدا ئەم پرۆسەیە لە دوو جێگای سەرەکی پۆڵۆنیا و ئەڵمانیا ئەنجامدراون؟ شاری داخاوی ئەڵمانیا ئەم شارە دەکەوێتە نزیک شاری مونشین، کە لەم شارە لە شوێنێکی بەرفراوان لە گۆڕەپان و هۆڵی گەورە پێکهاتووە، پێش چوونە ژوورەوە، گەرچی گەورە و بەرفراونی بۆ دابینکراوە پارکینگی ئوتۆمبێل بە برە پارەیەکە، کە دەچیتە ژوورەوە، پارکێکی خۆش و چەندین کۆشکی کتێب و بڵاوکراوە و ریکلام و شوێن دەبینی، جگە لە جادە و شۆستە و شوێنی پشوودان و دانیشتن، رۆژانە ئەم جێگایە بە رۆژی شەممەیشەوە بە رووی گەشتیاردا کراوەیە و جمەی دێت لە خەڵک لە هەموو دونیاوە بۆی دێن، خەڵک بە پرۆشەوەیە زوو بگاتە ژوورەوە، تا بە چاوی خۆی رووداوی جینۆسایدکراوی جوولەکە ببینن و وێنەی رووداوەکانی ئەم

پرۆسەیەکی بێ ڕەحمانە و پڕ لە شەرمەزارییەی نازییەکانی ئەڵمانیا بگرن و ببینن بە چاوی خۆیان چ کۆمەڵکوژییەک لێرە ڕوویداوە و چۆن مرۆڤی بێتاوان ژیانییان لێ سەندراوەتەوە بەبێ یاسا و بەبێ دادگاو بەبێ لێپرسینەوە و زۆر دڕندانە کۆمەڵکوژکراون؟ ئەم شوێنە دەکرێ بڵێی هەم وەک مینیۆمێنتە، هەم دەکرێ بڵێی شوێنی بەڵگەداری لەناوبردنی بەکۆمەڵی دەیان و سەدان هەزار مرۆڤی جووەکانی دانیشتووی ئەڵمانیا بووە، لە هۆڵی یەکەمەوە دەچیتە ژوور یەک سەر بچورکێک بە لەشدا دادێت، بەتایبەت بۆ کەسانێک کە خودی خۆی و گەلەکەی ئەنفال و جینۆساید کرابێت، یان بۆ منێک و کەسانی تری بەرکەوتەی نێو ڕووداوی سەختی ئەنفال بووبێتین و بە ئاستەمێکی قورس ڕزگاری بووبێتین؟ هۆڵەکان درێژو پان بەرین، هەر هۆڵێک بەتەواوی دیوارەکانیدا هەر یەک و دەیان وێنە و نووسین و چیرۆکی ئەو سات و سەردەمەت بۆ دەگێڕێتەوە، هەمووی زۆریان بەرواریان لە سەرە، وێنەکان تەواو کارەساتاوین، هەر تەماشای نێوچاوانی هەر یەک لە وێنەی قوربانییەکان دەکەیت، دەیان چیرۆکی تێدا دەخوێنیتەوە، وێنەی تێدایە، ئەوەی لێ دەخوێنیتەوە، ها چەند چرکە ساتێکی تر ژیانم بە شێوەیەکی دڕندانە لێدەسێنرێتەوە، سەدان وێنەی ماڵئاوایی مەرگی سەخت لە چاویاندا بەدیدەکرێ، نووسینەکان دەیان و سەدان بەڵگە لە نێو ئەم هۆڵانە دانراون، هەر یەکەیان ئاماژەن بۆ کەرەستەی لەنێوبردنی بەکۆمەڵ؟ ئەی دواتر چیم بینی، هێندە لە هۆڵەکان تەواو بووم، سەدان وێنەم گرت، هاتمە نێو گوڕەپانەکە وامدەزانی لە نێو قەڵای نوگرەسەلمانم، ئەوەی من بینم، ئێ هەمان دەموچاو و ڕوومەتی کەسوکار و خەڵکی گوندەکەم و گوندەکانی گەرمیان و کوردستان نەبوو، ئەوە چاوی چاوەڕوانی کوڕو کچە جوان و نەشمیلەکانی ئێمەیش نەبوو، لە نوگرە سەلمان چاوەڕوانی

قرێشکەی دەستڕێژی گولەو مەرگ بوون؟ ئەریَ من تەنها منداڵانی جوو دەبینم، یان هاواری دادیە دایە و باوکەباوکەی منداڵانی بە ڕێژنەی گولەی چەکی بەعسییەکان دەبینم، یان من لە نێو ئەڵمانیاو شاری داخاوی داخکراوم؟ ئەم هەست و ئیحساسەم گێڕامەوە بۆ نێو دونیا خوێناوییە بیَ کەسییەکەی سەختی ڕۆژانی ئەنفال و قۆناخە سەختەکانی بارانی مەرگی بەکۆمەڵی کوردو جینۆسایدکردنمان؟ هەر لە نێو گوڕەپانەکە هەنگاوت هەڵدەگرت، بگەی بە کورەی ئاگرین و بەشی سوتاندنی مرۆڤ ئەمبەر و ئەوبەری ڕێگاکە بنەمای چەندین هۆڵی تر دانرابوو بکرێنە هۆڵ و خەڵکی بەکۆمەڵی بۆ بهێنن، دیارە فریای ئەوە نەکەوتوون، تەواوی بکەن؟ کورەی ئاگر (محرقة) ئێستایش لای من بۆنی کروزی لیَدیَت، شوێنێک تەنها درندەکان دەتوانن شتی وابکەن، شوێنیک دەیان و سەدان هەزار جەستەی مرۆڤی لیَکراوەتە خۆڵەمیَش، ئەم شوێنە لە چەند بەشێک پێکهاتووە و هەندیَ وێنەی دیکۆمێنتاریشی لەخۆگرتووە، بەشە ترسناکەی ئەمە چییە؟ کە بەشی حەمامەکەیەتی لە دوو سیَ دانە حەمام پێکهاتووە، بۆری بۆ ڕاکێشراوە، وادەزانی ئەمانە بۆری ئاون، بەڵام لە ڕاستیدا بۆری غازن بۆ پرۆسەی خنکاندن بەکاریان هێناوە، هەر یەکێک خراوەتە ئەم حمامانەوە، پێیان وتوون خۆتان بشۆن، دەرگایش کەپس و بیَ کون و کەلەبەر دروستکراوە، ئەو کەسانەی بۆرێکەی بەرداوەتەوە، یەکسەر بە غازەکە خنکاوە، دواتر بە عارەبانە کە هەر چەند مەترێک بە شانیەوە خراوتە نێو کورەی ئاگرەکەوە و سوتێنراوە و کراوە بە خۆڵەمیش، ئەمە چەند دانەیەک لە کورەکانە، بۆ ئەوەی پرۆسەکە خێراتر بکەن، لە دەرەوەی ئەم هۆڵە چەند دانەیەکی تریان دروستکراوە؟ لێرە وێنەیەکم بینی هاوشێوەی ئەنفال، ئەویش وێنەی کەڵەکەبووی جلی قوربانییەکانە، لێرە من ئەو هەموو جلوبەرگەی کەسوکارمان لە

قەڵای قۆرەتوو بینی، کە هەموویان ڕاپێچی مەرگ کران؟ مەرگی ئەمانە و مەرگی گەلێکی بێکەسی وەک کورد کە بێتاوان جینۆسایدکران، هێندە کارەساتاوییە، هەندێجار مرۆڤ سەری دەسڕومێ نازانێ چی بکات و چ بڵێ؟ بۆ منێک خەمەکە، هەر خەمی کوشتن و لەنێوبردن نییە، خەمی گەورە خەمی بێکەسی کوردە، خەمی بێخەمی دەسەڵاتی کوردە، کە چەند بێ باک و بێ ئابڕوون بەرانبەر بە مرۆڤگەلێکی کۆمەڵکوژ کراو و کەسوکاریان و بە سوتماکی خاک و نیشتمان کاولکاری وماڵوێرانی؟ لێرە کەتمە نێو بەراوردکارییەوە کەوتمە نێو قسەکردن لەگەڵ خودی خۆم، ئەم جێگایە گەلێکی لێ جینۆسایدکراوە، ئەی خۆ ئێمەیش جینۆسایدکراوین، ئەو شوێنەمان بۆ نییە، تا ئێمەیش بە جیهانی دەرەوە بڵێین بەم جۆرە وەک هۆلۆکۆست کۆمەڵکوژکراوین؟ باشە دەبێ هۆکار چی بێ و کێ بێ، هۆلۆکۆست دەوڵەتی جوووەکانی لێ وەبەرهات و خوێنی قوربانییەکانیان

وڵاتێکی سەربەخۆی وەک ئیسرائیلی لێ وەبەرهات و جووەکانی دونیا بوونە خاوەن یاسای پاراستن و ڕێزلێگیراو و حساب بۆکردوو و جووەکان لەسەر ئاستی دونیا زەمانیان پێدانراو هۆلۆکۆست بە جینۆساید ناسرا؟ بە ئێستایشەوە قەرەبووی خۆیان لە ئەڵمانیا وەردەگرن و تاکی جوو خاوەی پێگەو ڕێگەی خۆیەتی لە ئەڵمانیا، هیچ یاساو دەستورێک ڕێگەپێدروا نییە بە زەرەیەک دژی بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل و جووەکان بێت، مافپارێزبەندی خۆیان هەیە؟ جووەکان نەیانهێشت یەک دڵۆپی خوێنی جوویەک بە فیڕۆ بچێت؟ هەموویان بە زیادەوە وەرگرتەوە و ئێستایش و داهاتوویان لەسەر هۆلۆکۆست بەندە؟ ئێستایش ئەوەی لە ئەڵمانیا دژی خاوەنی ڕەگەزنامەی ئەڵمانییە لە دژی ئیسرائیل و جووەکان بێت، ئەگەری هەیە جنسییەکەی لێوەربگرنەوە؟ ئا ئەمەیە هۆلۆکۆست کە لە ڕابردوو دەکرانە خۆڵەمێش، بزانە ئەقڵی جوو

چ دروســـــتکرد، چۆن بوونە خاوەن ماف چوون تۆڵەی خۆیان لە بکەران وەرگرتەوە، بزانە چۆن بوونە خاوەن هێزو ئابووریی وڵات و چەکی ئەتۆم و دیســــپۆرایەکی (جالیە) بەهێز لە سەر ئاستی دونیان؟

**ئەی کورد چ بۆ ئەنفال کردووە؟**

قەبارەی هەشــت قۆناغی پرۆســەی ئەنـفـالـی کـورد لـە بـاشـــــووری کـوردســــــتـان دەیـان هـێـنـدەی هۆلۆکۆســـت ســـەختر و ماڵوێرانترە، پرۆســەی شـومی ئەنفال پرۆســەیەک بوو تـا ئێســـتـایشـــی لەگەڵ بێت، بەردەوامی خۆی لە جینۆســــایدی فـیـزیـکـی و روحـی و ســـــەرجەم کـایەکـانی نێو ژیـانی کۆمەڵگەی کوردی و کەســــوکاری قوربانیان بەتـایبەتی هەیە؟ زامی قەدمـاغـە گرتووی قووڵی جەســـتەی ئەم گەلە هێشـــتا نەک هەر ســـارێژ نەبووە، بەڵکو لە دوای راپەرینی ١٩٩١ وە برینەکەی سەخترو کاریگەرتر بووە؟ پرســــیارەکە لێرەیە بۆچی کورد و دەســەڵات و ســیاســییەکانی باشـوور لە ئاســــت ئەم پرۆســـــە و تاوانە گەورەیە، کە تیـایـدا دەیـان هەزار کەس بوونە قوربانی و بەو شـــێوە درنـدانەیە کۆمەڵکوژکران و ئـا بەو شـێوە بێباکییە رۆژیان دا بە دەستی رۆژەوە تا ئەنفال و جینۆســــایدی کورد لە بازنەیەکی بۆشدا بخولێتەوە و نەگاتە ئاســتی چواریەکی قەزیەی هۆلۆکۆســـتی جوولەکە؟ بۆ نەتوانرا ســــوود لە شـــوێنپێی جوولەکە هەڵبگرین بە کنە و پشـــکنیین و بەو هەمـــوو بەڵـــگە زیـــنـــدووانەی بەردەســــــتـمـان و بـۆ دونـیـای بســــەلمێنین کە هۆلۆکۆســـتی کوردانیش هەیە؟ بە جیهـان بڵێین وەک جوولەکە کوردکوشـــتن چیتر جێی قبوڵ نییە؟ بە دونیا بڵێین چیتر خوێنی کورد لە بازارەکانی سیاسەتدا بێ نرخ نییە؟ بۆچی دەســــتبردن بۆ یەک تاکی جوولەکە دونیا دێتە سـەر خەت، چـونـکە خـاوەنـی رووداوی هۆلۆکۆســتە، ئەی بۆ ســەدان کورد بـکـوژرێ نـابـێـتە هـۆکـاری دروستبوونی رای گشتی و کەسیش رانەچەڵەکی و لە هەمانکاتدا خاوەنی

ئەنفال و هەمان پرۆسەی جینۆسایدکردنە؟ ئەوە کام ئەقڵ و ژیری بوو، هۆلۆکۆستی گەیاندە لوتکەی بەرگری بۆ تەواوی هەر یەهودیەک و تەواوی وڵاتی ئیسرائیل و گەیشتن بە ئاستێکی پارێزبەندی و ماف و پاراستنی کەرامەتیان؟ ئەوەی ئەوە کام ئەقڵ بوو، کەرامەتی تاکی کورد و کۆمەڵگەی کوردی و خاک و نیشتمانی کوردیان هێنایە ژێر سفر؟ لە دوای راپەرینی ١٩٩١ وە دەسەڵاتی کوردی و بە ناو سیاسی و حزبەکان بێ جیاوازی لە ئاست ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە و شوێنەکانی تر بە تۆزقاڵێک ئاکاریان نەبووە؟ هێندە بێ باکانە و نەزانانە هێندە بێ ئابڕوویانە تەماشای ئەنفال و قەبارەی قوربانییەکان کردووە، بۆیە دوای ٣٢ ساڵ لە هەموو دونیادا شتێک نییە، هاوشێوەی هۆلۆکۆست هیچ نەبێ خوێنی هەڕاجکراوی کورد رابگرێ؟ لە کاتێکدا داهاتی زۆر لە بەردەست بوو، کەرەستەو دیکۆمێنتی زۆر هەبوو، پەیوەندی لە ئاستی وڵاتان هەبوو، حکومەت و پەرلەمانت هەبوو، شایەتحاڵ لە بەردەست بوون؟ رژێمی بەعس رووخا و ئەمریکا و دونیا هاتە سەرخەت وتیان چیتان دەوێ لە جیاتی داواکاری پارەی زۆر و پلەوپایە و کورسی رزیوو، دەبووا تەنها یەک شتتان داوابکردایە، ئەویش ناساندنی ئەنفال وەک جینۆسایدی جووەکان و هۆلۆکۆست، دەبوا تەنها داواکاریتان حەرامکردنی رشتنی خوێنی کورد بووایە بە دەستی داگیرکەران؟ دەبووا چۆن هۆلۆکۆست ئیسرائیلی دروستکرد، داواکاریتان ئەوە بووایە دەبێ ئەنفال وەک جینۆسایدی گەلی کورد لە ئاستی دونیا بناسرایە و دەوڵەتی کوردیتان لەسەر دروستبکردایە و ساڵانەیش حکومەتی عێراق پابەندی قەرەبووی ماددی و مەعنەوی کوردی بکردایە، تا هەقی دوادڵۆپی قوربانییەکان دارمان و وێراکراوی گوندکانمان وەردەگرتەوە و لە دەستووریش دەنووسرا، کوشتنی

تاکی کورد هێڵی سـووره؟ ئا بەمە بونیادی کۆمەڵگە و حورمەتی تاک و ڕێز بۆ قوربانیان و کەسـوکاریان دەگەڕایەوە؟ بەڵام داخ هەزار جـار داخ، ئەوەی لە یەکەم هەنگاوی دوای ڕاپەڕین ئیشـی سـیاسـییەکان و حزبەکـان دواتریش دەسـەڵات کە کردیان، شکاندنی شکۆی تاکی کورد بوو لە جیاتی پرۆسـەی پەروەدە و زانسـت و پێشـکەوتن لە جیاتی پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان و گرنگی پێدانیان لە ڕووی کشتوکاڵ و ئـاژەڵـدارییەوە لە ڕووی ئـاوەدانـییەوە. هـاتـن تەواوی کۆمەڵگەی کوردیـان بچووککردەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی بەحزبیکراو، دواتر بۆ شـەڕێکی خوێناوی یەکتر و بە حزبیکردنی ئەنفال و حسـابکردنی لە سـەر نفوسـی حزبی و زۆر شـتی ئا ئیتر لێرەوە پرۆسەی شکاندنی تاکی کورد دەسـتی پێکرد، ئـا ئیتر دونیابینیی نەتەوە و خاک و نیشتمان و ئەنفال و شـەهید و ماڵوێرانییەکان لە چـاوێکی بچووکی نەزانـانە و نـائەقڵانـیـانەی نـێو بـارەگـانەوە هەڵـدەسـوڕان؟ بـۆیە لەم دیـدە تـاریـکـیـیەوە چـۆن ئەنـفـال و جینۆسـایدی گەلێک دەگاتە ئاسـتە هەق پێـدراوەکەی؟ ئێمە خۆمـان دەسـتمان خسـتە بیناقاقای یەکتر بۆ خنکـانـدنی ئەوی تر، ئیتر چۆن دەکرێ ئەنفال بگەیەنرێتە لانی کەم نیوەی هۆلۆکۆسـت؟ پرۆسـەی تێکشـکانی تاکی کورد و کۆمەڵگەی کوردی هەر بۆ خۆی درێژەپێدەری پرۆسـەی ئەنفالە؟ هۆلۆکۆسـتی جوولەکە پرۆسـەی لەنێوبردنی جـوولەکە بـوو؟ ئەوە ئەوان بـوو پرسـیارەکە یان هەڵگێڕایەوە و بۆ بونیادنانی تاک و کۆمەڵگەی یەهودی ئەوە ئەوان بوون بە دونیـات وت، ئیتر کوشـتنی یەک جوولەکە هێڵی سـووره؟ چۆن پێتدەکرێ بە دوژمن نەیار و دۆسـتت بڵێی، کوردکوشـتن هێڵی سووره بە ئێستایشەوە ،کورد پێشـی سـوپای دوژمن دەکەوێ، تا ئەوی کوردی پـارچەکی تر لە نێو بەرێ ؟ بۆیە بەم ئەخلاق و ئەقڵێتەوە کورد زۆر هەل و دەرفەتی زێرینی لەدەسـتداوە لە ئێسـتایشـدا هیچ

ئامادەکیەک نییە، ئەخلاقیەن بیر لە ئەنفال و جینۆسایدی گەلەکەمان بکەینەوە و پێداچوونەوەیەک بە ئاکار و ئەقڵیەتدا بکەینەوە؟

بە خۆڵەمێشکردنی جەستەی مرۆڤ بەرهەمەکەی دەوڵەتێکی گەورە و کاریگەری وەک ئیسرائیلی بەرهەمهێنا، لەسەر دەستی نازیزم جووەکان بە کۆمەڵ دەگیران و بە گاز دەخنکێنران و بە کورەی ئاگر دەسوتێنران و جەستەیان دەکرایە خۆڵەمێش، ئەمە تەنها تاوانێکی سەرپێی نەبوو، بەڵکو بە شێوەیەکی بەرنامەسازی بۆداڕێژراو ئەم پرۆسەی جینۆسایدی جووەکان ئەنجامدرا؟ سەدان هەزار جوولەکە لەنێو بران، لە بەرانبەر ئەم تاوانە گەورەیە لە سەرئاستی دونیا جوولەکە دەستەوەستان نەبوون و بەڵکو توانیان سەد هێندەی گەورەیی تاوانە کە بیروڕاو ئامانجی خۆیان یەکخست لەپێناو مانەوە و بەرگریکردن لەو ستەمەی کە دەرهەقیان کراوە، بەڵێ گەر هەوینی خۆ ڕێکخستنەوە و یەکگرتن و دیاریکردنی ئامانج و ستراتیژی نەبووایە، بێگومان وەک ئێستای کورد دەبوون، کە بێ نرخترین خوێن خوێنی کوردە؟ بەڵام بەرهەمی هۆلۆکۆست و بە خۆڵەمێشکردنی جەستەی جوولەکە ئایندەیەکیان لێ بەرهەمهێنا، کە شکۆیان بۆ مرۆڤی جوو گەڕاندەوە و هێڵێکی سووریان بۆ جیهان دیاریکرد، کە ئەویش کوشتنی جوولەکە یان خستە نێو چوارچێوەی هێڵە سوورەوە، ئەگەر چ لە سەردەمی نازیزمدا نرخی خوێنی جوویەک بە قەد جوولەکە یەک نەبوو؟ وەک چۆن لە ئەنفال و لە ئێستایشدا لەسەر ئاستی ناوخۆ و دونیادا خوێنی کورد نرخی یەکسانە بە نرخی خوێنی چۆلەکەیەک؟ ئەوان هێزیان دایە بەرخۆ و دەستیان خستە نێو دەستی یەکتر؟ ئێمەیش هێزمان لە یەکتر سەندەوە و دەستمان خستە نێو بکەرانی پرۆسەی ئەنفال؟ جوولەکە نەیانهێشت یەک تاوانباری هۆلۆکۆست رزگاری ببێ و هەموویان بە سزای خۆیان گەیاند ؟

ئێمەیش نەک هەر بکەرانی ئەنفال بە سـزای خۆیان نەگەیشتن، بەڵکو بە ئێستایشەوە بەشێک لە بکەرانی تاوانی ئەنفالمان پەنادا و کراون بە خاوەن پلەوپایە و مووچەخۆر و حیمایەیشیان بۆ دانرا؟ هۆلۆکۆست دەوڵەت و مرۆڤ و کەرامەتی گێڕایەوە بۆ تاک و کۆمەڵگەی جوولەکە ؟ ئەنفال و جینۆسایدی کوردیش نە دەوڵەتی دروستکرد، نە هەقی خاوەن ماف و قوربانی گێڕایەوە، نە توانیمان تاکی کورد بکەینە خاوەن کەرامەتی خۆی، لە سەرووی هەموو ئەمانەوە ئەم دەسەڵاتە خێڵگەرایەی باشوور کەرامەتی بۆ تاکی کورد و کۆمەڵگەی کوردی نەهێشتۆتەوە، لە پای ئەو هەموو قوربانییە لە پای ئەو هەموو کاولکارییە هێشتا تاکی کورد کۆمەڵگەی کوردی لە بەردەم تێکشکاندایە؟ ئەم تێکشکاندنە گورزێکە لە سەردەمی ئەنفالیشدا گورزی وا بەر تاک و گەلی کورد نەکەوتووە؟ لە کاتێکدا دەبوو لە شێوەی هۆلۆکۆست ئەنفال بکەینە دەستپێکی ژیانەوەی روحی مرۆڤ وون و خۆنەویستن و رەفتاری لێبووردەیی و بەخۆداچوونەوە لەپێناو بونیادنانی دەوڵەتێکی کوردی و دیموکراسی نموونەی ئیسرائیل کە بە دونیا بڵێین ئێرە کوردستانە، بەزاندنی ئەم خاکە هێڵی سوورە و چیتر خوێنی کورد یەکسان نییە بە خوێنی چۆلەکەیەک؟ بەڵام ئەگەر بە وردی بەراوردی بەرهەمی هۆلۆکۆست و ئەنفالی کورد بکەین، ئەوکات کام دەوڵەتی داگیرکەر سڵ لە کوشتنی کورد دەکات ؟ کام خاک و نیشتمان هێندەی کوردستان دوژمن تەراتێنی تێدا دەکات و بە ئارەزووی خۆیان ژەهری خۆیانی تێدا دەرێژن؟ بۆچی ئەنفال و جینۆسایدی کورد نەیتوانی پەلاماری سەر کوردان بە ئێستایشەوە رابگرێ؟ بە دیوێکی تردا بۆچی کورد خاوەنی هیچ هێڵێکی سوور نییە تا پەلاماری نەدرێ؟

بە دیوێکی تردا بۆچی جوولەکە لە دوای دووەم شەڕی جیهانی بە چەند ساڵێکی کەم لە دوای

جینۆسایدکردنیان توانیان ببنە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆیی خۆیان و نەیانهێشت خوێنی قوربانییەکانیان بەفیڕۆبچێت، ئەی کورد بۆچی دوای زیاتر لە ٣٣ ساڵ حکومڕانی خۆی نەیتوانی یەک هەنگاو بەرەو پێشکەوتن و دەوڵەتبوون بچێتە پێشەوە، نەک هەر نەچووینە پێشەوە، بەڵکو دەیان پلە لە سەر ئاستی هۆشیاری و نەتەوەیی و نیشتیمانیش پاشەکشەمان کردوە؟ لە کاتێکدا بە رووخاندنی رژێمی بەعس گەورەترین هەل و دەرفەتمان بۆ رەخسا؟ بۆچی خوێنی قوربانییەکانی ئەنفال و هەڵەبجە لە ئاستی ناوخۆدا نەبوونە هۆی لەخۆ بووردەیی و گیانی تەبایی و روحی بونیاتی نیشتمانێکی ئازاد و بەکەرامەت بۆ تاکەکانی و لەم دیدگایەوە سەروەرییەکانمان و قوربانییەکانمان بکردایەتە سەر مەشقی تێگەیشتن لە دەستپاکی ئیداری و پێشکەوتن و ئاوەدانی گوندە وێرانکراوەکانمان و ئابوورییەکی گەشەکردووی پشتبەستوو بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و سروشت و کوردستانێکی سەوز و ژینگەیەکی پاک و مرۆڤدۆست و دوور لە توندوتیژی و یەکترکوشتن و خیانەت و تا بە ژنکوشتن رواڕووتکردن دەگات؟ بۆچی لانی کەم خوێنی قوربانییەکانی کورد بەگشتی ئەنفال و هەڵەبجە نەبوونە هەوێنی سەرەری یاساو دروستبوونی دەستورێکی نیشتمانی، کە خەڵک بئارامی بە کەرامەتەوە لە سایەدا بژێت؟ بۆچی خوێنی قوربانییەکانمان لانی کەم نەبووین بە دەوڵەت، هیچ نەبا دەرگای ئەرزو ئاسمان والآ نەکرایە بۆ دوژمن و داگیرکەران، نەبووین بە دەوڵەت بە ئێستایشەوە ئەنفالی زمان و کلتور و کەڵچەڕی کورد بەردەوامە؟ نەبووین بە دەوڵەت بەعەرەبکردن و سەرو مێزەری پیاون و ژنانمان لە بەردەم سڕینەوەدایە و بە ناوی تاجی زێڕینەوە مۆدی ئیخوانی دەخرێتە سەر کچان و ژنانمان؟ ناوە جوانەکانی کوردەواری حەرام و



ناشـرین دەکرێن و ناوی عەرەبی بۆ منداڵەکانی کورد پیرۆزدەکرێن؟ کێ دەڵێ من کوردپەروەرم و گریـانی نەیەت بۆ ئێســتای حاڵی کورد؟ خۆ جوولەکە و ئیســـرائیـل دەبیـنن هەمووی بەرهەمی قوربـانییەکـانی هۆلۆکۆستە.

# بەهاکانی یادکردنەوە لە تاوانی ئەنفالدا
## مەلاڕەحیمی مەلاڕەشید وەک نموونە

سمکۆ سابیر



دوای تاوانی ئەنفال، مرۆڤگەلێک زۆر بە بایەخ و مۆراڵیانە هەوڵیانداوە وەک خۆی لە ئەنفـال و ڕەهەنـدەکـانی تێبگەن و ئەنفـال وەک خەم، ئەنفال وەک مـێـژوو و بەرەنـگـاری و خۆراگری، ئەنفـال وەک ژیـانەوە لە خود و ناخی خۆیاندا بەرجەسـتـەی بکەن و یادی بکەنەوە. خۆشـبەختانە کەسانێک هەن، ئەگەرچی ژمارەشیان کەمبێـت، زۆر بەقووڵی لە ئەنفـال تێدەگەن، بێ ئەوەی شـتێک لە بارەی میـدیا و شـەپۆلی بێشـومـاری جیهانگیریی میدیا تێبگەن و کاریان بەوەبێـت، کە ئێسـتـا لە جیهـان ئامرازەکانی میدیا بە کوێ گەیشتوون و ئەم گەشـەکردنە ناسـروشـتییە لە کوێدایە و ئاسـتی پێشـکەوتنەکانی تاچەند مایەی سـەرنج و تێڕوانینی مـرۆڤە و چ هەژمـوونـێـکـی دروستکردووە و لەئاییندەدا دروستی دەکات؟

لایەنی ڕۆحی و ئەو تێگەیشتنە زۆر گـرنـگە لە مـرۆڤ لە ڕێـگەیەوە هەوڵدەدات لە ئاماژەکانی پشـت ئەنفال تێبگات و کەشـفیان بکات.لە ڕێگەی ئەنفـالەوە خۆی و گەلەکەی دەناسـێت و ئەو کەمتەرخەمیانەش ئاشکرادەکات و لەوێوە تێدەگات، کە ئـێـمەی کـورد چـۆن لە ئەنـفـال تێگەیشـتـووین ولە بنەڕەتدا دەبێت چۆن لە ئەنفال تێبگەین؟

سـالانێکە لە نزیکەوە هەندێ لەو مرۆڤانە دەناسـم، کە دەروێشـانە مـاتەمینییەک بۆ ئەنفـال دەکەن و وەک عاشـورا لە یادەکە دەڕوانن و شینی خۆیانی بۆ دەکەن و بەقووڵی دەگرین و بە قووڵی یادی کەسوکار و ئازیزە ئەنفالکراوەکانیان دەکەنەوە و دەگەڕێنەوە نێو لاپەڕە سـادەکانی یادەوەری و ئەو چرکە سـاتانەی کە هێشـتـا لەشـکـری عۆجە دەسـتـی ڕەشـی پێنەگەیـانـدبوون و لە ئـاواییەکی پڕ لە ژیـان و یـادەوەری هەڵێنەکەندبوون. هێشـتـا دەنگی ئەو سـروشـتـە جوانترین و خۆشـترین سـەمفۆنیای دەژەند و ژیانی ئەم ناوچانە هەموو شتێکی بەسادەیی و بەئاسایی بەڕێدەچوو...

یەکێـک لەو کـارەکتەرە گرنـگ و سـیـمـبـۆڵـیـانە، مەلاڕەحـیـمـی مەلاڕەشیدی سەرقەڵا بوو، کە هەتا مرد، بە جوانی ژیـا و بۆ دوای خۆیشـی کۆمەڵێک لە وانەی گرنگی بۆ بەجێهێشـتووین. مەلاڕەحیم پێشـمەرگەیەکی دێرین و دانەبڕاوی ئەم میللەتە بوو، مامۆستای شۆڕش

و پـارتـیـزانـێـکـی ســـەردەمـی ســـەختییەکـانی ئەنفـال بوو، هەتـا راپەڕینی بەهــاری ١٩٩١ بەرامبەر رژێمی بەعس وەســـتــا و وەکو هەنـدێک لە هـاوڕێکانی نەهـاتنەوە ژێر دەســـەڵاتی رژێمی بەعس. ئەم پیـاوە ســـالانێکە چەنـدین نەریتی ئیسـاندۆسـتی داهێناوە لە یادەکانی ئەنفال و هەمیشـــە پێوەی پابەندە و دەیەوێ قووڵ لە ئەذفال بڕوانێت و نەهێڵێت، ئەم تـاوانە گەورەیە بەبێ وانە و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی ئەخلاقی و ئینســـــانی و ویژدانی تێبپەڕێـت،چونکە هەســـتـدەکـات، کەســـوکـارەکە ئەنفـالکراوەکەی ئاگایان لێیەتی و چاویان لەســـەر مەلایە، کە چۆن ئەو رۆژە لە ٤/١٤ی هەموو ساڵێک یادیان دەکاتەوە و لە دڵەوە بۆیـان دەگری و لە نـاخەوە سـوێی دووری ئەوان دەیسـوتێنێت. وەک خۆی وتەنی: شێوە و ڕوخسار و دەنگ و ڕەنگی ئەوان بۆ هەمیشە لە ڕۆحیدایە و هەســـتیان پێدەکات. خۆشـــبەختانە من زیاتر لە بیســـت ساڵە ئەم پیاوە دەیناسم و هەمیشە خاوەن کەسـێتییەکی جوان و سـادە و ســـاکار و لە هەمووشـــی گرنگتر هەتـا لە ژیـانـدابوو، شـــــانازی بە جوتیـــارییەکەی خۆیەوە دەکرد لە زەوییەک بەناوی (خەرمان سـوتیاو) لە ناحیەی ســـەرقەڵا، هەمیشـــە لە خەمی وڵاتێکی ئاوەدان و پڕ بەرهەم و پڕ بەپیت و یەکســـــان بوو، کە دەیـبـیـنـی، مەتـرێـک شـــەقـام درووســـتکراوە، بـاڵای دەکرد و دەیوت: شـــوکر نیشـــتمـانەکەم ئاوەداندەبێتەوە و ئاسـەواری ئەنفال دەســـڕێتەوە. بەڵام بەداخەوە ئەم پیـاوە خەفەت داخی کرد و جەرگی پارەپارە کرد و بەداخێکی گەورە و سەختەوە سەری نایەوە.

یـادکردنەوەی ئەنفـال لە دیدی ئەم پـارتـیـزانەدا، وەک عـیـبـادەت و جێبەجێکردنی ئەو فەرزانەی لە ڕووی ئیمانداریەوە لە سـەر مرۆڤ پێویســتن و دەبێ جێبەجێیان بکات، ئەویش هەوڵیدەدا لە ســـاڵیادەکانی ئەنـفـال، ئەم یـادکـردنەوە وەک عیبـادەت ســـەیربکـات و بەتەنیـا جێبەجێیبکـات، بەتەنیـا هەموو بەیانیانێک دوای مەلا بانگدان بەتەنیا لە کەلارەوە بەرەو گۆڕســـتـانی ئەنـفـالـکـراوان لە دێـبـنە بەپـێ دەڕۆیشت، کە نزیکەی ١٥ کیلۆمەتر دەبوو، دوای گەیشـــتنی بە دێبنە، فاتیحـایەکی بۆ ڕۆحی ئەنفالکراوان



دەخوێنند و بە چوار دەوری گۆڕستانەکە وەک تەوافکردنێک ئینجا بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە و ئەو ڕۆژەش بەڕۆژوو دەبوو، بەڵام پارشێوی نەدەکرد،هاوکات ئەو ڕۆژەش نوێژی نەدەکرد و دەیوت: ئەوانەی ئەنفالکران، ئەو ڕۆژە هیچیان نەخوارد و کەسیشیان نوێژیان نەدەکرد، بۆیە منیش وەک ئەوان دەبم. لە دیدارێکی چەند هەفتەیی من لەگەڵ خوالێخۆشبوو مەلا ڕەحیمی مەلا ڕەشید،کە دواجار کتێبێکی لێبەرهەما هات و بەچاپ گەیشت، لە پرسیارێکدا دەپرسم هۆکاری چییە کە تۆ بەم شێوەیە یادی ئەنفال دەکەیتەوە، لە کاتێکدا لەوانەیە هیچ کەسێک ئەم فۆرمەی ئێوەی لە یادکردنەوەی ئەنفالدا پەیڕەو نەکردبێت. بێگومان ئەویش چەند پاساوێکی خۆی هەبوو، من لێرەدا هەندێ لەو نەریتانە دابنێم : خۆی دەفەرموویت:

من ئەمەوێت گشت ساڵێ بە جیاوازی یادی ئەنفال بکەمەوە و ئەم فەرزانە جێبەجێدەکەم لە ڕۆژی ١٤/٤دا :

- هەڵکردنی ئاڵای ڕەش لەسەر ماڵەکەمان
- پۆشینی جلوبەرگی ڕەش سەراپا (پانتۆڵ و چاکەت)
- قەدەغەبوونی لەبەر کردنی جلوبەرگی کوردەواری
- نە خواردنی هیچ خواردن و خواردنەوەیەک تاوەکو خۆرئاوا (چونکە ئەنفالکراوان هیچیان نەخوارد)
- نەکردنی نوێژ ئەگەرچی ئیماندارێکی پابەندم (چونکە ئەنفالکراوان نەیانتوانی ئەو ڕۆژە نوێژبکەن)




- نەشۆردنی دەم و چاو و دەست و لاشە (چونکە ئەوان پێیان نەکرا)
- نەتاشینی ڕیش (چونکە ئەوان ئەو ڕۆژە نەیانکرد)
- پۆشینی هەمان ئەو جلوبەرگە کە چەند ساڵانێکە هەر هەمان جلوبەرگە.
- کەوتنەڕێ لەکەلارەوە تاوەکو مەزاری شەهیدان لەبەرانبەر (سمود) ناحیەی ڕزگاری ئێستا بە پێ.
- تەواوکردنی سەرجەم گۆڕەکان لەگەڵ سڵاوکردن لێیان.
- بەر لە سوڕانەوەکە کڕنووشبردن لە بەرانبەر گۆڕەکان بەشێوەی نوێژ
- بەشدارینەکردنی هەر ڕێورەسمێک کە دەکرێ (خۆم دەزانم بۆچی)
- جگە لە ڕۆژی ٤/١٤ لە ڕۆژەکانی تردا ئەم بەرنامانە بەردەوامن :
- نەخواردنی خەیار و ترۆزی (بەهۆی چاوپێکەوتنی خوشکە نەبات)
- نەخواردنی تەماتە (بەهۆی چاوپێکەوتنەکەی کەسێک لە گوندی حەسیرە لە گەرمیان)
- هەوڵدان بۆ نەخواردنی نان (بەهۆی گێڕانەوەکەی کاکە برایم لەگوندی وەلی هەیەر)
- نەپۆشینی جلوبەرگی شاڵ، چونکە ڕەمزو هێمای موستەشارەکانە.
- دانانی خاک و خۆڵی ناو دوا گۆڕی بەکۆمەڵی نێوان سەماوە و نوگرە سەلمان بەشێوەیەکی هەمیشەیی لە ژورەکەمدا..

لە پرسیارێکی تریش دەپرسم ئەنفال چی لێسەندیتەوە؟ ئەویش ڕاشکاوانە دەڵێت:

- دەتوانم بڵێم"دوا ئەنفال یەکێکە لە چەندین جار ئەنفالکردنی نەتەوەکەم

- ئەنفال هەست و کەرامەتی نەتەوەکەمی برد.
- ئەنفال سوکایەتی بە خاک وخەڵک و سروشت و سەرجەم گیانلەبەرانی وڵاتەکەم کرد.
- ئەنفال نەعرەتەی بیابانشینەکانی تازەکردەوە کە کوشتن و داگیرکاری خاک و ناموس حەلاڵی ئەوانە.
- ئەنفال ناسنامەی نەتەوەی ئەنفالکاری تازەکردەوە بۆ وەچەی ئەمڕۆکە، کە ئەوان هەمان نەتەوەن، کە پێشتر هەرچییان کردووە بۆیان چووەتە سەر و زۆریش بەڕەوایان زانیوە.
- ئەنفال برینێکی کردە ڕۆحی گشت شەهیدە زیندووەکانی نەتەوەکەم، کە هەتا هەتایە سارێژنابێت.
- ئەنفال بابەتی زیاتری تێدایە، کە ناتوانم بیدرکێنم (خۆزگە ڕۆژێک بەر لە مردنم بیدرکێنم)
- ئەنفال جگە لە شەهیدکردنیان تەنانەت نەزانین و نەناسینی گۆڕ و تەرمەکانی پێمان ڕەوانەبینی و لێیبێبەشبووین هەر بەو ئاواتە سەردەنێینەوە .

سەرباری جێبەجێکردنی ئەم نەریتانە، مەلارەحیم دوای ئەوەی لەدوای ساڵی ٢٠٢٠ دەڕوات بۆ نوگرەسەلمان، چەند مشتێک لەو لمەی بیانان دەهێنێتەوە و لە ماڵەکەی خۆی دەیپارێزێت و وەسیەت دەکات، کە خۆڵەکە بپرژێننە سەر گۆڕەکەی و هەروەها لە کاتی شوشتن و ناشتنی تەرمەکەی، تاقانەکان و کەسوکاری ئەنفال ئەم ئەرکە ببینن. بۆ زانیاریتان لە دوای مردنی هاوسەرەکەی شوێنێکی بۆ خۆی دەستنیشانکردبوو لە تەنیشت گۆڕی هاوسەرەکەی و هەر لەوێش بە خاک سپێردرا.

مەلاڕەحیمی مەلاڕەشید هەمیشە حەزی دەکرد، بڵێت: من کەسێم حەزدەکەم، ببم بە نەزر بۆ ئەنفال. زۆر هەڵوەستەم کرد، بۆ ئەوەی لەوە تێبگەم، کە کۆچی دوایی ئەو پارتیزانەی دوای ئەنفال، ئەم مامۆستا خۆبەخشەی شۆڕش تا چەند لە یادەوەریی ئەو کۆمەڵگەیەی کە مەلاڕەحیمی سەرقەلا قوربانی بۆداوە، لەدوای مەرگی،لە یاد و زهنیەتیدا زیندووە؟ یان فەرامۆشکراوە؟.. چونکە مرۆڤە سیمبۆلییەکان هەمیشە شایانی یاد و یادەوەریی ئێمەن و




دەبێت هەمیشە یادیان بکرێتەوە و نەریتەکانیان لە خۆمان بەرجەستەبکەین. ئای لەو عەشقەی مەلاڕەحیم بۆ ئەم خاک و ئاو و گەلەکەی لە خۆیدا بەرجەستەی کردبوو، وەلێ بیباکی ئەم کۆمەڵگە و سیستمە سیاسیەکەی هەمیشە بۆ مرۆڤە مەزنەکان ئاوا بووە و پێشدەچێت، هەر ئاوا بڕواتە سەر و بەردەوام بێت..! مەلاڕەحیمی مەلاڕەشیدی سەرقەڵا، ئەو مرۆڤەی هەموو شتێکی؛ بیرکردنەوە،ڕەفتار، ئاییناسی،کوردایەتی،مێژوو،ئەنفالناسی جیاوازبوو. ئەو دەیان ساڵە بە عەشقەوە کوردبوو، بۆیە هەر بەعەشقەوە خەباتی کرد و خۆی وتەنی؛ هەمیشە خەونی ئەوەبووە، لەپێناو ئەم خاکە سوتماکەدا شەهید ببێت و مەدالیایەکی تر ببەخشێتە گەردنی خانەوادە و گەلەکەی. بەڵام خۆشبەختانە ژیا بۆ ئەوەی دوای ئەنفالیش،سەرباری هەڵگرتنی خەمێکی قورس،بەڵام ئەو کۆڵی نەدا و بوو بە شایەتحاڵی گێڕانەوە و ڕاستکردنەوەی مێژوو. بەداخەوە هەرچەندە لە هزر و مێشکیدا زۆر خەون هەبوون، بەڵام بۆ ئەو بەدینەهات. زۆر شت هەیە لەسەر گەورەیی ئەم پیاوە مەزنە باسبکرێت، بەڵآم من هەوڵمداوە لە کتێبێکدا چەند خاڵێک لەگەورەیی بخەمە ڕوو. ڕۆحت



شـــاد پیاوە جوان و بێگەردەکەی نیشـــتمان. ئای کە بیرت دەکەم هاوڕێ.. بەڵام ئەوەی دڵخۆشـــم لە دوای تۆ،کەســـوکـار و برا و منداڵەکانت، لە زۆر شـــتدا لە تۆ دەچن. چونکە تۆ مامۆستای ئەوان بوویت و دەرسی جوانی و پاکی و ڕەوشتت فێرکردوون..

- بەداخەوە ئەم مـرۆڤە جـوانە لە ڕۆژی ٢٥ی مـانگی ئەیلولی ٢٠٢٢ بەنەخۆشی کۆچی دواییکرد.

## گفتوگۆیەك لەگەڵ دەبازبوویەكی دۆزەخی (نوگرەسەلمان)

## ئامینە قولیجانی: لە نوگرە سەلمان، دۆزەخمان بە چاوی خۆمان دی كچێكم ناوی كوردستانە، هەرچی كاتێك لە نوگرەسەلمان ناویان دەخوێندەوە، لێیان دەدا و دەیانگوت باوكی پێشمەرگەیە بۆیە ناوی ناوە كوردستان.







چاوپێكەوتن/ دلێر كەریم

لە سی و شەشەمین ساڵیادی تاوانی ئەنفالدا، لە ماڵەکەی خۆی لە ناحیەی رزگاری چاومان کەوت بە دەربازبوویەکی زیندانی (نوگرەسەلمان) لە تاوانی ئەنفال، بەناوی (ئامینە عەلی رۆستەم) خێزانی مام قادر محەمەد غالیب، دانیشتووی گوندی قولیجانی ئەمین قارەمان.

پ/ سڵاو میم ئامین، زەحمەت نەبێت ناوی سیانیت؟ و لە کام گوندەوە ئەنفالکران؟

میم ئامین/ ناوم (ئامین عەلی رۆستەم)ە، من شووم کردبووە گوندی (قولیجان)، مەبەستم قولیجانی (ئەمین قارەمانە)، چونکە قولیجانێکی تر هەیە بەناوی قولیجان (سەرحەد).

پ/ رۆژانی سەرەتا لە گوند بوون، چۆن زانیتان ئەنفال دەکرێن؟

میم ئامین/ سەرەتای ئەنفال ئێمە لە جەوەڵ (شاخ) بووین، هاتن وتیان بەیانی زوو دەرچن، ئەمرۆ کۆپتەر دێت و ئەم ناوە دەبێژێت (تۆپباران) دەکات. هاتین هەر لە ئێوارەوە تا بەیانی رۆژ بووەوە (تا سەعات هەشت)، ئێمە لە مەکینە (تراکتۆر)دا بووین. هاتینە (سەیبەیخان)، بارانێکی توند دەستی پێکردبوو، ئاو وەک دەم کونە دەهاتە خوارەوە. لە (سەیبەیخان) بووین وتیان ڕاکەن، کۆپتەر هات. چووینە مزگەوتەکەوە. شەو بوو ئێمە هاتین، مەکینە لە جەوەڵەوە بێت و باران لەسەر بوارێت گەرێ چۆن بێت؟ کوپتەر هات و چوو.

پ/ لەو کاتەدا دەتانزانی بگیرێن، ئەنفالدەکرێن؟ یان ئەنفال چییە؟

میم ئامین/ نا، سەرەتابوو، بەس پێمانیان دەگوت بچن خۆتان بدەن بە دەستەوە. پێش ئەوەی بگیرێن، خۆتان بدەن بەدەستەوە، هیچتان لێ نایەت. بڕۆنە کەلارەوە. هاتین هەرکەس مەکینەی بوو بە هی خۆی و ئەوەی نەیبوو، هی ئەم و ئەو بوو، لەگەڵ خەڵکی تردا هات. ماڵێک لە رەواتەوە مەکینەیان هەبوو، زاوای ماڵ حاجی کەریم بوون، کەنیش ئەو بووک حاجی کەریم سەی جەژنی بوو. ئەم مەکینە بەبێ سایەق دەست بە دەست گەیشتە قەواڵی، دواتر گەیشتە گوندی قولیجان و سەلام ئامۆزای مێردەکەم بووە سایەقی، ئێمە پێکەوە هاتین. لە رێگە ئەوەی چەکی بوو، فرێی دەدا، بە هەردوو دیوی رێگەکەدا چەک فرێدرا بوو.

گەنج گشتی، هەندێک دەیشاردەوە و زۆریێکیش نەیدەزانی چی لێبکات و فڕێی دەدا. دەیانوت: کورە بۆ چیمانە؟ بۆ بە چەکەوە بڕۆین بۆ لای بەعس؟ هاتین بۆ نزیک گوندی (پیازەجار)، وتیان سیان چوارێکتان بڕۆنە بان جادەکە، بڕۆنە کەلارەوە و کێتان لە شارە شەو بێن، با دەرتان بکات. (نەزیر خێزانی مام حەمید باوەکر) و مام عەزیز لای ئێمە (شوبرام) و حوسێن سالح، وتیان بڕۆنە کەلارەوە، نەزە وتی وەلا منیش دێم یاسین، برام بزانێت لێرەم دەرم دەکات. نەزە (هێشتا منالەکەی تری نەبوو، دوو کچەکەی پێبوو) وای وت جەماعەت بەگیان دانا. عەسرێک درەنگ چووینە (ملەسوورە). لەوێ ڕێ نەبوو، دنیای خوا لەوێ بوو، مەخلووق وەک پلیسرک چۆن دەچێتە کەلۆزەوە، وەهابوو. شوێن نەمابوو. ئەوجا قوولە بوو، دانەیەک دارەکەی شکابوو، من خۆم و خێزانم، سەلام ئەحمەد غالیب تازە (یەک دوو مانگ بوو ژنی خواستبوو)، ماڵ باوکی بوو، خوشکی بوو. یاسین برای بوو، خێزانی هەموویان بوون. لەو قوولەدا بووین. بچووک بوو، تیای دانیشتین، تا ڕۆژ بووەوە، باران لەسەر ئەواری. لەوێ وتیان هەرکەس ئازایە شوێن خۆی بکاتەوە. ئێمە بۆ خۆمان گرتوومانە (ناحەقیشیان نەبوو). من بووم پێوە، هاتم سەیرم کرد، کۆز ساوەیەک ماوە، پری زیفرە. (نەجمەدین) کوڕیان کە کچ مام حەمید مارەبڕی بوو، لەوەج ئاسکەدا درابوو پێی. (ئاسکە کچ مام عەزیز غالیب درابووە مام شکور هاپۆ ئەمین، ئەوانیش مریەم کچ مام حەمید هاپۆ ئەمینیان مارە بڕیبوو بۆ نەجمەدین)، وتی تاتی بێ، ئەو کەنە ئەرمێنم، خۆڵ وشکت بۆ دەردەکەم، بیکە بن کۆزەکە بۆ خۆت و منالەکانت. ئەوەندەمان زانی لە ملەکەی ملەسوورەوە لاندکرۆزەرێکی سپی هات، وتیان ئەرێوەڵا جاش هات، ئێستا ئەمانبەن بۆ لای خۆیان. کاتێکمان زانی (فەتاح بەگ) بوو. هەشت نەفەری لەگەڵدابوو، ئەو خێلانەی چەکی پێ بوو، فرەی ئەدای ناو چەمەکەوە. دایە بان پۆز مەکینەکەدا وتی: بڕۆن چەکەکانم بۆ بهێننەوە. یەکێ وتی مامۆستا یەکێ وتی مامە یەکێ خاڵۆ گشتیان پرسییان چیمان لێدەکەن؟ وتی چیتان لێدەکەین؟ دەتانبەینە

کەلار، خێمەتان بۆ هەڵدەدەین، تا مەجموعەیەکتان بۆ دەکەینەوە. یاڵلا سەرکەون، گشتمانیان بارکرد، لە ملەکە چووینە سەرەوە نەرۆشت، ئاگامان لێ بوو، خابری کرد بۆ جێشەکە، گشتی دابەزاند. زیل هەمووی سەری نا بەسەر یەکەوە و جێب قەیادەیان لەگەڵ بوو، چواردەوریان گرتین. لەوێ خێزان خێزان لە قایمەیەک ناوی دەنووسی و حسابی دەکرد، ئینجا وتی ئێستا سەرکەون، دەتانبەین شوێنتان ئەدەینێ و نایەڵین بفەوتێن. بەخوا ئەمە قسەی ئەو پیاوە بوو، وا ئەو هەمووەی برد و لەناویدا. ئیتر لامان نەدا، تا گەشتینە قۆرەتوو. خۆرئاوایە گەشتینە ئەوێ، زەلام گشتی لەگەڵ ماڵ خۆیدایە. من منالّم گشتی وردە، ئاواز کچم هەشت نۆ سالان بوو، گشتیان ورد بوون (٦ کچ و ١ کوڕ). بینایەکی سێقات هەبوو، ئێمە چووینە قات دوو. وتیان تەنکەرێک هەیە لە خوارەوە ئاوی هاوردوە، کێ ئاوی پێویستە بۆ مندالّ بڕۆن ئاو بێرن. منیش لە ملەسوورەوە مەتارەیەکی پڕ ئاوم هەلگرت بۆ منالەکان. هەلّمگرت و چووم سەیرم کرد، زۆر قەرەباڵەخە، رووم نەهات بڕۆمە پێشەوە، رێگە نەبوو، وادی مام فارس(یادی بەخێر) وتی بۆ وەستاوی؟ وتم ئەی چیبکەم قەرەباڵەخە. وتی: ئەی کوا زەلامت کوا؟ پیاوت کوا؟ وتم: خۆم و منالّەکانم و مێردەکەم نەهاتووە (لە قولیجان دەرچووین، ئەومان لەگەڵ نەهات، منی داوە دەست ماڵ مامە و ئامۆزاکانی و خۆی رانەکەی دەرکرد)، وادی منی خستە سرەکەی خۆی و وتی مەتارەکەت پڕبکە و برۆ سەرەوە، ئیتر نەهاتمە خوارەوە، دوای خۆی سرەی بۆ خۆی گرتەوە. وتیان دوو مەکینە بە سوغرە بۆ خواردن هێنان گیراون، لە کەلارەوە خواردن بۆ ئەم خەڵکە دەهێنن. نان و نیسکەوا دێنن، ئێمە نەچووینە دەوریا، منالّمان تا بەیانی بە برسێتی مانەوە، تا خۆر کەوت و وتیان یاڵلا بێنە خوارەوە، هاتینە خوارەوە تەختاییەک بوو، خەڵک هەمووی رژابووە ئەوناوە، کۆپتەر وێنەی دەگرت. منال زیرەی دەهات، ژن هەبوو منالّی دەبوو، خەڵک لە خێزان گووم بووایە، هاواری دەکرد، دەنگی گریان و هاوار دنیای نابووە یەک. تا دەور نزیک سەعات یەک، وتیان سەرکەون. سەرکەوتین (عوسمان

هاپۆ نەجم) مان لەگەڵ بوو، هاتین گەیمانە لای خانەقین ئەو شارەزابوو، وتی ئەمە پردەکەی خانەقینە بۆ قوومەکەمان دەبەن؟ (شـــکور هاپۆ ئەمین) لە منالەکانی براببووبوو، خەریکبوو شـــێت ئەبوو، کردیە هەرایەک نەبێتەوە. کەنشکێک وەبان قاپی زیلەکەوە بوو، فەردەیەک ئاردی وەبان پشـــتیدا پلدا. ئەوەندە پەلەی بوو. کۆپتەرەکان وەرەقەیەکیان کردە خوارەوە و زیلەکان گەڕانەوە بۆ قۆرەتوو. شـــکور تورەبوو لێیان وتبووی، کوا منالەکانم؟ ئەوەندەیان لێدابوو، سەر و بەچکیان شـــکێنرابوو، ئەویش و هیدایەت ئەمین ژاڵەش، وەلا سەریان ئاوسابوو، ئەو شەوەش لە قۆرەتوو بەو شێوەماینەوە.

پ/ نەتان پرســـی ئەمە چییە بۆچی براین و گەڕێنراینەوە؟

میم ئامین/ نەخێر، بەس ئەکاتەی لە ڕێگەوە ڕۆشتین، وا لە ملەسوورەوە هاتین، مەکینەکان لە ژێر ســـێپەی بیانەکەدا بوون، هەموویان لووتیان کردبووە ژێر زیادەی بیناکەوە، عەســـکەرەکان هەرچیت وەلاوە بووایە، نەیاندەهێلا لەگەڵ خۆتدا بیوەیتە بان. خۆ من پڕ ناو مەکینەکە ئەشـــیام هێنابوو بۆ منالەکان. وتی نابێت هیچ بووەن، تەنانەت جانتایەک زنجیریشم دابوو بە دەستمەوە بوو، وتم بەس ئەمە دەبەم نەیانهێلا. وتی یالا ڕوح. بەیانی وتی دووبارە زیلیان هێنا و بارمانیان کرد. ناســـکە و شـــەوکەت هەموومان پێکەوە بووین. ناسکە هەناسەبڕکێی بوو، دووگیان بوو، هەناســـەی دەرنەدەچوو، وتی دەرگای زیلەکە بکەنەوە، ئەوان چادرەکەیان دادەخست. ئەمجارەیان لای جەلەولاوە بردمانیان بۆ سلێمان بەگ. ماوەیەک لە قۆرەتوو دوورکەوتینەوە، قافڵەکە وەستا. دوو زیل سەموونیان هاورد بۆمان، هەر زیلێک باوەشێک ســـەموونیان هەڵدەداوە ناویەوە. دوو شەو و دوو ڕۆژە منال هیچی نەخواردووە و برســـییەتی. لەو شـــوێنەدا خەڵک بەتایبەت زەلامەکان دەیانتوانی رابکەن، هەســـتمان کرد بۆ ئەوەیە خەڵک رابکەن، بە ئاشکرا نەیاندەوێرا بڵێن راکەن. چونکە بەدرێژایی قافڵەکە خەڵک دەهات و دەچوو قاریان نەدەهات. مەتارەکەم بەتاڵ بوو، منالیش وتی تینوومە، کەریم مەجید کەرەم (یادی بەخێر) وتی ئامین مەتارەکە بەتاڵە بمدەرێ،

ئەڕۆم لەو هەوراوە پڕی دەکەم، باران ئەوەندە باریبوو، دەشـــتودەر ئاو بوو. ئاوم داوە منالەکان و قافلە کەوتەڕێ و بۆ ئێوارە گەیشـــتینە تۆپزاوا. هـــەورێکی نزم و چڕە، تـاریکـە، دابـەزیمـان منـالم وردن، عوســـمـان هاپۆ نەجم لە داگرتنی منالەکانم یارمەتیمی دا. زەلامەکان گوندی بنەکەم دی بە خێرایی حساب دەکران، عەســـکەرەکە دەیووت (یاللا بالســـرعە). بە چاوی خۆم کاکەم عەبدلکەریمم دی چاکی کەواکەی کردبووە دارا، ســـەلام ئەحمەد غالیب هـاجـەی جـیـاوەکـرد وەک نـاو حەوشەکە وتی هاجە حەمە بکە منال خۆت و کراسـێک لە دایکت بسـێنە و کراسەکەی بەرتیش بگۆڕە، تا ئەوەی پێ وت، عەســـکەرەکان تێر جنێویان بە هاجەر دا. هەرچەند دەیوت (کەلب ئبنـل کـەلـب)، هـەر ئـەوەبوو ئیتر زەلاممان نەدی.

لە حەوشەکە ماینەوە، هەور بروسکە دەدات، نالەی دێت، قیژە و هاوارێکە لە قۆرەتوو خراپتر. عوســـمان وتی: وەلای ئـیـتـر کـەس مـنـال خـۆی نابینێتەوە و ئەمە ئاخیرمانە و تەواو. ئیتر نـازانین زەلامیان بۆ کوێ برد، چونکە لە یەک براین. دوای پیاوەکان بە ســـەماعە هاواریان کرد، وتیان بۆ قاعەکان، بارانەکە زۆرە ئێســـتا ئاو هەڵدەســـتێت. فەردەیەک هەشـــتا کیلۆی کـەلوپـەلی تـازەم هـاوردووە، بـە هـەرچی حـالێک بوو دەرم کرد، هاوەدەســـتمەوە، ســـێوە کۆرپەیە، چیمـــەن و کوردە یـەکی چمکێـک کراســـەکەیان گرتووم، هەر لێت بڕ بوون، ئیتر نـایـدۆزیتـەوە. خـاوەن مەکینەکە ناســـکەی ناو بوو، لـە تـەمـەندا گـەورە بوو، مـەوالیدەکـەی منال بوو. وتم خالۆژن ســـەولە یان تۆ یان میم ناسکە، با بڕۆین شوێنێک بدۆزینەوە و یەکێکتان لای خێزانەکە بن، تا ئێمە دێینەوە. من و ناســـکە ڕۆشـــتین بزان قـاعـە کوێ چۆلـە؟ کاتێک چووین فەرید خێزان عەدنان خۆی و ژنەکەی کەریم هان لەوێ و نـەهـەی هـاپر نـەجمـە. هـا بوومـە قوربانت، ها لە کوێوە هاتوویتە؟ وتم کورە منالەکانم جێهێلاوە بۆ شـــوێن دەگەڕێم، تا هاتینەوە ســـەیردەکەم، ئـەوان چوونـە و منـالـەکـانمیـان جێـهـێـلاوە، وتـویـانـە درەنگـە و چاوەڕێی ئەوان ناکەین. منالەکانم برد و ئەو شـەوە لەگەڵ هاوڕێکانمدا مامەوە. بەیانی هاتم، هەر بە ڕزدا وتم قابیل نەیاندۆزمەوە، سەیرم کرد

جێش شــــەعبییــەک بــەتــەمــەن جنێودەدات وەک گەڵای دار، بە پیاو و ســیاســییەکان، کورد بمردایە وای لێ نەهاتایە، کورە حەیا نەماوە، وتم خێرە مامە؟ وتی ژنێک تەنگاو بووە و شــوێنی دەســت نەکەوتووە و بە بــەرچــاومــەوە میزی کردووە، وتم مامەگیان تۆ ئاگات لە خەڵک نییە، دوو شـــەو و دوو رۆژە ئێمە لە ئینزاردراین و مەجالی هیچ شوێنێکمان نییە. وتی بۆ کوێ دەچیت؟ وتم بۆ شــوێن ئەو منداڵانەم وا بڕبوونە لێم. هـان لای دادایـان، وتی نـابێت، وتم بمکوژی بمبڕی دەڕۆم و شیر منداڵ کۆرپەم لای دادایانە. فەریدم لەگەڵ بوو، وتم بـەس خۆت دەهێڵم بڕۆی و هـاورێکـەت نـا. وتم بـەخوا دێت، ڕۆیم ئەو دوای منالم هاورد و کاتێک ســـەیرم کرد لە قاعەیەک گەورەدا دانیشتوون، لای دەرگاکە بووە بەش من، ئـەو شـــەوە لـەوێ مـاینـەوە. ئیســـپـەنجێک لـە ژێرمـان بوو، کـە هـەڵمداوە و ســـەیری ژێریم کرد، ئـەلبوومـە، رەســـمـە، مێخـەکبـەنـە، جلوبەرگە، لە حەیبەتا خستمەوە ژێر دۆشـــەکـەکـە، بـەیـانی خۆرکـەوت هەندێک خەیار و سەموون و هێلکەی کولاوی خســـتـەنـاو خـەڵکـەکـە و نەیهێشـــت خەڵک بیخوات، دەرمانی کردە دەشـــتەوە. پاشـــان پیرەژنی جیاکردەوە لە گەنجەکان. یەک یەک بۆ لایەک، سەوڵە جیاوەکرا و ناسکە لـەگـەڵ ئێمـەدا مـاوە. ئێمـەی کردە ژوورەوە و پیرەژنەکانی لە دەرەوە جیاوەکرد، گەنجـەکان لـە ژوورەوە بووین، ســـەیارەی هێنا لەم ســـەوزە موقەپەتەکان (داخراوەکان) وتی یالا ســـەرکەون، یەکەم کەس من بووم پێوە، چونکە نزیک دەرگاکە بووین. من، هاجە، شـوکە، کەنیشـکەی ئامە، رەشـــەخورشـــە، لەگەڵ جەهاندا، ئەمەنە پێکەوەبووین، ئێمە بارکراین و سـوتفە دایک جەهان لێمان بڕبوو، خۆی دەکوژێ و قژ دەڕنێ، وای تاتە دایکم، وتم دەســـەڵات نییـە، کـە چـــوویـــنـــە ژوورەوە و قـــاپـــی سـەیارەکەی داپێوە، سێوەی کچم بە باوەشمەوەبوو، لە هۆش خۆی چوو، کە لە قاعەکەوە بۆ ناو ســـەیارەکە هـاتین، ئـاواز کچم وتی دایـە فـەردە کەلوپەلەکە بخە بانســەرم، گەشـتینە نزیک ســـەیارەکە بە عەســـاکەی دەستی بە بانسەرییەوە خستیە ناو زێرابەکەوە، گەڕاوە بۆی، وتی نەیەی بـەخوا دەتکوژم. وتی هیچ مـەهێنن. چیم کرد، ئیرادەی خوا دەســـتم برد

مەتارەکە و کترییەک هاتنە دەستمەوە، لەگەڵ قاپێک لایلۆن. جەهان دەگیرێت و هاواردەکات، کچم لەهۆش خۆی چووە، یەکێک لە عەسکەرەکان هاتە تەنیشتمانەوە بە چپەوە وتی زابووتەکە عارەبە ناوێرم بە ئاشکرا بڵێم، ئێژێت وسکوت ئەوێ یان نەوت بکەمە ملیا و ئاگری بدەم؟ بەو جۆرە جەهانمان وسکوت کرد، هەروەها وتی پا دەخەمە بەر دەرگاکە، ئەو منداڵە بێنە نزیکەوە با هەناسەیەکی بۆ بێت، بەڵکو هۆشی بێتەوە. ئیتر باش بوو، کەوتینەرێ، نازانین بۆ کوێ. وە عەرزا ئەڕۆین یان ئاسمان.

پ/ سەیارەکە چەند نەفەری تێدابوو؟

میم ئامین/ دوو بووک مام ئەحمەد غالیب، شوکە دوو منالّی لەگەڵ بوو، هاجەر و من خۆم و حەوت منالّم، چواردە نەفەر بووین، جێی یەک کەسیتر نەدەبووەوە. سایەقەکە و سەکنەکە بوون و لای ئێمە عەسکەرمان لەگەڵ نەبوو. هیچمان لێوە دیار نەبوو، دەزانین سەیارە ڕێ دەکات و نازانین بۆ کوێ؟ دوا نیوەڕۆ دابەزیمان وتیان ئەمە دبسە، قاعەی جەمەلۆن بوو. کچەکەم دیسان لە هۆش خۆی چووبوو، خەرامان ژن دارا ئەوەتا هاوسێمانە، وتی دایکت بمرێ، ئەو منالّە گیان ئەدات ئاویش نییە دەمی تەڕبکات. عەسکەرەکە وەستابوو وتی بێ بێ؟ ترسام، وتی تەعال مەترس مەترس، مەریز مەریز بیتێرە دەشتۆ، با هەوا بدات لەو منالّە، بەڵکو بێتەوە هۆش خۆی. ساتریان کردبوو بە فەردەی پڕ خۆڵ، وتم ئاواز کچم یەک دوو فەردە هەڵڕشێنە بۆ ژێر و بانمان، دانەیەکی هەڵڕشت حەوت فەردە لە بنیا بوو، بە حەوت قورئان، ئەو هەشت مانگەی سجن بووین، ئەوە ژێر و بانی ئێمە بوو. نزیکەی مانگ و نیوێک لە دبسماینەوە، کە شوێنەکەمان پاک بوو، خوارنمان لەوێ باش بوو، هەفتانەش سابونیان بۆمان دەهاورد و بە حسابی نەفەر تەوزیعیان دەکرد. ڕۆژی دووجار حسابمانیان دەکرد، نەک زیاد و کەم بکەین.

پ/ چەند کەس بوون لە دبس؟

میم ئامین/ نازانم، بەڵام زۆر بووین. گوندەکانی قەوالّی، عەزیز قادر، توکن، کانی ماران، درۆزنە، کانی عوبێدی تێدابوو، کورە زۆربووین. منالّ نەخۆش دەکەوتن، ناچار ئیدارەمان کرد. قاعەی چوار لە

بەرزی بوو، ئێمە لە خوارەکەی
بووین. کاتێک بران، هیچیان
نەبردبوو، ئالتوون، کەلپەل، قۆندەرە،
بێشک، ئەوەندەی ئەم ژوورە
کۆکرابووەوە لەلایەن
عەسکەرەکانەوە، کە دەیانفرۆشت.
بەخوا باوڵی بووک کەلپەلی
هەڵگرتبوو بە بەری نەکردبوو،
دایکتان بمرێ. من یەک دەست
کەلپەلم پێبوو، وتیان بۆ نارۆی
بکڕیت؟ وتم لەکوێ؟ وتیان لە قاعە
چوار، عەسکەرەکان دەیفرۆشن.
چووم لە ژنێکی خەڵک قەلاقۆچالی
کراس و کەوایەکم کڕی.

رۆژێک چووم بۆ لای خزمانی توکن
خێڵ حاجی ستار و حاجی سەمین.
وتیان لە کوێن وتم لەو خوارەین.
نزیکەی مانگ و نیوێک لەوێ
ماینەوە، عەسکەرێکی تێدابوو
زلەیەک بوو درێژ، ئەیوت: ئەتانوەین
بۆ شوێنێک بۆ لای پیاوەکانتان، بۆ
لای براکانتان. ئێوارە ئەیوت بەیانی
سەعات ٥ حازربن، سەعات چوار
خۆمان حازردەکرد، ئەیوت سەیارە
نەهاتووە، چوار رۆژ لەو جەماعەتەی
سەرەوەی کێشە دەکرد، حساویانی
دەکرد، دەیانی کردە منشەئەکەوە
(سەوزێکی درێژبوون) و پردەبوو،
ئەوەی دەمایەوە دەیکردەوە ناو
خەڵکەکەوە. وتی ئێوەش دەبەین،
ئەو چوار رۆژە پامان بە زەوی
نەدەکەوت و خۆشیمان دەکرد،
وامانزانی بەرمان دەدەن. ئەوانەی
چوون دەنگیان نەما، کەس نەیزانی
چییان لێ کرا، خەجێ نەجمەدین و
عەینەی حاجی عەولکەیم لامان بوون
و بران. هەر ئەو رۆیشتنە بوو،
نەمان. هەر ژنەکان بووین، چونکە لە
تۆپزاواوە پیاوەکانمان لێ بڕ کران.
زۆری پێنەچوو وتیان خۆتان
حازرکەن، سەعات ٥ بارمانیان کرد
و لە منشەئەدا بوویان تا ٨ ئێوارە،
سوتفە دیسانەوە جەهەمان لێ بڕ
بوو، تاتە دایکم دابڕا ئێوەشم لێ
دابڕێن چیبکەم؟ دوو کورسی بەتاڵ
هەبوو، وتم کاکە با ئەو دوو کەسە
کەنیشکێک و منالێکە خۆشک
پیاوەکەمە گوناحن ،با بێنە لامان،
وتی دادە گیان لە حساب زیادە و
نابێت، وتم ئەی ئەو دوو کورسییە؟
وتی ئەوە بۆ مقاوەمەی رێگایە،
دوورە، گەرمە، هەیە تەحەموول
ناکات و لە هۆشی خۆی دەچێت،
ئەیهێنینە ئەوێ. دوای ماوەیەک
هێنایان بۆ نوگرە سەلمان بۆ لامان.

سەعات ٨ی شەو دنیا تاریک و نوتکە، گەشتین، کردمانیانە قاعەیەکەوە، یەکێ داوای ئاو ئەکات، یەکێ ئێژێ ئاو، یەکێ ئێژێ دایە لەبرسا مردم، یەکێ ئێژێ مێزم دێ، زیرەی منال دەچووە پای فەلەک. هەستمان کرد ورەورێک دێت. دوای زانیمان بەتەمەنەکانیان بردووەتە سەرەوە و ئێمەیان لە شوێنەکەی ئەوان داناوە. دەنگێ وتی ئەوە کێیە؟ گوێم لێبوو سەوڵە بانگدەکات: ئەرێ جەماعەت لە کوێوە هاتوون؟ وتمان لە دبسەوە، ئەی کێتان لەگەڵە؟ خەڵکی قولیجانتان لەگەڵە؟ کێیە؟ وتیان وەڵا ئەوە جەماعەتێکە خەڵک قولیجانە، کێتان لەگەڵە قولیجانی بێت؟ ناوتان چییە؟ وتم ئامین. وتی ئامین ژن قادر؟ وتم بەڵێ، وتی ئەی بوومە قوربانت جەهە؟ (نەمویرا بڵێم جەهە جێماوە) وتم ئەوە جەهەیە، سوێندم بەسەر هاجە و شوکە خوارد. جا هاجە و شوکە و حەمە بە تەنیشتمەوە بوون، هەتا بەیانی. بەیانی ئەوانمان نەدی، تومەز ئەوانیان بارکردووە و براون. ئێمەیان برد کرمانیانە شوێنەکەوە لۆفەیەکە، ها لە وێنەکەش دیارە، دووقاتە، زۆر گەورەیە، دەرگاکانی

بەرانبەر بوون. خوڵێکی تێدابوو دەتگوت خنەیە، سپی ڕێدەکات، ئێمە پاک و ئەوەمان دێ، سەڵمان دەکردەوە، کەسیتر لە قاتی خوارەوە نەبوو، جگە لە ئێمە. لە دیوارەکان نووسرابوو فلان کەس عیدام کراوە، وتمان ئێمەش وا لێدەکەن. نە ڕێ هەیە بجوڵێیتەوە، نە ڕێ هەیە دەرچیت، نە بۆری ئاو هەیە، هیچ نییە. ڕۆژ دواتر تانکەرێک ئاو هات، کابرایەک بوو ناوی سالەح بوو خەڵک چەمچەماڵ بوو، ئەیوت شەری مەلائۆمەر بوو، من لە کۆپتەرەکەدا بووم، هەروەها کاتێک عەزیز غالیب بریندارببوو، کە دوو مەکینەکەی قولیجان سەرحەد سووتاوە، من تێیدابووم. جا هەرواش بوو. ئەو دەهات سەموونی بەسەرماندا تەوزیع دەکرد. مام مەهدی و غەنی، غەنی خەڵک ناو داوێ بوو سەری دەبەستەوە و دشداشەیەکی لەبەردابوو. غەنی وتی ١٤ سەرخێزانم گیراوە بەری دوو ژنم. مەهدییەکی بچکۆلەی تێدابوو، شەش زمانی دەزانی، ئەوان واستەیان هەبوو، وەک نوێنەری خەڵکەکەیان لێهاتبوو. مام مەهدی وەک باوک و برابوو بۆمان.



هەرچیمان بوویســـتایە هانامان بۆ دەبرد. ئـەیوت گیـان مـام مـەهـدی، وســـکوت بن بـە دزی ئـەوانـەوە ســـەموونێک زیادەی پێمان ئەدا. ئەوەکان تر وەها نەبوون. نزیکەی مانگێک هـەر لـەو شـــوێنە بووین، ژوور نەبوو، چەماوەی دەرەجەکە بوو. نزیکەی ٥ مانگ لەوێ ماینەوە. ژیانمان زۆر زۆر ســـەخت و دژوار بوو. ئـەوەی پیرەژن و ئـەختیارێکی لەگەڵدا بووایە باشـــتر بوو. پشـــتی بەهێزتر بوو، تەنانەت کە عافەکەی دا، وتی ئەوەی لە گەنجەکان کەســـی هەیە با بڕۆن. ئێمە لەگەڵ خەڵکی عـەزیز قادردا بووین، کە کوڕێکیان تۆپ پێیـدا تـەقیبووەوە، دەیـانوت ئەمانە خێزانی پێشـــمەرگەن. زۆر عەزێتمانیان دەدا. قەدری ناوێکمان لـەگـەڵ بوو زمـانی عـارەبی دەزانی، ئیخبـاری کرابوو، وەختێکمـان زانی بـانگیـانیـان کرد. ســـوێنـد بـەخوا هەردوو دەستیان لەسەر سەریانەوە بـەســـتـە مـەحـاجـەرەکـەوە. ئـەو و نەخشـــەی حەمدە خەڵک بنەکەیە و کەنیشکێک تەپە سپی و ئەویترم بیر نییـە، چونکـە ٤ نـەفـەر بوون. وە ڕەفتـەکـەی خۆی بـەســـترانـە مـحـاجـەرەکەوە. مناڵەکانیشـــیان لە

خوارەوە لای قاچیانەوە دەگریان. دواتر وتیان جاسووستان تێدایە و ئیخباری کراون. جەژن قوربان هات، یەکی پیاڵەیەک چاییان پێماندا. بە کیبل بەربوونە گیانمان و کردمانیانە ناو حەوشەکەوە. تا ئێوارە بە بەری ئەو خۆرەوە خەریکبوو گیانمان دەرچێت. وەخبوو بسوتێین. ئەوەش بە دەستمانەوە بوو، لێمانیان سەند و دایانە ئەختیارەکان بە زۆر. وتیان خەمتان نەبێت، بەشە خۆراکەکەتان ناخۆین، تا دەتانکەنە ژووەوە، ئیتر خۆر ئاوا کرمادیانە ژوورەوە، دوای ئەو هەموو ئازارە دەروونییەمان. جارێکیان وتیان عافوات دراوە و کردمانیانە ناو حەوشەکەوە وتیان هەڵپەرکێ بکەن، خۆشی بکەن. ئاسکەی کەریم هەیبەت کە هارووبیان کردبوو لای ماڵی کاکەم بوون لە ئاوایی. دەستی کردە خۆشی دەربڕین، ئەختیارەکان وەک مام رەشە خورشە، فارس قادر، فایەق قادر مەمەخان، حاجی مەجید، دەستیان کردە گریان بەسەرمدا، وتیان رۆڵە ئەمە چۆن گەیەنێراینە ئێرە؟ خۆزگە بمردینایە و ئەم شوێنەمان بەچاو نەبینایە. نەمانزانی تۆش های لێرە؟ وتم ئەری وەڵا.

وتیان ئەی مناڵەکان باشن؟ وتم لەخوا بەزیاد بێت. ماوەیەک بەیەکەوە بووین و ئیتر کردمادیانە ژوورەکانەوە. ژنێک هەیە لە بنەکە، کەنشتک عەلی فەرەجە، خەڵک تاوسانەیە و شوی کردووەتە بنەکە، کورێکی بەباوەشییەوە بوو نەخۆش بوو. ئەمەندە کێبلی داوە سەریدان کورەکە سەری شکا و کۆچی دواییکرد. کەنیشکێک حاجی برایم خۆیشک فەتحێیە، فەتحیێ خەڵک عەزیز قادرە. سێ کچی عازەب بوون، بەسێ و مەدیح و سەمیعیش عازەب بوو، فەتحێ شووی کردبوو، هەموویان بەیەکەوە بوون. غەرازەکانی هاوردە ماڵەوە و چوو ئەو غەرازەکانی لە دەرەوە بهێنێت. سوێند بەخوا نازانم زابووتەکە بوو یان عەسکەرییەکە، گەرەکی بوو رایکێشێت بۆ دەشت، لە حەیبەتا دەستی گیرکرد لە لێوار قاپییەکە و خۆی کوتاوە عەرزا و خۆی لەدەستی دەرکرد، تاریک بوو. موقەدەمەکە دەیانگوت شەوان عارەق دەخواتەوە و ئاگای لە خۆی نامێنێت. بە قسەش بیستمان کە زابووتەکە پێی ناخۆش بووە، کە وای کردووە و تووڕەیی بۆ هێلاتانە

قاپی شکاندووە و وای کردووە. ئیتر لەوەوە نەمان دەوێرا شەوان دەرچین، گەر ئیشیشمان هەبووایە لە ترسا دەرنەدەچووین. زۆری پێنەچوو وتیان عافوات دراوە بکرێنە ناو پیرەکاندا. پیرەکان کەمێکیان مابوونەوە. ئەوەی بووکی لای ئێمە بوو، بردییە لای خۆی. ئەوەی دادا و بابای بوو تێکەڵ کریان، ئەوە بوو سەوڵە منالەکانی رۆشتنە لای خۆی، من نەبێت کەسم لەگەڵ نەبوو. پێشتر جیابووین لەیەک، نزیکەی ٢٠ مەترێک نێوانمان هەبوو، نێوانیان ساحەیەک بوو، محەمەد ئەحمەد غالیب منال بوو، شەو درەنگێک وتیان حەرەسەکان خەوتوونە، رۆشت بۆلای دایکی، وتبووی برێک شتم کڕیووە و بێ بیوە بۆ خۆتان. پێیان زانی، چونکە بەرمیلیان نابووە نێوان هەردوو قاعەکە، بەرمیلەکان رمابوون. سوێند بە ئەو خوا ئێستاش هاوە بەرچاومەوە، دایانە بەر کێبڵ، زیرەی دەهات لە هۆڵەکەی بەردەم عەسکەرەکاندا، شەرتبێ گیانی شین و مۆرەوە بوو. وەک وتم کە پیر و گەنجەکان تێکەڵ کراینەوە، من تەنیا خۆم بووم، لەوێ بەهۆی سەختی ژیان و قورسی وەرگرتنی ئاو و خۆراکەوە، کچەکەم عەمری خوای کرد، (لەوێ منداڵم بوو، کۆچی دواییکرد)، هەروەها یەکێک لە کچەکانی ترم کوردەی ناو بوو، ئێستا ماڵیان لە کەلارە، هەرچی کاتێک بۆ سەمون وەرگرتن یان جەرد و بانگکردن ناویان دەخوێندەوە و دەیوت کوردە، یەک کێبڵیان دەداوە سەریا، دەیانوت باوکت بەناوی کوردستانەوە ناوی ناویت کوردە؟ بەردەوام بەو شێوەیە لەبەر ناوەکەی ئەشکەنجە دەدرا. حەرەسەکان ئەیان وت وێن رەئیس عایلە؟ وتم هەر خۆم و ئەم منالانەم. لە پێش مردنی کچەکەم هەڵەبجەییەکانیان هێنا، ئەوان ژن و پیاو بەیەکەوە بوون، وەزعیان باشتر بوو، زمانیان دەزانی، خۆزگە تا حاجی فایەق خان کە مابوو لە ژیان وتەت لێ وەرگرتایە. پیرە پیاوەکان لای خۆمان ئەوەندە خۆراکیان نەخواردبوو، گۆشتیان نووسابوو بە ئێسقانەوە، دەچوون بۆ ئاو دەستیان نەدەکەوت، (شەمخی) رەشێکی ناشیرین بوو بەزەیی بە کەسدا نەدەهاتەوە. توند و زەبری حەرەسەکان لەکاتی هاتنی هەڵەبجەییەکان، وەک سەرەتای

هاتنی ئێمە نەبوو، بەخوا چووم بۆ ئاو ئەوەندە بە کێبڵ دایە تەنگاما، ئێستاش گورچیلەم ژان دەکات و ئازاری هەیە. فرە دووعام کرد وتم خوایە تۆڵەی منی لێ بکەیتەوە. هەشبوو لەو حاڵەشدا بازرگانی دەکرد و شتی دەکڕی و بە گران بە خەڵکی دەفرۆشییەوە، هەبوون دەچوون بەردەستی عەسکەرییەکانیان دەکرد و گزگیان بۆیان دەدا و قاپیان بۆیان دەشۆرد و ئەوانیش خواردن و سەوزەیان پێدەدان، جارێک یەکێک لەو ژنانە خەیاری هێنابوو، نەجاتی کورم وتی دایە دایە وای چەندێک بۆنەکەی خۆشە، وتم خوشکم یان شت مەهێنە، یان بە دزییەوە بیخۆن با منالەکانمان ئاخ هەڵنەکێشن. بەخوا بەپارش و هەزار ڕەجاکردن یەک قووتی ئاوتەماتە یان تۆزێک برنجی پێدەفرۆشتین.

پ/ کەسی ناسیار بوو لەوێ لە برسان، یان لە تینوویتیدا مردبێتن؟

میم ئامین/ بەڵێ زۆر هەبوو، حوسێن ئەحمەد ئەورەحمان، برای شەهاب و فەریق لەوێ عەمر خوای کرد، عەلی قادر بنەکە عەمر خوای کرد، میمکە ئایشە باوەژن ئەمین، یەک قاڵە مابوو، منیش کەنیشکەکەم مردبوو، نزیک کۆتایی بەردانمان بوو ڕۆژێک حەجاج هات، وتی دەڕۆم مارەی ژن دەبرم، دوعای خێرم بۆ بکەن. هاتمەوە بەرتان ئەددەم. دوای هەفتەیەک هاتەوە بە جلوبەرگ و ئەنگوستیلەکەیەوە دیاربوو، مارەی ژنی بڕیبوو. زابووتەکە هات و وتی کوا ڕەیس عایلە؟ وتم خۆمم، وتی بڵێ وەڵڵا؟ وتم وەڵڵا، بیزانیایە یەکێک کەسێکی بەتەمەنی لەگەڵدایە، دەیخستە دواترەوە، وتی بەیانی حازربن دەڕۆنەوە، عافوات دراوە بۆ هەموو کورد جگە لە مام جەلال. ئەوەشی مردووە، وەفات نامەی بۆ دەکەین، لەوەدا درۆی کرد. کاتێ خۆمان ئامادەکرد بۆ جێهێشتنی نوگرەسەلمان، ئاواز کچم ٧ بەردی هەڵگرت وتی حەوت بەرد لە شوێنت نوگرە سەلمان، ئەوە ئێمەین بە زیندویتی لێت ڕزگاربووین؟

ئێوارە هاوردمانیانە حەوشە تا بەیانی، بەیانی زوو بارمانیان کرد بۆ سەماوە، بینایەک سێقات بوو، شوێنەکە پیس بوو، ٥ شەو لەوێ بووین، فەحس دەکراین، خواردن سێوەختە، دەیانگوت خۆتان بشۆن،

دیار بوو بۆئەوەی تەندروســــتیمان باشـــبێتەوە و رەنگی مرۆڤمان بۆ بگەڕێتەوە، کە لەو دوومانگەی دبس و پێنج مـانگـەی نوگرە ســـەلمان، رەنگی مرۆڤمـان لـە ڕوو نـەمـابوو. خواردنـەکـەی بـاشـــبوو، بۆئـەوەی مقـاوەمـــەی ڕێگـا بکـەین، چونکـە قەوەی گەیشـــتنە ماڵمان نەمابوو، تەواومان کردبوو. لە نوگرە سەلمان نەفەری یەک سەموون بوو تا ڕۆژی دواتر، بەیانی بۆ بەیانی تەنکەرێک ئاو دەهات لە پەنجەرەکەوە ســـەر ســـۆندەکـەی دەکردە ئـەو دیوودا، هەزارکەس دەرماوە بادیدا، ئەوەی توانـای هــەبوو، ئــازابوو بــەری دەکەوت، ئەوەشــــی ئازا نەبووایە، بەری نەدەکەوت و مناڵێ تا بەیانی دەیوت: ئاو، ئاو. فەرید کورەکەی لە باوەشــیدا بوو، هەتا گیانی دەرچوو، هـەر دەیگوت ئـاو، ئـاو، ئـاو. دایـە خەیار، دایە نان.

وەک وتم لە ســـەماوە ئینجا ئەوان خــەمی ئێمــەیـان دەخوارد، دەیگوت خزمەتتان دەکەین، ئەوەی نەخۆش بێت چارەســـــەری دەکەین، تا باش دەبێت، دواتر دەینێرینەوە. تەنانەت لەو جەماعەتەی ئێمە، چوار کەسیان لێمـان گلـدایـەوە، خـەڵکی نـاوچـەی جاف بوون، وتی با باشـتربن، دوای ئـەیاننێرینـەوە. دوای ٥ شـــــەوەکە هاوردمانیانە ســـلێمانی، نازانم چی شـوێنێک بوو، وتیان هەڵبجەییەکان بـەجیـا و کـەلار و کفری بـەجیـا. هەڵبجەیەکانیان خستە پێش ئێمەوە، منیش لە لێدانەکەوە کلییەم ئازاری هەیە و پلدەخۆم لە حەیبەتا. بینایەک لە ژوورمانەوە بوو، دوو سێ منداڵ ســـەیرمانیان دەکرد، تەلەبە بوون، تەواری بە کێبڵ کردمانیانە خوارەوە. زەلامێک هات و ســـەیارەی کەیەیەک لـەم بچووکـانـەی پێبوو، جـەمـەدانی بەســــتبوو، وتم خوا بمکاتە قوربانی ئەو ســـــەروجەمەدانییەت. وا کورد خۆمانە. وتی دادە خەڵک کوێن؟ وتم کەلار، وتی ســــەرکەون. وتم توبیتو خودا بۆ کوێمـان دەبـەن؟ وتی دادە بە ئەو خوا بڕوا بکەیت، یان نا بۆ کەلارتان دەبەینەوە، من ناوم حەمە پێنجوێنییە و بە ســـوغرە گیراوین، هەتا ئەتانبەینە کەلار. هێشـــتاش بڕوامان نەدەکرد، بە گومان بووین. تا گەیاندمانیە ســـمود، لە منازەمە زەردەکە هەڵمانی ڕشاند، هێشتا ئێمە نـەچووبووینـە ژوورەوە، خـەڵکێـک زۆر کۆبووبوونەوە، وتیان ئەرەوەڵا ســـجن هاتۆ، گشـــتی بۆ هاڵوهەوال

خێزان و کەسوکاری خۆی هاتبوون. ژنێک تەمەنی هەبوو، هاتبوو بێتە ژوورەوە، پاڵیان نا، تورەبوو وتی ئەری بۆ پاڵم ئەنێن؟ تخوا سەگیش بە ژن ئەوەڕێت؟ منیش لە حەیبەت کورچیلەمدا پلەدخۆم، حاڵم نییە، تەوارییەکان بەربوونە گیان دوو کوڕی ئەو ژنە هاواریان دەچووە ئاسمان، دای لە ژنەکە، ژنەکە نەگیرا، وتیان بەراز بۆ ئەدەین لەو دوو گەنجەی کوڕت هاواریان لێ هەڵدەستێت، تۆ دەنگ ناکەیت؟ وتی وەڵا مادام ئەدەی لێم و ئەوە زەمیرتە، بمیشکوژیت، نابێت بگیرم. وتیان ئێمە سەگین بە تۆ دەوەڕین؟ وتی خۆ من بە تۆم نەوتوە. من سجنم هەیە و هاتووم، بزانم سجنەکانم هاتوونەتەوە، هەواڵیان بزانم. وتم بەو خوا تا ئێستاش نەمردین، وابزانم لێرە ئەمجارە ئەمانکوژن. ماینەوە، وتیان تا کەسێک نەیەت و نەبێتە کەفیلتان بەرتان نادەین. توومەز رەحمەتی برام و مامەی مێردەکەم ئەوەندە هاتوونە و کەس نەبووە، ئیتر وازیان داوە. ماینەوە تا کاتێکم زانی عەزیز مامەی مێردەکەم (عەزیز غالیب) پەیدابوو، وتی ئەمانە دەناسی وتی بەڵێ. وتی سوێند بخۆ، وتی وەڵڵا برازامن. وتی دەبێتە کەفیلیان؟ وتی بەڵێ. وتی پەنجەت بێنە، پەنجەی سەند و گەڕانمانییەوە بۆ ماڵ. ئیتر من لە ماڵ یەکسەر لە هۆش خۆم چووم. کاکەم هاتبوو، ماچی کردبووم و بردمی بۆ نەخۆشخانە. دواتر ماڵ براکانم هاتبوون، منالەکانیان بردوبوو بۆ لای خۆیان، من لە نەخۆشخانەبووم، ئاگام لە خۆم نەبوو. ڕێژاو ژن وەلی غولام و بە سێ خوشکی منیان لەگەڵ کاکەم بردبوو بۆ نەخۆشخانە. مام عەزیز غالیب ئەنفالی زۆرە. کچێکی بووک خورشید عەباسە لەخان ئەنفالە. ئەوە هەر لەگەڵ خێزان مام خورشیدیدا ئەنفال بوون، بە کچ و کوڕییەوە. ئەوەی لەگەڵ خاندا ڕۆی، لە ملەسوورە، هێشتا نەگەشتبووینە ملەسوورە، ماڵ مەجید ساڵەح، ماڵ ئەحمەد حوسێن بەشیر، ئەوان گەڕانەوە وتیان وەڵڵا ئێمە نایەین و بە مەکینە دەگەڕێینەوە بۆ سەرەوە، ئیتر نازانم چییان لێ هات. لە ملە سوورە ها کاتێ سەرەتا وتم حساومانیان دەکرد، جەماعەت ماڵ هاپۆ ساڵەح، (بلور) عەلە خەجە و کەنشکان هاپۆ ساڵەحمان دی، بلوور

دەستێک جلی بووکێنی بوو، شایی بوو نازانم چیبوو، لەبەری بوو. کەنیشکێک هاپۆ سالّەح هەبوو درابووە برای ژنەکەی حەمەی رەشید، وتی بلەی براژنم جلێ تر لەبەر بکە، خوا دەزانێت چیمان لێدەکەن. خێڵ ماڵ مەجید کەرەم و مامەی مێردەکەم (ئەحمەد غالیب) لەگەڵمان بوون و ئیتر ئەوانیتر لەیەکتری دابڕاین و نەیانیانمان دییەوە.

پ/ لە نوگرەسەلمان، سەگە ڕەشت دی ؟

میم ئامین/ نا، ئێمە نەمان دەتوانی، بەلاّم منالّ وەک نەجات کورم، دەچوون بۆ سەر زبلّکوانەکە، پۆستالّ عەسکەری کۆنە و دڕاو هەبوو دەیانهێنا، ئاگرت پێی دەکردەوە، گەر شتێکت هەبێت، بیکولّێنیت، هەر ئەوە بوو. بەس وەک ئێمە گەنج نەیان دەهێشت. ئەو جەماعەتەی چووینە ناو پیرەکانەوە، حاجی سەمین خەلّک توکن ئامۆزایەل باوکم، ژنێک مردبوو، خەلّی چوارشاخ بوو، سەیرەکەم نایەتییە بان ئەم عارەبانە سێ تایە تەختەکانەوە، وتی مردووە و کفنیش نییە، پشووینەکەی خۆمانمان پێوەی بەستووە. وتی کورە ئامین رۆلّە بێ لەگەلّمان پالّی بنێ، تا دەرگاکە لەگەلّیدا پالّم ناو گەڕامەوە، لەوەلا نەتدەتوانی برۆیت. لەگەلّ پیرەکان هەر جیابووین، تا هەفتەیەک دە رۆژ پێش ئازادکردنمان تێکلّ کراینەوە. ئەوەندە مابوونەوە، یەک قافلّەیەک و ئێمە. ئەوەی هاتبوونە نوگرەسەلمان بۆ مردن ڕەوانە نەکران، لە تکریت و دبس و تۆپزاواوە بۆ مردن دەبران، لای ئێمە مەگر برسێتی و نەخۆشی، گەنجەکان لە تۆپزاوا و قاعەی چواری دبس بۆ مردن بران. گەنجەکان لە تۆپزاواوە راستەوخۆ بۆ مردن بران، خێزانەکانیش لە دبسەوە و لە قاعەی ژمارە چوارەوە. لە دبس خزمەکان زۆری پێکەوە بووین، لە دبس رەسمییەی خێزان ئەحمەد نەجمەدین و پرشنگ براژنم بەیەکەوە بوون. لە بان ئاوەکە بوون، تەنانەت من کوردەی کچم منالّ بوو دەرزییان بۆ بریوە، بردم رەسمییە لێیدا. بەس رەسمییەوان بران بۆ تکریت، نەک بۆ نوگرە سەلمان. من لە عەسکەرەکە کە ناوی نوری بوو رووخسەتم خوارد، برۆم سەر بدەم لە براژنم، وتی بەس خۆت برۆ و زوو بێرەوە. سەیرم کرد کورەکەی



بەباوەش براکەیەوە بوو خۆی چووبوو پەرۆکەی بشوات.

پەراوێزەکان:

١. خەڵکی شار بوو، مەوالیدی نەگیرابوو، خۆی و کوڕەکەی بوونە هاوڕێی ئێمە.

٢. خەڵکی گوندی باوەکر، کە خۆی و خێزانی و دوو کوڕ و چوار کچی ئەنفالکراون و تەنیا کچێکی تاقانەی رزگاری بووە.

٣. سێوە و کوردە و چیمەن ناوی کچەکانی میمکە ئامینن.

٤. هاجەر و شوکری بووک و (جەهان کچ) ئامۆزای مێردەکەین.

٥. خەڵکی گوندی کەریم باسام بوون.

٦. دایکی لە تۆپزاواوە لەگەڵ بە تەمەنەکان رەوانەی نوگرەسەلمان کرابوو.

٧. شەڕی جاش و شیوعیکان لە گوندی مەلا ئۆمەر لە رێکەوتی ١٩٨١/٣/٩ بە خوێنی پاکی (٢٣) پێشمەرگە و فەرماندە تۆمارکرا.



## عومەری مەلا

هەورێک تاریکیی لەهەناویا پەنگی خواردبێتەوە؛
بارانێکی نامۆ دەبێتە میراتگری
مرۆڤ لە خەونیشدا هەراسان بکرێ
تەنیا راچڵەکین دەبێتە پەناگەی
پێش لەدایک بوونم
هەموو شەوێ
لەخەونمدا
گابەردێکم دەبینی
شیوەنی بۆ پەپولەیەک دەکرد
پێش هەناسەدانم
کۆترێکم هەڵفڕاند
تا مژدەی خۆشیی ڕاگەیەنێت
لەو دەمەدا
پەنجەرەیەکم کردەوە

**تا هەوای نەسیم بلاوێنێ**

**لەو ساتەدا**

**لەژێر دار هەنارێکدا**

**کۆرپەیەک باڵی بۆ ئەستێرە ڕاوەشاند**

**لەو ڕۆژەدا**

**لەبەهاری تەڕو پڕدا**

**لەناو ئاهەنگی شادیدا**

**خەم سەرچۆپی لێ سەندن و**

**هەموو ڕۆچوون**

**لەو ساڵەدا**

**گوڵەگەنم ویستی خۆی پڕکات لە شیری ژیان**

**کەچی دارسێوێک**

**بێ ویژدانیی خۆی نواند و**

**خۆی دا بەسەر هەموویاندا و**

**بۆ هەمیشە سەری بەرزیانی دانەواند.**

**ساڵ بووەتە مۆرانەو**

**خەریکە قەدی تەمەنم دەپوکێنێتەوە**

**مردنێک بە بەرچاومەوە سەرەتاتکێیەتی،**

**نە  خۆشی دەوێم و نە بزریش دەبێ.**

**توورەییەکانم بوون بەخەزانی شادییەکانم،**

**نە شایەک داڵدەم دەداو**

**نە دییەیەک بە سۆزەوە لێم دەڕوانێ.**

**کلیلێک لەسەر سینگمەو**

**دەیەوێ قوفڵی دڵم بکاتەوە،**

**چەن سەیرە ! لە کوێستان بارانی بێ ئۆقرەیی  دەبارێ و**

لەگەرمیان تەمی هیوا دەملاوێنێ.

وڕێنەیەک گینگڵم دەدا

خەریکە جێ بە واقیع لەق دەکا

نە داشێک ماوە بۆ خواردن و

نە نۆڕسکانێک گلێرمان دەکاتەوە

ئەم زەوییە بارگاوییە بە کێشە

لەسەرەوە بۆ خۆی کێشمان دەکاو

لەسەریشی تەرمی یەکترمان پێ دەکێشێ.

کە مردن بوو بە پێناسەم

تا ئێستاش شوێن پێیەکانم

لەقەراغ کانییەکە چاوەڕوانمن.

ئەو بەردانەی پێم لێیان دەخلیسا؛

چاوەڕوانی گەڕانەوە و داوای لێبووردنن

ئەو دۆڵەکەیەی کە لە کانییەکەم هەڵدەژەنی ،

جەستەی لەبەر خۆری بێدادیدا هەڵپروزاوە

قاقا و پێکەنینەکانم لەنێوان زیخەکاندا

سەریان نایەوە

لەحەژمەت گێڕانەوەی خەمەکانم بۆ کانی، چۆڕەی ئاوی لێبڕا و

تا ئێستا توینێتی ئەوکی شەقارکردووە.

ئەو دەمەی خۆمم لە کانییەکەدا بینیەوە ، قژێکی ئاڵۆزکاو و

لێوێکی بەبار و

دەستێکی لەرزۆک و

چاوێکی پڕ حەسرەتم پێسپارد.

ئەو جێگایەی فرمێسکم بەسەریدا رژا،

درەخت گەلێکی تۆقیویان لێڕواوە

**سێبەرێکی خەمبار بووە بە نەزرگای هیواکانم.**

**رۆژێک فرمێسکێکم کەوتە ئاوەکەوە،**

**تەرمەکەی کەوتە سەرپشتی سەرکەمێکوتەیەک و بردی تا تەسلیمی گۆمی مەنفای بکا.**

**ئەوکاتەی خۆڵیان بەسەرداکردم،**

**تەنیا شتێک کەوتە یادم؛**

**دەنگی خۆش و پڕ سۆز و نازی دایکم بوو.**



عومەر تینو

# ئــــــەنفـــــــال

ئێمەی میللەتی بەشمەینەت
لەوەتەی هەین لەناودەبرێین
بە ئەنفال و کیمیاباران
یاخود لە سێدارە دەدرێین

لەبەرچاوی هەموو دنیا
بە زیندووی لە چاڵ نراین
تەنها تاوانمان ئەوە بوو
بە نەتەوەی کورد ناو دەبراین

ئەو ئازارەی ئێمەی چەشتمان
هیچ میللەتێ بەرگەی ناگرێ
ئاخر مەگەر قەت ڕوویداوە
نەتەوەیەک لەناو ببرێ...؟

ئێستاش گۆڕی ئەنفالەکان
شوێن بزرن لەم وڵاتە
هەزاران دایک و باوک
پڕ لە حەسرەت و ئاواتە

دایک لە کۆرپە دابڕا
ژن لە مێرد و خوشک لەبرا
هەموو کوردێ بێ جیاوازی
ڕەوانەی گۆڕستان دەکرا

دنیا کەڕ و کاس و لاڵ بوو
وەختێ کورد بۆ عەرعەر برا
تەنها بە سورەتی (الانفال)
کوردان خوێنیان حەڵاڵ کرا

حیکایەتی ئەنفالی کورد
تا هەتایە نابڕێتەوە
برینێکی زۆر بەسوێیە
هەموو ساڵێ دەکولێتەوە



ئاریان یوسف

# "من نازانم کام موترووبەتان بۆ بگێڕمەوە؟"

پێڵاوێکی بچکۆلەی پیری بنپێ بەرز-
جووڵەی یاخیم نەزۆک،
شەپۆلی هەناسەم سوونەت،
نیشتیمانی برینداری برسی خستووەتە ناو کەمپ،
دەستە گەورەکەی خستووەتە بینەقاقای ژینەوە،
مشتێ خۆڵی ڕەشی فریودەری بێ هیوایی-
کردووەتە نێو ناوچاوانی وشەکانی هەرێمی لەرزوتاوە،
پێنووسە سەرمەستەکان بە دەوری مێژوو و
مانژوویاندا سەما دەکەن،
شاباڵە بەرزە فڕەکانی ئازادییان بە یاسا-
قرتاندووە و هەر دەیشیقرتێنن!
هەموو سووجدەکانی هیوا-
ڕوویان لەسێبەرەکەیانە،

ئەم بارانیی نزایە قەت خۆش ناکات و

هەرگیز ناهێڵن وشک بێتەوە،

دی ئەمیش ژان بە نەوەکانی ژیانی نەوەکام دەکەن و

وا "کارتا"ش لەم هاوکێشەدا شڵەژان پەی پێبردووە!

چیتر نامەوێ وشەکان لەناوەوەمدا بسووتێن،

چون پولێک لەگومڕایی هاتوون و دەیانەوێت-

باخەڵم پڕ و دڵم خاڵیکەوەنە،

ئاخر هەژاریان کردوە بە باوکمان،

نەبوویش بە دایکی هەمیشەییمان،

کە هونەر دەمرێ لەبرسان،

ئەدەب قژی کورت، زانست چاوی کوێر،

کتێب شەقباران، ئازادی سوور دەکرێ و

"بۆری میزێک بەداهاتترە لەبۆریەک نەوت"،

گەر بەدەنگ نەیەم، پێنووسەم تفم تێدەگرێت،

خۆ ئەزانم ئەم تەقینەوە "سپارتاکۆس"ەم بەخۆڵم دەکات،

وەڵێ ئەمەوێت ئەم ئۆقیانووسە پڕ لەجەهلە بتفێنمەوە،

ڕیشکی بتەپیرۆزکراوەکان کە میخیان-

کوتاوە بە زەوی ئەم جەنگڵستانەدا،

بە پێنووس تیژەکەم "هۆرمهۆب" ئاسا ورد و خاشیانکەم،

ئاخر ناتوانم وشەکانم هەڵواسمە گۆڕستانی ناخمدا،

وەکو ئاوێک بڕۆم تا ڕێم هەیە،

کەچی ورد و خاش دەکرێم و

نازانن کەوتنە خوارەوەی زەردم - سەوز دەبێ!

چونکە تاوانەکانم بەڕەنگی سپی نووسراوە-

بە ڕوخساری جیهانی ڕەشەوە،

هەر کاتێ چوار پەلی دڵم بۆ هەر پەلێکم-

دەچێ ئەم پەلم ئەو پەلم لێدەکاتەوە!

داهاتوویش دیپۆرتم دەکاتەوە،

هیچ کات خۆیم بۆ نادات بەدەستەوە،

ڕابردوو گاز لە ئێستام دەگرێ و

مێژوو درۆزلەکانیم پێ دەفرۆشێتەوە،

هیواکان دیقیان کردووە و چاوەڕوانم هەڵپرووزاوە!

وەکو منداڵێک چیرۆکەکانم لەبەر ئاوێنەی-

جیهاندا باسدەکەم و هیچ کەس نامناسێتەوە،

کە گەروم وشک دەبێ نیوەشێک قومێک ئاوم دەداتێ،

خەریکی چنینەوەی خۆمم و

لکانەوەی خۆمم بەخودی خۆمانەوە!

دەبێ چیتر فامی جەستە و هزرم لەم هەموو-

تەعریب و تەفریس و تەتریک کردنە گسک بدەم!

چون مەرگ بەمنی چوار لەتدا دوگیان بووە-

هەر دوگیانیش دەبێ،

ئەی خودا تاکەی ئیر لەمناڵ ناچێتەوە؟

من نازانم کام موتروبەتان بۆ بگێڕمەوە؟

موتروبەی مەرگی سەردەشت یا ئەنفال-

هەڵەبجە، دەرسیم و کۆبانێ یان مەعرەش!

قارنێ، قەڵاتان یان ئێزیدیەکانتان بۆ بگێڕمەوە!؟

٢٠٢٣/١٢/٦



# هایکوکانی هەڵەبجە و ئەنفال

سەردار نۆڕیێ

هایکوکانی هەڵەبجە

-١-

(شازدە)

بەردەوامیی ئازاری شارێک،

دەستەوەستانی ئەدەب-

تەڕیی برینی هەڵەبجە!

-٢-

(ئازار)

گشت سێوی شیعری کلاسیک،

لە بەهاردا و بە گەرمیی هەناسەی مەرگ-

لەبار چوون!

-٣-

(هەزارو نۆسەدو هەشتاوهەشت)

بۆنێکی خۆش،

ناسنامەیەک وێنەی سێوێکی پێوەیە-

لەیادنەکردنی غەدر!

-٤-

بە مەرگ تەڕ دەکرێت،

لە نیوەڕۆی تینوێتییدا-

لێوی هەڵەبجە!

-٥-

هەموو بۆ ماچێ؛

لەب دەخەینە سەر-

جەمینی شاری شەهید!

لەب: لێو.

جەمین: توێڵ، هەنیە، ناوچەوان.

یەکەمین بڕگەی هەرسێ ڕستەی هایکوی ژمارە (٥) دەبێتە (هە-ڵەب-جە).

## هایکوەکانی ئەنفال

-١-

(يَسْئَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ...)*

بێژە: "بنە"ی کوردی بێ گیانن

لە ژێر ڕەحمی لمی بیابانن.

*الأَنفَال(١)

-٢-

بەلەم و پیرەژنی کورد،

پڕ لە ڕازی دەریا و ڕازی ئەنفالە-

چارۆکەیان!

-٣-

ماسییەک-

لەژێر لمی بیابانی باشوور،

کەوای پوولەکەی ژنەئەنفال!

-٤-

بووکەخان هەر چاوەڕێیە،

ئەڵقەیەک لە پەنجەی-

ئێسکە پەیکەرێکی ئەنفال!

-٥-

(وتەی ئێسکوپروسکی کوردێ)

سوورەتی ئەنفالی پێدەرخکردین

لە ژێر لمی سەماوەین و

نەهاتە دەنگ سەماوات!

# ئەگەر نیگارکێش دەبووم



حسیب محمدعلی صالح ١-٤-٢٠٢٤

وێنەی ئاوارەبوونی لادێکەمان

کە لە شەوەزەنگی تاریکیدا کۆڕەمان کرد بکێشم

کاش دەمتوا وێنەی جێهێشتن و باعەباعی ئەو کاریلە تازە لە دایکبووە

لە نێو تاریکایی شەودا بەجێمانهێشت بکێشم

کاش دەکرا و دەمتوانی وێنەی دەنگە وردیلانە و کزەکەی

کە هێشتا لە گوێیەکانمدا دەزرنگێتەوە بکێشم

خۆزگە دەمتوانی وێنە و شێوازی شلەژانی

ئەو خەڵکەی لە ملە سورە کۆبوونەوە بکێشم

کاش دەمتوانی وێنە و تابلۆی نەمبارانی ڕۆژانی بەجێهێشتنی لادێکەم

کە بە هۆی پێ خاوسیم دەترسام بە نێو شوێنی پریشکە بارانی سەرخاکەکەدا بڕۆم بکێشم

کاش دەمتوانی وێنەی دیمەنی ئەو پاسانەی بە نێو بیابانەکانی ناوەڕاست و خوارووی عێراقدا

بەرەو نوگرە سەلمان و زیندە بە چاڵکردن راپێچی دەکردین بکێشم

خۆزگە تابلۆکێش بوومایە وێنەی ئەو منداڵەی کە هەم ڕەنگ زەرد و ڕەش داگەڕاو هەم لاواز و بێ گۆشت و خوێن

لە ئامێزی دایکیدا بێ دەرمان و چارەسەر لە پێش چاوانم گیانی دەسپارد بکێشم

خۆزگە نیگار کێش دەبووم

وێنەی کۆبوونەوەی خەڵکە هەژارە لادێیانەی

که‌ چۆن گورگ له‌ ڕانه‌مه‌ڕێکدا له‌م سوچ بۆ ئه‌و سوچ زیندان ڕاپێچ ده‌کرا بکێشم

خۆزگه‌ ده‌متوانی وێنه‌و تابلۆی ڤیژه‌و هاواری ئه‌و منداڵانه‌ و

شـــێواز و تینوێتی و برســـێتییان کاتێک جیاده‌کرێنه‌وه‌ و له‌ زیندانێکی تریان ده‌ئاخنین

بکێشم

کاش ده‌متوانی وێنه‌و تابلۆی ئازاره‌کانی ئه‌و کاته‌ی پیره‌ پیاوێکی ڕیش ســـپی که‌ له‌ نێو

چڵکاو و پاشه‌ڕۆدا

له‌ پێش چاوی ژن و منداڵ و پیر دا له‌سه‌ر پشت ڕاخرا بوو بکێشم

خۆزگه‌ ده‌متوانی وێنه‌ی ئه‌و جه‌لاده‌ی به‌ کێبڵه‌که‌ی ده‌ستی

سه‌رو ڕیشه‌ سپی و ڕوخساره‌ پڕ ترسه‌که‌ی نوقمی چڵکاوه‌که‌ ده‌کرد بکێشم

کاش ده‌متوانی وێنه‌و شێوازی ئه‌و لاوه‌ی سه‌ربه‌ره‌و خوار له‌گه‌رمای تاقه‌ت پڕوکێنی هاویندا

به‌ یه‌کێک له‌ ستونه‌کانی ناوه‌ندی زیندانه‌که‌دا هه‌ڵواسرابوو بکێشم

کاش ده‌متوانی وێنه‌ی ترس و بیمی که‌له‌پچه‌کردن و ڕیزکردنی ئه‌و دایک و خوشـــکانه‌ ی

نوگره‌سه‌لمان

بکێشم

خۆزگه‌ ده‌متوانی وێنه‌ی ئه‌وکاته‌ی خۆم بکێشم کاتێک حجاج به‌ کێبڵێکی ره‌ش ده‌یدا له‌سه‌ر

پشتم

وێنه‌ی تابلۆی ئه‌و شـــێره‌ ژنه‌ی که‌ به‌ فیداکردنی خۆی بۆ پاریگاری له‌ من چاونه‌ترســـانه‌

خۆی خسته‌ پێش

ئه‌و کێبڵانه‌ که‌ قه‌رار بوو بدا له‌من بکێشم

کاش ده‌متوانی هه‌رچی ئه‌و کاره‌ساته‌ی من بینیومه‌ بکێشم

وێنه‌ی ماڵی پورم

که‌ زینده‌ به‌چاڵ و جینۆساید کران بکێشم

خۆزگه‌ ده‌مکرد به‌ فیلم و هه‌موو جیهانم پێ ئاشنا ده‌کرد......



# پانۆرامای ڕاگوێزان و سوتماکی خاک

## فاتیح سەلام

من لە کازیوە و شنەبای ژهرا
خۆری دەم بەیان لێم چوو بە (کەلا) و ..
(مەفرەزە) ئاسا دێکەی جێهێشتم
من لە کۆڵانی شکۆفە و گوڵا
پاییز لە ڕەنگی سەوما چرۆی کرد
دروێنەی (ئەنفال) هات دای بە سەرما
تاڵاوی کۆستی سەختی پێچپیشتم

*　　*　　*

بۆن وێرانی دێ
خاک درژ و مۆنە
ئاسمان لە ڕەنگی سروشت بێزارە
مۆتەکەی تۆقین سوار سنگم بووە
ئەم خەڵکە وەکو نامۆ دەبینم
ئاسۆی کۆچێکی ئەبەدی نوتەک

لە نێوچەوانی هەر یەکێک دیارە ...!
هەست دەکەک زەوی تاوی سەندووە
زنا و تەکیە و .. کانی و مزگەوتیش
وەک بەردە نوێژ و قورئان و منالّ
سەرابی هەیە و .. دەڕۆم نایگەمێ
دەست بۆچی دەبەم بریسکە دەدات
ئاگرێ دەرژێ بەم وولاتەدا
کە نەرژابێت ، بە هیچ گەلێکا
لە هیچ سەردەمێ

* * *

ئەژنۆم شل بووە
هەنگاوەکانم .. تا دێت قورس دەبن
دەمەوێت بڕۆم بە دومدا نایە
بروای پتەوەی تاشە بەرد ئاسام
لە کۆڕی شەڕ و گیانبازی و چەکا
هاتۆتە هەژە و لە هەرەسدایە
هەستی بایە قوش
شابالّی نەفرەت
بە کش و ماتی دەکشێ بێ چرپە
ئەم دەشت و دەرە هەرە بزێو بوو
ئێستاش سەرانسەر مەلوول و کپە ..!!

* * *

دێیەک بنار بەجێ دێلّێ
دوو دێ .. سێ دێ .. چوار هەزار دێ
ڕەوە دێیە

توخوا دایە
ئەم خەڵکە سەر لێشێواوە
بۆ کوێ دەبرێن ..؟
حەشری کوردە
قیژەو .. هەراو .. بانگ هەڵدانە
کورد لە (ستان) دابڕانە
گەرمە شینێکی سامناکە
خواحافیزی بەری ڕەنج و .. رانەمەرو ..
خاک و خۆڵی ئازیزانە
ئەسپی مەرگ تەپ و تۆزییەتی
وا خەریکە سمکۆڵانە
چاو تەنها فرمێسک دەناسێ و ..
بانگ و سەڵای ژن و پیاوە
دەست بەردانە .. قورپێوانە
ئەم ئەوی گرتوتە باوەش
یەکێک کۆرپەی لێ وون بووە
یەکێک یاری
یەکێک پیرەژنەکەی دایکی و ..
مناڵ تەتکە و ماقڵە و یاری
یەکێ و .. یەکێ و .. سەدان یەکان
ئای !! لە تاریکی ئەم ڕۆژە
سەمفۆنیای سۆزی گریانە
خۆڕنینە .. لە خۆدانە
پەلکی بڕاو .. قژی لە مەچەک ئاڵۆزکاو
هۆن هۆن .. زوخاوی سەرجەستەی

دوا کوێرە دێی بەش مەینەت و ..

ماڵ بە ماڵی گەرمیانە

❊ ❊ ❊

کچە شیرینەکەم وەرە

ئەگەر چی گەردنی بەرزت

لە ژێر حەربەو دەم خەنجەرە

وەرن کەس وکاری ئێستای

لە هەموو کات خۆشەویستر

وەرن لە جەژنی نەمانا

گەردنی یەکتر ئازادکەین

خوا عەلیمە ..

نایەنەوە .. نامبیننەوە .. ناتبینمەوە جارێکی تر

کوا ؟ لە کوێ یە ؟ .. بۆ دیار نین

لالە و خوشک و خێزانەکەم

ماڵئاوا .. گەردنتان ئازاد

ئێوەش ئەی چۆلەکەکان و ..

گیاندارە جێماوەکانی نیشتمانە خەزانەکەم

❊ ❊ ❊

ئا .. ئێستا .. ئەو ساتانەیە

دۆڵ بە دۆڵ و لادێ بە لادێ ی گەرمیان

ئۆردووی گوللەی داگیرکەر و ..

(فەوجی کاکاتی قارەمان)

پەتی مەرگیان بۆ ڕستووە ..

کورد کافرێکی مولحیدی ، غەزای بەدرە و ..

سەردەمی ئەبوو سوفیانە

(سوری ئەنفال) لە ژێر پۆستاڵ و
بۆگەنی ناو گەوڕا ..
دوای هەزار و چوار سەد ساڵی
لەم هەوارە عابیدە و تەسبیح بەدەستە
زمانی فەتوای بەربووە
خوا دەبینێ و خۆی شاهیدە و مێژووش دەڵێ
(ملە سوورە) قەت ئەوەندە خەڵکی تێنەترنجاوەو و
هێندەش میوانی شپەرزە ، لە دیوەخانیا نەبووە ..!!!

* * *

ئا جەرگەکەم
ئێستامان ئەو ساتانایە
ژنی ڕووسوور و دیلی کورد
لە پێش چاوی داوێن پیس و نا مەحرەما
ژان دەیگرێ و .. مەلۆتکەکەی فڕێ دەدات
لە خۆگوشینی دوو ژانا
هاواریەتی و .. شەرمی دەتکێ و دەناڵێنێ ..
بوخچەی کراوەو دەرپێی ژن
لە ناو (ئیڤا) و (تراکتۆر ) جێ دەمێنێ ...!

* * *

لە کوێن ئێستا.. ؟
دوا تەمەنی مەرگ و ژینتان
لە چنگی کاک نامەردایە
کەسێک خۆی خۆی بخنکێنێ
کەس بە فریایەوە نایە
لە کوێن ئێوە .. ؟

لە ژێر لم دان ..؟

یان گۆڕغەریبی عەرعەر و بیابانی وولاتانن

یان وەک دەڵێن

لە خەوێکی قوڵا نوستوون

چاوەڕوانی گەڕانەوەی ناو باوانن

(ئەیوب) یکم گیژی کردووم سەبرێکی تاڵ

ژن چاوەڕوانی مێرد دەکا و ..

مێردیش کوڕ و ژن و مناڵ

لە دوای هەشت ساڵ

لە دوای هەوری ڕەشی کێوماڵ

ئەوەی لە ڕەببیەی دووژما

لە تالان و ئەنفالچێتی و ڕەش و ڕووتی کوردگرتنا

ئەوەی ئێسک و بەردی کرۆشت

بۆ گیرفان و ئافەرینێ ئێوەی فرۆشت

ئەوەی بوو بە بەردەبازی

تابووری شوومی چاوچنۆک

بە گریانی خنجیلانەو .. پرسەی گەورەی ئەم نەتەوە

هەستی سڕبووی ڕاینەچڵەکان

نەهاتە چۆک

ئێستا ئەو شۆڕسوارانە

تێکۆشەر و قارەمانن

کاربەدست و موعەززەزی .. حیزبەکانی کوردستانن !!

*       *       *

لەو دەمەدا ..

لە دۆزەخی داخراو و بۆ کرووزی ئەو خەمەدا

که سەنگەریش وکو دایکم
بۆ ئازیزی فرمێسکی ڕشت
که پێشمەرگە لە بارانی ژەهر ترساو
دووکەڵ تفەنگەکانی کوشت
هەر ئەوان بوون
که (نازمی مامە ڕەشە) و ..
نۆزدە هەڵۆی باڵ خوێناوی
شریخاندیان بە بنارا
که مانگ لە دڵی (ماجید) و هاوڕێکانیا خەرمانەی دا
لە بناری (گل) ی تووڕەو ..
داستانەکەی (تازە شار) !
بڕیاریان داو لە یادمانە :
_ ئێمە لە یەک تفەنگەوە
لە یەک هیوا و یەک ڕەنگەوە
لە پەراوێزی مێژووا
سەرەتایەکی خوێناوی بۆ یەکێتی بڕواکان و ..
ڕەونەکردن تا شەهیدبوون
لە پەنای دێی دا دەنووسین
ئێوە بڕۆن
تا دوا فیشەک و هەناسە
لەسەر دوا بستەزەمینی کێوی وورە ڕادەوستین
که دوا مەخزەن ..
دواین گوللەی گەرووی داخ بووی چەکەکانتان
بێدەنگی خۆیان ڕاگەیان
بەڵنی خۆتان بردەوە

**لە بێ چەتری ڕێژنەی ژەهرا**

**بۆ هەتایی .. لە ژوور سەری فەرهەنگی بەرگریمانا**

**(٢٤) ئەستێرەی زیوین**

**لە شەپۆلی ڕاگوێزان و (نەفخی صور) !**

**بەرۆکی ڕەش هەڵگەڕاوی**

**ئەم دەڤەرەیان داگیرسان ..**

* * *

**دڵی بابەی**

**ئەگەر جارێ ..**

**کزەبای ڕێکەوت هەڵیکرد**

**(مەفرەزەی ئیختیفا)**

**ڕێیان کەوتە کەلاوە زێدی وێران**

**کون بە کون لە بن دیوارا**

**شەویان شەق کرد ..**

**بۆ ئازووقەی ئەشکەوت ژیان**

**پێیان بڵێ :**

**خانە خوێکەتان پێی ووتین**

**ئەمانەتی ئێوەو وپیرۆزی ئەم خاک و خۆڵە**

**مناڵ و پیری بە جێماو**

**لە برسێتی و خێری بۆ خوا بپارێزن**

**ئەگینا نمەک حەرامن و ..**

**دواین پێشمەرگەتان زۆڵە ....!!**

****************

**لە ژمارە (١٦) ی ساڵی ١٩٩٨ گۆڤاری (ئێستا) دا بڵاوکراوەتەوە**

# ئەنفال

لە چواردەی چوار لە هەشتاو هەشت
لە شار لە گوند لە هەموو پێدەشت
لەچاو لەدڵ لە لاشەی کوردان
لە ئاسمان مەرگ لەخاک گۆڕستان
ژن و پیاو و مناڵ ڕۆڵەی گەلی کورد
بەعسی دڕندە هەمووی لەناوبرد
شارمان ژێروبان لادێمان وێران
شێوا جوگرافیا دزرا نیشتیمان
بە خوێنی شەهید نەخشا مێژوومان
چوار پارچە کرا خاکی کوردستان
هەڵەبجە و ئەنفال جینۆسایدە
هەرگیز نامرێ ئەم گەلە مەردە
ئەم گەلە ڕۆڵەی قازی نەبەردە
دوژمن بەزێنە بکوژی جەردە
زۆرمان ستەم دی لەم خاک و ئاوە
ئێمەی ڕۆڵەی کورد کۆڵمان نەداوە
کردمان بە بەهەشت خاکی پیرۆزمان
جێگای شانازی بۆ گەل و هۆزمان

هۆنراوە : **هیوا ئەنوەر ژیری**



# حیکایەتی لــم...

**ئەکرەم هەواس**

دەنکە لمێک حیکایەتی هاڵاوەکانی سەرابی
بۆ مردن دەگێڕایەوە.
باسی شوومی ئەنفالی بۆ زەمەن دەکرد،
وتی ئەنفال دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی پێش زایین، کاتێک مەملەکەتی بیابان، ئەمیتای
کچی پاشای مادەکان دەگوێزێتەوە بۆ بیابانی وشک و گەرم
دوای ئازارێکی زۆری دەروونیی،
کە لە باوەشی شاخ دابڕا بوو،
بوو بەژێر بیابانی داخەوە
ئێستاش ڕۆحی ئەمیتا
هاوەڵی ئەنفالەکانی هەشتاو هەشتە.

دەنکە لمەکە دەیگوت:
ئەو هەموو غەدرە من لێی بێبەریم
تاوانی من نەبوو ئەو هەموو گوڵە

بەر گژەبای نەفرەت کەوتن

سووچی منیش نەبوو،

لوتکەی شاخەکان بوون بەژێر لمی بیابانەوە!

ئەو دەڵێ: منیش قوربانیی بووم قوربانیی..

ئاخر حەجاج پێی نا بە دڵی منیشدا و

پەراسووەکانی شکاندم!

ئێمە کراین بە کەرەستەی تاسان و خنکان

دەنکە لمەکە دەیگوت:

من پیرە پیاوم بینی، تینوو بوو بۆ قومێ ئاو

زاری بە خۆڵ تەڕ دەکرد و

لە باوەشی بێکەسیی خۆیدا

فرمێسکەکانی دەژمارد و

گەرووی وشکی منی دەخووسان!

کەچی لە فرمێسکی چاوی پیرەپیاوەکان بیابان پەڵەی دا

دەنکە لمەکە دەیگوت:

گەنجم بینی هەناسەکانی مەرگی پێوانە دەکرد

لەوپەڕی نائومیدیی بوونیا

بەدیار کۆستێ کزۆڵەوە دانیشتبوو

لەو بێئاوییەدا، هەتاو بە دیار سەریەوە ئاوی لێ دەچنی

بیرەوەرییە تۆز لێنیشتووەکانی

بۆ چاڵەکانی مەرگ دەخستە ڕستەوە

پرچی کیژۆڵەکان وەک کۆلارە،

گیر بووبوون لە تەلەدڕکینەکانی مەرگ و

**گژەبا دەیشەکاندنەوە**

**شنەی ئەوینێک لەوناوە نەبووە میوان،**

**هەمووی بەر شاڵاوی گڕە کەوت و هەڵپڕووزان**

**مناڵێکی ساوا وەک بووکەڵە**

**یاری بە قامچییەکەی دەستی عەسکەرێکی زیندانەکانی دۆزەخ دەکرد**

**شریقەی لمۆزی گوێی ئاسمانی کەڕ دەکرد**

**کورپەلەیەک یەکەم ژەکی لم بوو،**

**بە بیابان قومات کرابوو**

**چاوی کردەوە لە چوار لاوە**

**دەورە درابوو بە سەگی بیابان**

**مەمکەمژەی لوولەی تفەنگ بوو**

**دواتر لەناو شەلاڵی تۆزدا خەڵتانی خوێنکرا**

**بێویژدانی وەک کۆلارە**

**بەسەر عەرعەرا دەفڕی!**

**دڵدارەکان لە فرمێسکی چاویان، قوڕێکیان گرتبووەوە، ئاشقەکان خۆیان تێ نابوو**

**چونکە هیچ هیوایەک نەمابوو بۆ سەوزبوون**

**جەلادەکان هیچ ڕەنگێکیان نەدەناسی**

**تەنها و تەنها لمیان ڕەنگڕێژ دەکرد**

**هەموو گیانێک کەوتە ژێر یاسا بێ بەزەییەکانی بیابان و داخی کردن**

**لم دەمێک بوو تینوو بوو**

**بیری گەڕانەوەی بۆ کەناراوەکانی دەریا دەکرد، تا قومێک ئاوبخواتەوە، ئەویش وەکوو ئەنفالەکان لە تینوودا خنکان**

**بەعسیەکان کەڵبەیان تیژ و هەناویان ڕەش**

چنگیان سووربوو بە خوێنی پەپوولە

هەموو خەندەکانیان ئاوەژووکرد بە فرمێسک و پێکەنینیان خستە زیندانی گریان و فڕینیشیان کوشت!

گەردەلوولێک بوون لە خوێن
هەڵیان کردە سەر نەوای قەتار و ئەلاوەیسی
بەهاریان خستە زیلێکی خۆڵەمێشی و
دایانە دەستی  قرچەی تاوسان و
ڕەش هەڵگەڕا بە مەرگ
هەموو جوانییەکانیان سەربڕی
دەستی گوندیان شکان
چاوی کانییان دەرهێنا
پرچی چەمیان بڕی
گۆرانیان کردە ژێر خۆڵەوە
موزیکیان خستە ژێر پۆستاڵ و
هۆرە سەوزەکانیان خنکان و
ئاوازیان دایە دەستی ڕەشەبا!
ئاخر چ وێژدانێک ئەوە دەخوێنێتەوە
پەپوولە بکرێتە کونجی جاڵجاڵۆکە؟

ئەو هەموو گوڵاڵەسوورەیان لە بیابان نێژا و ئێسک و پرووسکی لێ سەوز بوو!

ئاخر چ پەیامێکی ئاسمانی ئەوە تەفسیر دەکا، کە باوک بە بەرچاوییەوە، کوڕەکەی لە ژێر لمدا، سەگەڕەشەکان دەری بێنن و گۆشتی تەرمەکەی بخوا!

ئاااااه چ ئافاتێک بوو ئەم تەونی سەرابە
دەستوخەتی ئەم فرمێسکە ئاڵۆسکاوەم بۆ لێک جویێ نابێتەوە
کوشتنی ئەو هەموو جامانە و کۆڵوانەیەم بۆ ناخوێنرێتەوە

تەپووتۆزی ئەم مێژووەم بیرناچێتەوە

نازانم ئەو مەرگە چۆن ڕەشنووس کرا؟

نازانم چیرۆکی ئەم دۆزەخە چۆن بگێڕمەوە!

ئەو شوومی عەرعەرە چۆن پێناسەکەم!؟

تۆ پێم بڵێ.!

ئێوە پێم بڵێن..!

مەرگ چۆن فریا کەوت ئەو هەمووە قڕکا ؟

چاڵ چۆن فریا کەوت ئەو هەموو فرمێسکە قووتدات؟!

ئەی ئەو هەموو ڤیژەیە بۆ نەخوێنرایەوە؟

گەرمیان ئێستاش تۆز لە برینی دەچۆڕێ!

دیاریی دەستیان دڕکەزێ بوو، لە گەردنی نیشتیمان ئاڵان

ناونیشانیان کوشتن و خوێن بوو

لە کوێ ئاشنای گوڵ بۆن بوون

هەموویان بە جارێ بە لم تاسان

ڕێگاکان چاو لە ڕێی گەڕانەوە پیربوون

گوڵەکان لەو دەشتی قاقڕە هەڵپڕووزان

کاتژمێرەکان لەسەر میلی مەرگ وەستان

خەرمانەی مانگیان کردبووە زیندان و تریفەشیان دزیبوو

خۆر هێندەی تر  چاوی زیت دەکردەوە

هەر چی ڕنووەبەفری شاخ بوو،

لەو عەددەمە..

لەو مەملەکەتی لمە توانەوە

ئاخر چ هیوایەک لەوێ چرۆ دەکا،

**کە بۆ پێشوازی میوانەکان**

**لەسەر دیواری زیندانەکەیان**

**بە خەتێک لە ڕەگی زەقووم نوسرابوو:**

( اهلا بکم للجحیم).!

# Genocide

it is a journal dedicated to the crime of genocide
Published by the Genocide Center of Garmian University

Number One

14/4/2024

